


زیگمۆند فرۆید

# لەبیرچوونەوە



وەرگێڕانی: عەلی ئەکبەر

پێشکەشە بە

Avan. B. O

لەدایکبوونت پیرۆز هیوادارم

ژیانت پڕبێت لە کامەرانی و خۆشبەختی

25.4.2022

# لەبیرچوونەوە

## زیگمۆند فرۆید



وەرگێرانی: عەلی ئەکبەر مەجیدی

CamScanner




**ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان**

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیک ناوەندیی ڕۆژهەڵاتی کوڕان.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

**ناونیشان:** لەبیرچوونەوە

**نووسەر:** زیگمۆند فرۆید

**بابەت:** دەروونشیکاریی

**وەرگێڕانی:** عەلی ئەکبەر مەجیدی

**نۆرەی چاپ:** چاپی دووەم

**دیزاینی بەرگ:** عیسا عوسمان

**دیزاینی دەق:** ئارام مەلا محەمەد

**پەخشانگە:** ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (٢٦٠٢) ساڵی (٢٠١٩) پێ دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبانە،
مافی لەچاپدان و کۆپیکردنی پارێزراوە بۆ ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان.

CamScanner

پێشکەشە بە

- ئەو کەسانەی بە لێکدانەوە و تێگەیشتن دەڕواننە ژیان.

- ئەو کەسانەی بە دوای پەروەردەیەکی جوانەوەن بۆ نەوەی دوای خۆیان.

## پێشەکی:

زۆر خۆشحاڵم بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە، چونکە پاش ١٠٠ ساڵ تێپەڕبوون لە چاپی ئەم کتێبە، کە پرۆفیسۆر سیگمۆند فرۆید، داهێنەری مەکتەبی دەروونشیکاری نووسیویەتی و دەقی فارسییەکەشی ئەمساڵ، لە تاران لە چاپ درابوو، منیش پێم باش بوو کە یەک ساڵ بەسەر فارسییەکەیدا تێپەڕ نەبێت، ئێمەیش وەک نەتەوەکانی تر بتوانین کەڵکی لێ وەربگرین. بەڕاستی دەتوانم بڵێم ئەو زانستە دەروونیانەی ئێستا باسی لێوە دەکرێت، پێشتر پرۆفیسۆر فرۆید هەمووی باس کردووە و شی کردووەتەوە.

تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن خاتوون "ئاڤان بەهجەت" کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

---

بۆ ڕاوبۆچوون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link



# بەشی یەکەم

## لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکان

من لە مانگنامەی (دەروونشیکاری و دەمارناسی)دا بابەتێکی کورتم بڵاو کردەوە لەژێر ناونیشانی "سیستەمی مەیلەو لەبیرچوونەوە". لێرەدا ناوەڕۆکی بابەتەکە بە کورتی دەگێڕمەوە، تا ببێتە خاڵێک بۆ توێژینەوەکانی دوایی. لەو بابەتەدا من بە گوێرەی نموونەیەکی سەیر کە بۆ خۆم ڕووی دابوو مەسەلەی لەبیرچوونەوەی زووتێپەڕبووی ناوە تایبەتییەکانە، کە زۆر باوە لێی ورد بوومەوە و شیکردنەوەی دەروونیم بۆ کرد و بەو ئەنجامە گەیشتم، کە ئەو ڕووداوە بە واتەی کارنەکردنی یەکێک لە وزەی زەینی (وزەی وەبیرهێنانەوە)، کە ئەوەندە بێبایەخ و ناگرنگ دەردەکەوێت لە ڕاستیدا دەتوانێت شرۆڤەیەکی هەبووبێت کە بایەخ و بەربڵاوییەکەی لەو سنوورەی کە زۆر جار بۆ ئەو دیاردەیە دایدەنێن زیاتر بڕوات.

ئەگەر لە دەروونناسێک بپرسن بۆچی زۆر جار بۆ بەبیرهێناوەی ناوێک، ئەو ناوەی کە لەو کاتەدا پێتان وایە بە باشی دەیزانن بە بیری ناهێننەوە، بە بۆچوونی من ئەو ڕازی دەبێت بەو وەڵامە کە ناوە تایبەتەکان زووتر لە ناوەڕۆکەکانی زەینی تر لەبیر دەچنەوە. دەروونناسەکەتان چەند نموونەیەکتان بۆ دەهێنێتەوە، کە تارادەیەک بە لاتانەوە پەسەند بێت و وا بیر دەکەنەوە بەو شێوازە تایبەتمەندییەکانی ناوە تایبەتییەکانی شرۆڤە کردووە. بەڵام تەنانەت بیر لەوەیش ناکاتەوە ئەو دەرئەنجامە دەتوانێ هۆکارێکی تر، واتە هۆکاری گشتگیرتری هەبێت.

ئەو شتەی منی هان دا تاکو دیاردەی لەبیرچوونەوەی زوو

تێپەڕبـــووی نـــاوە تایبەتەکـــان بە وردی هەڵبســـەنگێنم، ســـەرنج خستنەسەر هەندێ وردەکاری بوو، کە زۆر جار بوونیان نییە، بەڵام لە هەندێ بواری تردا بە ئاشکرایی دەردەکەون. لەم بوارانەی دواییدا تەنهـا مەسـەلەی لەبیرچـوونەوە لە ئـارادا نیـیە، بـەڵکوو بیـرەوەرییە درۆیینەکان دەردەکەون. ئەو کەسەی ئەو ناوەی لەبیر کردووە هەوڵ دەدات بە بیری خۆی بهێنێتەوە لە زەینیدا بە دوای هەندێ نـاوی تـردا دەگەڕێت، کە نـاوی جێگرن. ئەو خێـرا تێدەگات، هیـچ کـام لەو نـاوانە ئەو ناوە نییە کە ئەو بە دوایدا دەگەڕێت، بەڵام ئەو نـاوانە دیسـانەوە بە ئینکـــارییەوە زەینـــی ســـەرقاڵ دەکەن و وا دەنوێنێـــت ئەو دەرئەنجامەی دەبێ، کە ببێتە هۆکار بۆ دەرکەوتنی نـاوی مەبەسـت، تووشی جۆرێک "جێگۆڕکێ" دەبێت و بەهەڵەدا دەچێت کە لە کۆتاییدا نـاوی نادروست دەوترێت. من پروپاگەندە نـاکەم، ئەو جێگۆڕکێیە لە بواری دەروونییەوە بە دڵی خۆی ئەنجام نادرێت، بـەڵکوو بە گـوێرەی ئاڕاسـتەی دیـاریکراو و پێشـبینیکراو دەردەکەون. بە واتـایەکی تـر بە بڕوای من لە نێوان نـاوی سـەرەکی و نـاو یـان نـاوە ئەڵتەرناتیڤەکاندا پەیوەندییەک لە ئارادایە و ئەگەر بتوانم ئەو پەیوەندییە دابین بـکەم، هیوادارم کە چۆنییەتی دەرئەنجامی لەبیرچوونەوەی نـاوە تایبەتەکـان ئاشکرا بکەم.

لە نموونەیەکدا کە چەند ساڵ لەوەوبەر لێیم کۆڵییەوە، ئەو نـاوەی کە بێهوودە هەوڵـم دەدا بە بیـری بهێنمەوە نـاوی هونەرمەندێک بـوو، کە وێنەی سـەر دیـوارێکی زۆر جـوانی کەنیسـەی گەورەی "ئۆریڤێتۆ"ـی نەخشـاندووە. ئەو وێنـانە چەند لەقتەیەکی لە "ڕۆژی قیـامەت" پیشـان دەدان. ناوی ئەو هونەرمەندە "سینیۆرلی" Signorelliیە، بەڵام لەبری ئەو نـاوە، نـاوی دوو وێنەکێشـی تـر، واتە "بـۆتی چلـی"Botticelli و "بولترافیۆ" Boltraffio بەسـەر زەینمـدا سەپێنرابوو. من خێـرا بەبێ هیـچ گومانێک ئەو نـاوانەم بە نادروسـت دەسـتنیشـان کـرد و کاتێک

کەسێکی تر ناوی وێنەکێشەکەی کەنیسەی ئۆریڤێتۆی لە بەرچاوی من بەسەر زاریدا هێنا بەبێ یەک چرکە شک و گومان ئەوەم ناسییەوە. پاشان کاتێک کە مەسەلەی وەبیرهێنانەوە و ئەو کاریگەریانەی ببووە هۆی ئەوەی ناوەکانی Botticelli و Boltraffioبکەمە جێگری ناوی Signorelli خستمە بەر لێکۆڵینەوە و ئەو ئەنجامانەی لای خوارەوەم دەست کەوت:

١- هۆکاری لەبیرچوونەوەی ناوی Signorelli نابێ لە جۆری تایبەتی ئەو ناوە یان تایبەتمەندیی دەروونی کۆمەڵە بارودۆخێک کە ناوەکەی تیادا گونجێنرابوو، بەدوایدا بگەڕێیت. ناوە لەبیرکراوەکە بەقەد ناوە جێگرەکان بەلامەوە ناسراو بوو، واتە Botticelli وBoltraffio، تەنانەت لە ناوی Boltraffio ناسراوتر بوو، چونکە من لە بارەی ئەو وێنەکێشەوە تەنها ئەو خاڵەم دەزانی کە گرێدراوی قوتابخانەی "میلان"ـە. کاتێک لەبیرچوونەوە ڕوویدا بوو، کە بە بۆچوونی من بە هیچ شێوەیەک نەگونجاو نەبوو و نەیدەتوانی ببێتە شرۆڤەیەک بۆ ئەوە. بارودۆخەکە بەو شێوەیە بوو: من لەگەڵ هاوگەشتێکی نەناسراودا بە ئۆتومبێل لە "ڕاگۆز" "لە دالماتی"دا دەڕۆیشتین بۆ وێستگەی هرزێ گوین. لە ڕێگای گەشتەکەماندا لە بارەی ئیتاڵیاوە قسەمان دەکرد و من لە هاوگەشتەکەمم پرسی ئایا تا ئێستا چووەتە ئۆریڤێتۆ و وێنە بەناوبانگەکانی سەر دیواری... بینیوە؟ (لێرەدا ناوی وێنەکێشەکەم لە بیر کرد).

٢- کاتێک باسی وتووێژەکەمان کە ڕێک پێش ئەوەی باسی ئیتاڵیا بکەین دەست پێ کردبوو، بە بیرم دێنمەوە، بۆ لەبیرکردنی ناوی ئەو هونەرمەندە شرۆڤەیەک (پاساوێک) دەدۆزمەوە. وا دیارە ئەو لەبیرکردنە دەرئەنجامی شڵەژاوی بابەتی باسی تازە بوو لە ڕێگای بابەتی پێشووترەوە. نەختێک پێش ئەوەی لە هاوسەفەرەکەم بپرسم:

ئایا تا ئیستا گەشتی کردووە بۆ ئۆریڤێتۆ یان نا؟ ئێمە لە بارەی دابونەریتی تورکەکانی دانیشتووی بۆسنی و هرزێ قسەمان دەکرد و منیش ئەو شتانەی یەکێک لە هاوکارەکانم بۆی باس کردبووم بۆم دەگێڕایەوە و ڕاڤەم دەکرد. هاوکارەکەم کە پزیشکی ئەو گرووپە لە تورکەکان بوو دەیگێڕایەوە کە ئەوانە متمانەیان بە زانستی پزیشکی هەیە و لە بەرامـــبەر چارەنووســـدا تەســـلیمن، کاتێــک پزیشــکی دەرمانکەری نەخۆشێکی نزیک، یان خزمی ئەوانە ناچار دەبێت پێیان دەڵێت کە نەخۆشەکەتان خەریکە دەمرێت، ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: "ئەرباب گەورەم (Herr) ئیتر باسی لێوە ناکەین، دەزانم ئەگەر بتوانیبا ڕزگارت بکردایە ڕزگارت دەکرد". باسکردنی ئەو وتووێژە بریتییە لە دوو بەشی تایبەتی Herzegovin, Bosnie و یەک وشەی Herr کە هەرسێکیان لە زنجیرەی وەبیرهێنانەوەی نێوان Signorelliو Botticelli و Boltraffio دادەنرێن.

٣- بە بڕوای مـن ئەگەر درێـژەی ئـەو بیروڕایـەی سـەبارەت بە دابونەریتی تەرکەکانی بۆسنی توانی ئەو ئەندێشەیە، کە خێرا دوای ئەو باسکردنە دەرکەوت، بشڵەژێنێت بەو هۆیەوە بووە کە من پێش کۆتایی باسەکە گرنگیم بە باسەکە نەدا. ڕێک لە بیرم دێت دەمویست بە دوای بابەتەکەدا، کورتەچیرۆکێکی تر بگێڕمەوە کە لە یادگەمدا لە پاڵ باسی یەکەمەوە بوو: تەرکەکانی بۆسنی بایەخێکی زۆر بە چێژوەرگرتنی جەستەیی دەدەن و کاتێک تووشی تێکچوونی سێکسی دەبن دەکەونە ناو دۆڵی نائومێدییەوە. ئەو نائومێدی و بێهیواییە بە تەسلیمبوون و پاڕانەوەیان لە بەرامبەر مەرگدا دژبوونێکی سەیری هەیە. ڕۆژێکیان نەخۆشێکی هاوکارەکەی من پێی وتبوو: "ئەرباب (Herr)تۆ باش دەزانی کاتێک ئیتر چێژی سێکسی لە ئارادا نەبێت، ژیـان بێبـایەخ دەبێـت"، بەڵام مـن لە گێـڕانەوەی ئەو تایبەتمەنـدییە ئەخلاقییەی تورکەکان دوورەپەرێزیم کرد و بە باشم زانی لە بەردەم

یەکێک لە نەناسراوەکاندا قسەیەکی دژەئەخلاق نەهێنمە سەر زار. لەو قۆناغەیش تێپەڕیم و هەوڵم دا تا بە دوای درێژەی ئەو ئەندێشانەی لە زەیندام پەیوەند بوو بە مەسەلەی 'مەرگ و سێکس'ـەوە بێدەنگ بێمێنەوە. هەرچەند لەو کاتەدا کاریگەری ڕووداوێکم بەسەرەوە بوو کە هەواڵەکەی چەند هەفتە لەوەوبەر لە ماوەی نیشتەجێبوونێکی کورت ماوەدا لە ترافۆی Trafoi پێم گەیشتبوو: یەکێک لە نەخۆشەکانم کە زۆر زەحمەتم بە دیاریەوە کێشابوو بەهۆی تێکچوونی سێکسی چارەسەرنەکراوەوە دەستی بە خۆکوشتن کردبوو. من بە باشی دەزانم ئەو ڕووداوە ناخۆشە بە هەموو وردەکارییەکانیەوە لە کاتی گەشت بۆ هەرزێ گوین وەک بیرەوەرییەکی هەستی لە زەینمدا بوونی نەبوو، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی هاوشێوەکەی لە نێوان دوو وشەی Trafoi و Boltraffioدەبێ قبووڵ بکرێت هەرچەند بە ئەنقەست هەوڵم دەدا سەرنجم لەسەر ئەو ڕووداوە لابەم، بەڵام بەهەرحاڵ، لەژێر کاریگەرییدا بووم.

٤- ئەوسا ئیتر نابێ لەبیرکردنی ناوی Signorelli بە شتێکی نائەنقەست لەبەرچاو بگیرێت، بەڵکوو دەبێ سەرچاوەکەی لە ورووژاوە دەروونییەکانەوە بزانرێت. من بە چەند هۆکارێکی دەروونی قسەکانم (لە بارەی دابونەریت و ڕێوڕەسمی تورکەکان و ئەوانیتر)ـەوە دابڕی بوو و بە چەند هۆیەکی هاوشێوە ئیجازەم نەدابوو ئەو ئەندێشانەی سەبارەت بەو هەواڵەی لە ترافۆیدا بیستبووم بەسەر زەینمدا زاڵ ببێت. لەو ڕووەوە دەمویست هەندێ بابەت لە بیر بەرمەوە و سەرکوتیان بکەم. هەڵبەت ئەو بابەتەی من دەمویست لە بیری خۆمی بەرمەوە ناوی وێنەکێشەکە ئۆریڤێتۆ نەبوو، بەڵام لە نێوان ئەم ناوە و ئەو بابەتەی تر جۆرێک وەبیرهێنانەوە دروست ببوو بە شێوەیەک، کە کاری بە بە ئەنقەستی

من ئامانجی سەرەکی نەپێکابوو و من بە پێچەوانەی حەزی خۆم ئەو ناوەم لە بیر کردبوو، لە حاڵێکدا مەبەستم ئەوە بوو مەسەلەیەکی تر لە زەینمدا بسڕمەوە، حەز بۆ لەبیرچوونەوە بەند بوو بە ناوەڕۆکی چیرۆکێکەوە، بەڵام نەبوونی توانای وەبیرهێنانەوە بابەتێکی تر لەخۆ دەگرت. ئەگەر حەز بۆ لەبیرکردن و ناتوانی زەین هەبوایە هەردووکیان گرێدراوی یەک ناوەڕۆک دەبوون، هەڵبەت مەسەلەکە ساکارتر بوو. لە لایەکی ترەوە بەو شرۆڤەیە، ناوە جێگرەکان بەشبەحاڵی خۆی زیاتر شیاوی پاساوهێنانەوە بوو. ئەو ناوە تایبەتانە (بە دوای جۆرێک مصالحە)ـەوە بوون، لە ڕاستیدا منیان ئاگادار دەکردەوە کە چ بابەتێکم لە بیر کردووە و لە هەمان کاتیشدا دەمویست چ ناوێک بە بیر بهێنمەوە و وایان دەردەخست، کە هەوڵدانی من بۆ لەبیرچوونەوەی مەسەلەکە نە زۆر سەرکەوتوو بووە و نەش بە تەواوی ناسەرکەوتوو بووە.

٥- وەبیرهێنانەوەی ئەو ناوەی بە دوایدا دەگەڕام و ئەو بابەتەیش لە نەستمدا سەرکوتم کردبوو (ئەو بابەتەی لەبارەی مردن و سێکسەوە بوو و ئەم ناوانەی تێدا بوو Bosnie، Herzegovine و Trafol ) وەبیرهێنانەوەیەکی زۆر سەیر بوو. بۆ وەبیرهێنانەوەی ئەو جۆرە وەبیرهێنانەوانە، من لە بابەتێکدا لە ساڵی ١٨٩٨ زایینی هەوڵم دا تا وێنایەک بنەخشێنم.

ناوی Signorelli بە دوو بەش دابەش ببوو. دوو بەشی کۆتایی (واتا (Elli بەبێ هیچ گۆڕانێک لە یەکێک لە ناوەکانی جێگردا دەهاتە بەرچاو و دوو بەشی یەکەم بە گوێرەی وەرگێڕانی وشەی "ئەرباب"ەوە بۆ Her، پەیوەندی بێئەژمار و جۆراوجۆری لەگەڵ ئەو ناوانەدا لە بابەتی سەرکوتکراودا دابین کردووە و ئەو کارەیش بووەتە هۆی ئەوەی دوو بەشی یەکەم نەتوانن لە زەینمدا پێک بێن.

جێگرکردنی ناوی Signorelli، گوایە بەبێ سەرنجدان بە واتا و سنووری ئەکۆستیکی بەشەکان، بە گوێرەی یەک جێگۆڕکێکردن لە تێکەڵاوبوونی ناوەکانیدا Bosnie، Herzegovine ڕووی داوە.

بۆیە وا دێتە بەرچاو کە لەو تێکەڵاوبوونەدا ناوەکان بە شێوەی وشەی ڕستەیی جێگۆڕکێیان کردووە و دەمانەوێ مەتەڵێکی لێ دروست بکەین، پاشان لە گشت دەرئەنجامی جێگرکردنی ناوەکاندا هیچ جۆرە ئاگادارییەک نەگەیشتۆتە ویژدانی هەست. یەکەم جار هیچ جۆرە هاوشێوەییەک لە نێوان مەسەلەی وتوویژکردن کە ناوی Signorelliـی دەبوایە تیایدا هاتبا و بابەتی سەرکوتکراو کە خێرا پێش ئەوە باسی لێوە دەکرا، جگە لە هاوشێوەبوونی بەشەکان (یان باشتر بڵێین هاوشێوەبوونی کۆی پیتەکان) شتێکیتر نەبوو

لێرەدا ڕەنگە باش بێت باسی ئەوەیش بکەین کە لە نێوان شرۆڤەکردنەکانماندا و بیرۆکەی دەروونناسی کە بارودۆخی بەیانکردن یان لەبیرچوونەوەی ناوەکان بە هەندێ پەیوەندی و هەڵکەوتوویی دادەنێن هیچ دژایەتییەک لە ئارادا نییە. ئێمە جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکەینەوە هەندێک جار مەبەستێکی هاندەر و تێکەڵاو زیاد دەکرێتە سەر ئەو هۆکارەی هەر لە کۆنەوە ناسراوە و بوونەتە هۆی سەرەکی لەبیرچوونەوەی ناوێک و مەسەلەکە دەخەینە ڕوو. هۆکاری باسکراو بە پێویست دەستیان وەرداوەتە ناو ئەو لەبیرچوونەوەیەی باسی دەکەین. تا ئیجازە بە شتی سەرکوتکراو بدەن لە ڕێگای وەبیرهێنانەوەوە زاڵ بێت بەسەر ناوی باسکراودا و ئەو دوور بخاتەوە. ڕەنگە لە بارەی ناوێکی ترەوە کە هەلومەرجی بەیانکردنی گونجاوتر بێت شتێکی وەها ڕوو نەدات. سەرباری ئەو شتانەیش کە بەرەو لای ڕاستی دەچن وادیارە شتی سەرکوتکراو بە بەردەوامی و لە هەموو بوارێکدا هەوڵ دەدات بە هەر شێوەیەک دەکرێ گەشەی خۆی بنوێنێت، بەڵام تەنها بارودۆخی تایبەت و

گونجاو ئەو کارە دەخولقێنێت. هەندێک جار سەرکوتکردن بەبێ تێکچوونی کارکردن یان باشتر وایە بڵێین بەبێ هێما و نیشانە ئەنجام دەدرێت.

بە کورتی هەلومەرجی پێویست بۆ لەبیرچوونەوەی ناوێکی تایبەت و جێگرکردنی لە ڕێگای ناوێکی ڕۆتینییەوە بەم شێوەیەیە:

١- جۆرێک ئاڕاستە بۆ لەبیرچوونەوەی ناو.

٢- دەرئەنجامی سەرکوتبوون کە ماوەیەک لەوەو پێش لە زەیندا هەبووە.

٣- ئەگەری وەبیرهێنانەوەی دەرەکی لە نێوان ئەو ناوە و ئەو شتەی، کە لەم دواییانەدا سەرکوت کراوە.

نابێ بایەخی دوایین هۆکار زۆر لە بەرچاو بگیرێت، چونکە بە گوێرەی ئاسانکاری بۆ دروستبوونی وەبیرهێنانەوەکان زۆر جار ئەگەری ئەو کارە لە ئارادایە. مەسەلەیەکی تر و گرنگتر لەوەیش ئەوەیە بزانین: ئایا ئەو جۆرە وەبیرهێنانەوانە دەرەکیانە بە ڕاستی مەرجی پێویستە بۆ بەربەستبوون بۆ دەربڕینی ناوی مەبەست؟ ئایا پەیوەندییەکی نزیکتر لە نێوان دوو مەسەلە بۆ گەیشتن بە وەها کاریگەرییەک پێویستە؟ یەکەم جار ئێمە ئاڕاستەمان هەیە حاشا لە بوونی ئەو پێویستییە بکەین و ڕووبەڕووبوونەوەی تەواو تێپەڕبووی ئەو دوو شتە جیاوازە بەوەندە دابنێین، بەڵام بە خوێندنەوەی قووڵتر بەو ئەنجامە دەگەین، کە لە زۆر بواردا دوو مادە یان دوو خاڵی بەرچاو (واتە شتی سەرکوتکراو و شتی تازە)، کە بە یەک وەبیرهێنانەوەی دەرەکی پێکەوە گرێدراون پەیوەندییەکی نزیکتریان هەیە، بەو واتایەی کە ناوەڕۆکی دوو مادەکە پێکەوە نزیکن و لە ڕاستیدا بەو نموونەیەی لەبارەی ناوی Signorelliـەوە هێنامان،

جەخت لەسەر ئەو بیرۆکەیە دەکرێتەوە.

بایەخی وەرگرتنی دەرئەنجام لە شیکردنەوەی ئەو نموونەیەی لای سەرەوە، بە گوێرەی ئەوەی کە ئەو نموونەیە بە ئەنقەست یان تەنها بە ڕێکەوت و تایبەت بێت، دەگۆردرێت، بەڵام بە ڕای من دەکرێ جەخت لەسەر ئەو خاڵە بکرێتەوە کە لەبیرچوونەوەی ناوی تایبەت لەگەڵ وەبیرهێنانەوەی ڕۆتینی زۆر جار بە هەمان شێوە ڕوو دەدات، کە ئێمە لە نموونەکەدا هێناومانەتەوە. من هەر جارەو شایەتحاڵی دیاردەیەکی وەها بوومە لە زەینمدا، توانیومە ئەوەیش وەک نموووونەی Signorelli شرۆڤە بکەم، واتە لەبیرچوونەوە بەهۆی سەرکوتکردنی مادە یان شتێک بزانم. هەروەها دەتوانم هۆکارێکی تر بۆ ئەو جەختلەسەرکردنەوەیە بهێنمەوە و بۆ ڕاستبوونی تایبەتمەندی سنخیی نموونەی Signorelli جەختی لەسەر بکەمەوە. بە ڕای من بواری لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکان لەگەڵ وەبیرهێنانەوەی ڕۆتینی ناکرێ لەو بوارانەی تیایاندا ناوی جێگربوونی نییە، بە تەواوی جیا بکرێتەوە. هەندێک جار ناوی جێگر خۆ لە خۆوە بە مێشکدا دێن، بەڵام لە هەندێ بواری تردا بە هەوڵدان و وردبینی دەکرێ بیاندۆزیتەوە، بەڵام بەهەرحاڵ، دەبینین ناوە ڕۆتینییەکان لەم دوایەیدا لەگەڵ مادەی سەرکوتکراودا هەر ئەو پەیوەندییانەی هەیە، کە ئەو ناوانەیش خۆ لە خۆوە لە زەیندا پێک دێن. بۆ ئاگاداربوونەوە لە ناوە جێگرەکان سەرەتا هەوڵدان و وردبینی و پاشان بوونی هەلومەرجێک پێویستە کە دەبێ بە هۆکاری دەروونی لە پەیوەندیدا هەبێت. بە بۆچوونی من دوایین مەرج دەبوا بە ئاسانی یان بە سەختی وەبیرهێنانەوەی پێویستی دەرەکی لە نێوان دوو مادەدا بە دوایدا بگەڕێت. لەمڕۆوە زۆربەی لەبیرچوونەوەی ناوەکان بەبێ دەرکەوتنی وەبیرهێنانەوە ڕۆتینییەکان دەکرێ لەو بوارانەدا کە تیایاندا پێکهاتەی ناوە جێگرەکان بوونی هەیە – واتە ئەو

بوارانەی کە نموونەی Signorelli میکانیزمەکەی پاساو بدرێتەوە-
پەیوەند بدرێت. ڕوونە من تا ئەو ڕادەیە نارۆمە پێشەوە، کە هەموو
بوارەکانی لەبیرچوونەوەی ناوەکان لەو ڕیزەدا پۆلێن بکەم و هەڵبەت
لە زۆر بواردا هۆکاری دەرکەوتنی لەبیرچوونەوەی ناوی تایبەت زۆر
ساکارتر دیارە. بۆیە ئێمەیش مەرجی پێویست لەدەست نادەین و
بارودۆخی ئەو جۆرە لەبیرچوونەوانە بەو شێوەیە کورتی ناکەینەوە:
لە پاڵ بوارەکانی لەبیرچوونەوەی ساکاری ناوێکی تایبەتدا هەندێ
بوار هەن، کە تیایاندا سەرکوتکردن هۆکاری لەبیرچوونەوەیە.

# بەشی دووەم

## لەبیرچوونەوەی وشەی زمانێکی بیانی

وا دیارە وشە باوەکانی زمانی دایک لە سنووری بەکارهێنانی سروشتیی وزەی زەینیماندا لە بەرامبەر لەبیرچوونەوەدا پارێزراوە. بەڵام دەزانین لە بارەی وشەی بیانییەوە مەسەلەکە فەرق دەکات. ئێمە لە کاتی قسەکردن بە زمانێکی دەرەکی لە بەش بەشی قسەکانماندا ئامادەین بۆ لەبیرچوونەوە و ئەگەر بە بەردەوامی کەڵک لە زمانێکی بیانی وەرنەگرین، یەکەم جار شڵەژانە لە کارکرنماندا گرێدراوی دۆخی تەندروستی و ڕادەی هیلاکیمانە. هەندێک جار لەبیرچوونەوەی وشەی زمانێکی دەرەکی گرێدراوی هەمان میکانیزمە کە لە بارەی ناوی Signorelliشیمان کردەوە. بۆ سەلماندنی ئەو خاڵە من تەنها نموونەیەک کە خاڵی پڕبایەخی لە بەردەستدایە لێی ورد دەبمەوە و شی دەکەمەوە. لەو نموونەیەدا ئەو وشەیەی لەبیر چووەتەوە ناوی تایبەت نییە، بەڵکوو بەشێکە لە وتەیەک کە گێڕاوەتەوە بە زمانێکی لاتینی. ئیجازە بدەن من ئەو ڕووداوە کەم بایەخە بە وردەکاری و بە شێوەیەکی هەستپێکراوەوە ڕاڤە بکەم.

هاوینی ساڵی پار کاتی گەشتکردن لە ڕۆژانی پێشوودا لەگەڵ گەنجێکدا یەکترمان ناسی، خوێندنی زانکۆی هەبوو (دوای تێگەیشتم)، کە هەندێ لە بەرهەمەکانی منی لە بارەی دەروونناسییەوە خوێندبووەوە. نازانم بە پێی چ ڕێکەوتێک قسەکانمان چووە سەر مەسەلەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی، ئەو گەنجێک بوو بە ئاوات و ئارەزووی بەرزەوە، کە لە دۆخی ناخۆشی جیلی خۆی قسەی کرد و دەستی کرد بە شکات و سکاڵا و وتی گەنجانی هاوتەمەنی ئەو

ناتوانن تواناکانیان گەشە پێ بدەن و پێویستییەکانیان دابین بکەن. ئەو دەیویست ڕەخنەکانی خۆی بە هۆنراوەیەک لە ڤیرجیلا کۆتایی پێ بهێنێت. لەو هۆنراوەیەدا دیدۆنی نابینا داوا لە نەوەکانی داهاتوو دەکات، کە بەهۆی ئەو ڕەخنە و تانە و تەشەرەی کە بەرامبەر بەو کردوویەتی، ڕەخنەی لێ بگرن. پیاوە گەنجەکە دەیویست بڵێت Exoriare، بەڵام چونکە نەیتوانی قسەکە بە باشی بگێڕێتەوە هەوڵی دا تا بۆشایی بەرچاوی زەینی خۆی بشارێتەوە و بە جێگۆڕکێکردنی ڕێکی وشەکان لە ئاکامدا بە نیگەرانییەوە وتی:

Exoriar(e) ex nostris ossibus ultor!

من چێژ وەردەگری. ئنجا درێژەی پێ دا: وا دیارە تۆ لە شلەژاویی من چێژ وەردەگری. تکایە ئەو دۆخە گاڵتەجاڕییە مەگرە خۆت و یارمەتیم بدە. لەو دێڕەدا وشەیەک بەجێماوە. ئامادەیت یارمەتیم بدەیت ئەوە بڵێمەوە. من وەڵامم دایەوە: بە گیان و دڵ، پاشان ئەو دێڕەم بە شێوەی تەواو لەبەر خوێندەوە:

Exoriear (e) aliquis nostris ex ossibus ultor!

پیاوە گەنجەکە وتی: لەبیرچوونەوەی وشەیەکی وەها لە ڕاستیدا گەمژانەیە. جیا لەوەیش بە پێی بۆچوونەکانت مرۆڤ بەبێ هۆ هیچ شتێک لەبیر ناکات. لەمڕۆوە زۆر پێم خۆشە بزانم بۆچی ویژدانی نادیار- aliquisم لە بیر کردووە.

من بە خۆشحاڵی و بەو هیوایەی بتوانم کۆمەڵێک لە نموونە نوێیەکانی خۆم دەوڵەمەندتر بکەمەوە، داواکاریی ڕکابەرایەتی ئەوم قبووڵ کرد و وتم:

-باشە، هەوڵ دەدەم ئەو هۆکارە بدۆزمەوە. تەنها تکا دەکەم ڕاستگۆیانە و بەبێ هیچ ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانە پێم بڵێن؛ کاتێک

سەرنجی خۆت بەبێ هیچ مەبەستێکی دیاریکراو دەخەیتە سەر وشەی liquis، چ شتێک بە زەینت دەگات؟

وتی: زۆر باشە. ئەو بیرکردنەوە گاڵتەجارییە، کە ئێستا بە زەینم دەگات ئەوەیە کە وشەکە بکەمە دوو بەشەوە a و liquis واتای ئەو بیرکردنەوەیە چییە؟

- نازانم. چ بیرکردنەوەیەکی ترت بە مێشکدا دێت؟

ئەم وشانە:

liuide١٦ ,liquide١٥ ,liquidation١٤ ,Relique١٣

ئەو وشانە بە لاتانەوە بە چ واتایەک دێن؟

- هیچ واتایەکی ڕوونیان نییە، بەڵام درێژەی پێ بدەن.

پیاوە گەنجەکە بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕیانە وتی: من بیر لە سیمۆن دۆ ترانت ١٧ Trente دەکەمەوە. دوو ساڵ لەمەوبەر لە یەکێک لە کەنیسەکانی ترانتدا پاشماوەی پیرۆزیم بینی. بیر لەوە دەکەمەوە لە ئێستادا لە بارەی جینایەتە ئاینییەکانەوە، دیسانەوە هەندێ تاوان دەخەنە پاڵ جوولەکەکان و هەروەها بیر لە بەرهەمێکی کلین پاوێل دەکەمەوە. ئەو لە بوونی ئەو قوربانیانە، کە تەنها وەک خەیاڵ دادەنرێت نەتەوەی جوولەکە سومبولی خودایی یان بە واتایەکی سادەتر دەرکەوتنێکی نوێ لە ڕزگارییەخش دەبینێت.

من وتم: ئەو بیرکردنەوە نوێیە کەم تا کورتێک پەیوەندی هەیە لەگەڵ وتووێژەکەماندا پێش ئەوەی وشەی aliquis لە بیر بکەین. ئێستا بیر لە بابەتێک دەکەمەوە کە لەم ڕۆژانەدا لە ڕۆژنامەیەکی ئیتالییدا خوێندوومەتەوە و پێموایە ناونیشانەکەی "گرێی ئاگۆستینەنی پیرۆز لە بارەی ژنان"ەوە بوو، لە هەموو ئەو بابەتانەدا چ دەرئەنجامێک

وەردەگرن؟

من وتم چاوەڕێی دوایی بابەتەکەم.

پیاوە گەنجەکە وتی: ئێستاکە بیرکردنەوەیەکم هەیە، کە بە دڵنیاییەوە هیچ پەیوەندییەکی بەو مەسەلەیەوە نییە ئێمە لەبارەیەوە قسەمان دەکرد.

- تکایە ڕەخنە مەگرە.

- پێشتر ئەو خاڵەت وتبوو. من پیاوە پیرێکی زۆر قۆز و باڵاریکم بە بیر دێتەوە، کە هەفتەیەک لەوەوبەر لە کاتی گەشتەکەمدا چاوم پێی کەوت. مرۆڤێکی زۆر سەیر و تایبەت (Original) بوو، کە هاوشێوەی باڵندەیەکی ڕاوکەر بوو. ئەگەر پێتان خۆشە بزانن ناوی چییە، ناوی بنوایە.

- وا دیارە گەیشتینە کۆڕی کەسە پیرۆزەکان و قەشەکان: سیمۆنی پیرۆز، ئاگۆستیەنی پیرۆز، بنوای پیرۆز. پێموایە قەشەیەکی تر بە ناوی ئۆریژێن Origeneەوە هەیە. جیا لەوەیش ئەو سێ ناوە ناوی بنەماڵەیی نین، وەک پۆل paul لە کلێن پۆل kleinpaul.

- ئێستا من بیر لە جێنڤیەری پیرۆز و پەرجۆی خوێنەکەی دەکەمەوە، بەڵام هەموو ئەو بیرکردنەوانە خۆ لە خۆوە بەبێ ڕاوەستان بە زەینمدا دێت.

- ئەو جۆرە بۆچوونانە بەلاوە بنێ. جنێڤیەری پیرۆز و ئاگۆستیەنی پیرۆز، هەردووکمان دەخاتە یادی ڕۆژژمێرەوە. تکایە پەرجۆی خوێنی جنێڤیەری پیرۆزم بۆ بگێڕەوە.

- بە گیان و دڵ لە کەنیسەیەک لە ناپێلادا خوێنی جنێڤیەری پیرۆز لە شووشەیەکدا ڕادەگیرێت. هەموو ساڵێک شتێک ڕوو دەدات و ئەو

خوێنەیش لە کاتی جەژنێکی ئاینیدا دیسانەوە بە شێوەی شلەمەنی لێ دێتەوە. خەڵک زۆر گرنگی بەو پەرجۆیە دەدەن و کاتێک ڕووداوەکەی دوا دەکەوێت زۆر نیگەران دەبن. لە کاتی شەڕی فەرەنسادا جارێکیان ئەو ڕووداوە دواکەوت و لەو کاتەدا جەنەڕاڵی فەرماندە – کە ڕەنگە گاری باڵدی بووە- قەشەی کەنیسەکەی بانگ کردە لایەک و لە حاڵێکدا کە بە جووڵەیەکی واتادار ئەو سەربازانەی پیشان دەدا کە لە دەرەوەی کەنیسە بە ڕیزەوە وەستابوون، وتی: هیوادارم ڕوودانی پەرجۆکە دوانەکەوێت و بەڕاستیش پەرجۆکە ڕووی دا.

من پرسیم: ئەی پاشان؟ درێژەی پێ بدە، بۆچی دوودڵی؟

پیاوە گەنجەکە وتی: ئێستا بیر لە بابەتێکی تر دەکەمەوە... بەڵام ئەو مەسەلەیە زۆر تایبەتە و ناتوانم ئەوەت پێ بڵێم... جیا لەوەیش بە ڕای من لە نێوان ئەو بابەتە و ئەو شتەی خۆ سەرنجی دەدەیت هیچ پەیوەندییەک نییە و پێویست ناکات ئەو بیرکردنەوەیەت بۆ شرۆڤە بکەم...

من وتم: نیگەرانی بوون یان نەبوونی پەیوەندی مەبە. هەڵبەت من ناتوانم هانت بدەم ئەو شتەی بە لاتەوە ناخۆشە بیگێڕیتەوە، بەڵام لەو کاتەدا داوام لێ مەکە کە هۆی لەبیرکردنی وشەی aliquis ت بۆ شرۆڤە بکەم.

- بەڕاست وابیر دەکەیتەوە؟ کە واتە بۆتی دەگێڕمەوە کە لە ناکاو بیر لە خانمێک دەکەمەوە. ڕەنگە بەم زوانە هەواڵێکی لێوە وەربگرم کە هەم بۆ خۆی ناخۆشە و هەم بۆ من.

من پرسیم:

- ئایا ئەو هەواڵە لە بارەی دابڕانی خووی مانگانەیە؟

پیاوە گەنجەکە پرسی:

- چۆن توانیت هەڵیبێنیت؟

- زۆر بە سادەیی. تۆ زەینی منت بۆ بیستنی ئەو کارە بە تەواوی ئامادە کردبوو. بە بیرتی بهێنەوە کە چۆن لە بارەی هەموو پیرۆزەکانی ڕۆژژمێر قسەت کرد. چیرۆکی شلبوونەوەی خوێنی جێنقیەری پیرۆز کە لە ڕۆژێکی پیرۆزی دیاریکراودا ڕوو دەدات، ورووژانی ئەو خەڵکە کاتێک کە ئەو پەرجۆیە ڕوو نادات و ڕەنگە هێمای کارەساتێکی ناخۆش بێت... تۆ لە خوێنی جێنقیەری پیرۆز نموونەیەکی زۆر جوانت دروست کرد، کە بە شێوەی ڕواڵەتی پیشاندەری کارێک بوو کە لە بارەی سووڕی مانگانەی ژنی باسکراوەوە سەرنجی تۆی ڕاکێشا.

- بەڵام من هەرگیز ئاگاداری ئەو شتە نەبووم، کە نموونەیەکم بەکار هێناوە. ئایا بە ڕاستی وا بیر دەکەیتەوە نەبوونی توانای من بۆ وتنی وشەی aliquis بەهۆی چاوەڕوانییەکی زۆر لە نیگەرانییەوەیە؟

- بە ڕای من هیچ گومانێک لەو بارەوە نییە. بە بیر خۆتی بهێنەوە چۆن وشەی aliquisتت کردە دوو بەشەوە: a وliquis، هەروەها وەبیرهێنانەوەکانی relique , liquidation , liquideتت بە دوای ئەو وشەیەدا هێنایەوە. ئایا من دەبێ ناوی سیمۆنیش کە لە منداڵییەوە بووەتە قوربانی، بیخەمە سەر ئەم کۆمەڵەیە؟ تۆ پاش وتنی وشەی reliqueبیرت لەو کردەوە.

پیاوە گەنجەکە وتی: لەو کارە دوورەپەرێز بە و هیوادارم ئەگەر بە ڕاستی ئەو بیرکردنەوانەم هەبووە تۆ ئەوانە بە جدی وەرنەگری. لەبری ئەوەدا دەبێ دانی پێدا دابنێم کە ژنی مەبەست ئیتاڵیاییە و لەگەڵ ئەودا پێکەوە ناپێلمان بینیوە، بەڵام ئایا هەموو ئەو وەبیرهێنانەوانە بەهۆی پێکدادان و ڕووداوەوە نییە؟

من وەڵامم دایەوە:

- خۆت دادوەری بکە، ئایا هەموو ئەو پێوانەکردنانە دەکرێ تەنها بەهۆی ئەو ڕووداوەوە دابنێین. پێم خۆشە پێتان بڵێم هەر جارەو پێت خۆش بێت یەک جۆر لەبیرچوونەوە شی بکەیتەوە بە دڵنیاییەوە ڕووبەڕووی ئەو جۆرە ڕووداوانە دەبیتەوە کە بەو ڕادەیە سەیرە و شایانی سەرنجدانە.

من بە هۆکاری جۆراوجۆر زۆر گرنگی بەو شیکردنەوە کورتە دەدەم و ئەوەیش قەرزداری یارمەتی و هاوکاری بێوچانی هاوسەفەرەکەمە. لە پلەی یەکەمدا من توانیم لەو بارەیەوە بگەمە سەرچاوەیەک کە زۆر جار لێی بێبەریم. لە ڕاستیدا زۆر جار بۆ ئەو نموونانەی لە بارەی تێکچوونی کارکردنی دەروونی ناچار دەبم یارمەتی وەربگرم لەو شتانەی دەیبینم، کە لە بارەی خۆمەوە ئەنجامم داوە. ئەو تێکچوونانە لە ژیانی ڕۆژانەدا ڕوو دەدەن و من لێرەدا هەوڵم داوە ئەوانە کۆ بکەمەوە. بەڵام لە بارەی هەندێ نموونەی جۆراوجۆرەوە کە نەخۆشی دەروون ڕەنجبەر دەیخەنە ڕوو، هەوڵ دەدەم ناویان لێیەوە نەهێنم، چونکە پێم خۆش نییە نارەزایەتیم بۆ دەرببڕن و بڵێن ئەو دیاردانەی شییان دەکەمەوە ڕێک هەمان دەرئەنجام و دیاردەی دەروون ڕەنجبەرین. لەمڕووەوە کاتێک ڕووبەڕووی کەسێک دەبمەوە کە لە بواری دەروونییەوە لە تەندروستی تەواودا بەسەر دەبات و ئامادە دەبێت بکەوێتە بەر شیکردنەوەی دەروونی، زۆر خوشحاڵ دەبم. ئەو شیکردنەوەیە لە بوارێکی ترەوە بە ڕای من گرنگە، چونکە بوارێکە بۆ لەبیرچوونەوە، کە تیایدا بیرەوەری جێگیر بوونی نییە و ئەو کارەیش ئەو بیرۆکەیەی پێشتر باسم کرد جەختی لەسەر دەکاتەوە، بەو واتایە پیشان دەدات بوون یان نەبوونی بیرەوەری ڕۆتینی جێگر، جیاوازییەکی بەرچاو لە نێوان جۆرەکانی

لەبیرچوونەوەدا دروست ناکات.

جیاوازییەکی تر نموونەی aliquis لە جۆری Signorelli جیا دەکاتەوە و ڕاکێشانێکی بنەڕەتیی پێ دەبەخشێت: لە ڕاستیدا لە نموونەی یەکەمدا وتنی ناوە بەهۆی بەرپەرچدانەوەوە لە زنجیرەیەک لە بیروباوەڕ کە نەختێ لەوەوبەر دەستی پێ کردووە و کۆتایی پێ نەهاتبوو، تێک درابوو، بەڵام ناوەڕۆکی ئەو بیرکردنەوانە هیچ پەیوەندییەکی بەرچاوی لەگەڵ مەسەلەی وتووێژ لە بارەی Signorelli نییە. لە نێوان ئەم بابەتی دوورەوەخراو و ئەو بابەتەی کە ناوە لەبیرکراوەکەی لەبەر بوو تەنها پەیوەندیی بەرچاو، دۆخێکی کاتی بوو، بەڵام هەمان پەیوەندی بۆ وەبیرهێنانەوەیەکی دەرەکی و دابینکردنی پەیوەندی لە نێوان دوو بابەتدا بەسە. بە پێچەوانەوە لە نموونەی aliquisدا کاریگەری یان ئاسەوارێک لەو بابەتە سەرکوتکراو و سەربەخۆیە نەبوو، کە ساتێک لەوەوبەر وەک مادەیەکی تێکدەر کاری کردبێت. لەو بارەیەوە تێکچوونی وتنی وشە لە خودی وشە سەرچاوە وەردەگرێت و بەدوای دژبەرێکی نەست لە نێوان بیرکردنەوەیەک و حەزلێکردنێک ڕوو دەدات و هۆنراوەی باسلێوەکراو ئەو حەزلێکردنەی دەرخست. هۆکاری دیاردەی لەبیرچوونەوەی وشەی aliquis وەها بوو: ئەو کەسەی لەگەڵیدا قسەم دەکرد گلەیی و سکاڵای هەبوو لە دەستی گەنجی جیلی نوێ و دەیوت ناتوانن لەو هەموو مافەی داوای دەکەن سوود وەربگرن و وەک ڕاکردن پێشبینی دەکرد، کە جیلێکی نوێ دێتە ناو دنیای هەستی و تۆڵەی هەژارانی جیلی تازە دەکاتەوە. ئەو لە کاتی وتنی ئەو بابەتەدا لە خەیاڵیدا وتووێژی کردبوو لەگەڵ جیلی داهاتوودا، بەڵام لە هەمان کاتدا بیرکردنەوەیەکی دژبەر لەگەڵ ئەو جۆرە ئاڕاستانەدا لە زەینیدا پێک هات: "ئایا تۆ بە ڕاستی و بە گروتینەوە پێت خۆشە کە جیلێکی تر لە تۆ دروست بێت؟ نا، وا نییە، چونکە ئەگەر ئێستا

کەسێک کە دەیناسی هەواڵت پێ بدات کە منداڵت دەبێت زۆر دەشڵەژێت و کارت تێدەکرێت. نا، هەرچەند تینووی تۆڵەسەندنەوەی، بەڵام ناتەوێت کە جیلێک لە تۆ پێک بێن'.

ئەو دژبەریانە ڕێک وەک ئەو دژبەرەی لە نموونەی Signorelli بینیم بەهۆی وەبیرهێناوەیەکی دەرەکییەوە - لە نێوان یەکێک لە مادەکانی پەرچدانەوە و یەکێک لە مادە سەرکوتکراوەکانی ئەو کەسەی قسەی لەگەڵم دەکرد - ئاشکرا بوو، بەڵام ئەمجارەیان وەبیرهێنانەوە بە شێوەیەکی زۆر بەرجەستە و لە ڕێگایەکەوە کە دەستکرد دێتە بەرچاو پێک دێت. یەکێکی تر لە هاوشێوە بنەڕەتییەکان لە نێوان دوو نموونەی ناوبراودا ئەوەیە کە دژبەرەکان لە هەر دوو بواردا لە سەرکوتەوە سەرچاوە دەگرێت و تەنها ئەو بیرکردنەوانەی کە دەتوانن سەرنج بە لاڕێدا بەرن بوونەتە هۆی لەبیرچوونەوە.

ئەوانە هەندێ بابەتن کە ئێمە لە بارەی ناکۆکی و هاوشێوەییە دەروونییەکانمانەوە دەتوانین دوو نموونە بڵێین. لێرەدا بوونی میکانیزمێکی دووەمی لەبیرچوونەوەمان بینی، ئەو میکانیزمە بە پشتبەستن بە دژبەرێکی دەروونی کە لە بابەتی سەرکوتکراو سەرچاوە دەگرێت، بووە هۆی شڵەژاوی بیرکردنەوەیەک. ئێمە لە درێژەی توێژینەوەکانماندا دیسانەوە ڕووبەڕووی هەندێ بارودۆخ دەبینەوە کە هەر ئەو میکانیزمە خۆی دەنوێنێت (کە بە ڕای من لە تێگەیشتووترین میکانیزمەکانە).

# بەشی سێیەم

## لەبیرچوونەوەی ناوەکان و کۆمەڵێک وشە

ئەو ئەزموونەی لەبارەی میکانیزمی لەبیرچوونەوەی وشەیەک لە ڕستەیەکدا بە زمانی بیانی بە دەستمان هێنا ئیجازەمان پێ دەدات لە خۆمان پرسیار بکەین، کە ئایا دەکرێ بۆ لەبیرچوونەوەی ڕستەکانی زمانی دایک وەها شرۆڤەیەک پەسەند بکرێت؟ زۆر جار خەڵک لە بەرامبەر ئەگەری وتنی ڕێک و بێکەموکورتی دەستەواژەیەک یان هۆنراوەیەک کە ساتێک لەوەبەر لەبەریان کردووە تووشی سەرسوورمان نابن، بەڵام چونکە لەبیرچوونەوە بە شێوەیەکی هاوسەنگ کۆی بابەتەکان پارێزراوە لە خۆی ناگرێت و تەنها کاتێک هەندێ لەو مادانە لەخۆ دەگرێت کە ڕەنگە شتێکی سەیر بێتە بەرچاو ئەگەر چەند نموونەیەک لە بەیانکردنی نادروستی شتە پارێزراوەکان بخەینە بەر شیکردنەوە.

یەکێک لە هاوکارە گەنجەکانم کاتێک لە بارەی مەسەلەیەکەوە قسەمان دەکرد، بۆچوونی دەردەبڕی کە لەبیرچوونەوەی هۆنراوە بە زمانی دایک بەهۆی هەمان هۆکارەوەیە، کە لەبیرچوونەوەی وشەکان بەندن بە زمانێکی بێگانەوە. ئەو خوویست بوو بۆ جەخت لەسەرکردنەوەی ئەو بیرۆکەیە کە تاقی بکرێتەوە. کاتێک پرسیارم لێ کرد بۆ تاقیکردنەوە چ هۆنراوەیەک هەڵدەبژێرین، باسی هۆنراوەی "دەستگیرانەکەی کۆرینتێ" بەرهەمەکەی گۆتەی کرد، چونکە ئەو هۆنراوەیەی زۆر خۆش دەویست و پێی وابوو لانی کەم هەندێ لە تەوەرەکانی لەبەرە، بەڵام بۆ بەیانکردنی یەکەمین دێڕەکان تووشی گومانێکی ئاشکرا بوو و پرسی: ئایا دەبێ بڵێم "لە کۆرینتەوە ڕۆیشت

بەرەو ئەسینا" یان " لە ئەسیناوە بەرەو کۆرینت؟" من بۆ چرکەیەک دوودڵ مامەوە، بەڵام لە ئاکامدا بە زەردەخەنەیەکەوە وتم: ناوی هۆنراوەکە "دەستگیرانی کۆرینت"ـە و لەم ڕووەوە لە بارەی ئەو ڕێگایەی کە دەبێ کەسایەتی سەرەکی چیرۆکەکە ئەنجامی بدات شک و گومانێکی تێدا نییە. بەیانکردنی یەکەمین پەرەگرافی هۆنراوەکە تاڕادەیەک بە شێوەیەکی مامناوەند ئەنجام درا، یان لانی کەم دەکرێ بڵێین ئاڵوگۆڕێکی دژەباو بە شێوەی مامناوەند لە ناوەڕۆکی بابەتەکەدا ئەنجام نەبوو. پاش دێڕی یەکەمی پەرەگرافی دووەمی هۆنراوەکە وا دیارە، کە هاوکارەکەم چرکەیەک بەدوای وشەکاندا دەگەڕێت، بەڵام خێرا درێژەی هۆنراوەکەی خوێند و وەهای خستە سەر:

Aber wird er auch willkommen scheinen,

Jetz, wo Jeder Tag was Neues bringt?

Denn er ist noch Heide mit den seinen.

Und sie sind Christen und – getauft.

(ئایا ئەوانە بەخێرهاتنی پێ دەڵێن؟ ئێستا هەموو ڕۆژێک کارەساتێکی نوێ ڕوو دەدات، چونکە ئەو و خزمەکانی هێشتا کافرن، لە حاڵێکدا ئەوانە مەسیحین و غوسڵی تەعمید کراون).

لە چەند چرکە لەوەوپێشەوە بە سەیرەوە گوێم لەو دێڕانە گرتبوو، بەڵام کاتێک هاوکارەکەم دوایین دێڕی تەواو کرد، ئێمە هەردووکمان تێگەیشتین کە لەم بەشەدا لە هۆنراوەکەدا ئاڵوگۆڕێک پێک هاتووە و لەبەر ئەوەی نەمتوانی پیابچمەوە ڕۆیشتمە کتێبخانە و دیوانی هۆنراوەی گوتەم دۆزییەوە و کاتێک تێگەیشتم کە ڕستەیەکی تر

لەبری دێڕی دووەمی هۆنراوەکە دانراوە، سەرم سوورما، چونکە ڕستەی جێگر هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی دروستکراوی زەینی هاوکارەکەم بوو. ناوەڕۆکی سەرەکی دێڕەکان بەم شێوەیە بوو:

Aber wird er auch willkommen scheinen.

Wenn er teuer nicht die Gunst erkauft?

(ئایا بەخێرهاتنی دەکەن، ئەگەر ئەو خۆشەویستییە بە نرخێکی زۆر وەرنەگیرێت؟)

هەروەها وشەی erkauft لە دێڕی دووەمی هۆنراوەکەی گۆتەدا بە وشەی getauft لە دێڕی چوارەمدا هاوکێش بوو و وادیار بوو هاوکارەکەم تەنانەت بە کۆی وشەکانی کافر و مەسیحی و غەسل تەعمید دراوە و نەیتوانیوە ناوەڕۆکەکەی لەبەر بخوێنێتەوە. لێی پرسیم: تکایە شرۆڤەم بۆ بکە بۆچی دێڕێک لەو هۆنراوەیە کە خۆت وتەنی بە جوانی دەتناسی بە تەواوی لە بیرت کردبوو؟ تۆ لە بری ئەو دێڕەی لەبیرت کردبوو ڕستەیەکی ترت بەکار هێنا، ئایا لەبارەی سەرچاوەی ئەو ڕستەیەوە شتێکت بەبیرت دێتەوە؟

هاوکارەکەم دەیتوانی لەو بارەیەوە ڕوونکردنەوەیەک بدات، بەڵام دیاربوو ئەو کارە بە پێچەوانەی حەزی خۆیەوە ئەنجامی دەدا. وتی: ڕستەی: "ئێستا هەموو ڕۆژێک کارەساتێک ڕوو دەدات" لە بەرچاوم زۆر نادیار بوو. پێم وایە چەند ڕۆژ لەوەوبەر لە کاتی قسەکردن بۆ نەخۆشەکانم ئەو ڕستەیەم بەکار هێنا. بەو شێوەیەی دەزانی ڕێژەکەیان هەموو ڕۆژێک زیاتر دەبێتەوە و ئەو کارەیش دەبێتە هۆی پشت گەرمی و خۆشحاڵیم. بەڵام بۆچی ئەو ڕستەیەم هێنایە ناو هۆنراوەکەوە؟ حەتمەن ئەو کارە هۆکارێکی هەیە. دیارە ڕستەی

"ئەگەر ئەو خۆشەویستییە بە نرخێکی زۆر وەرنەگرێت" بەلامەوە ناخۆش نەبووە و ئەو واتایە بەندە بە مەسەلەیەکی ترەوە. ڕاستییەکەیت دەوێت جارێکیان داوای خوازبێنیم لە کچێک کرد و وەلامی نەرێم بیست، بەلام چونکە ئێستا بارودۆخی مالیم باشترە دەمەوێ دیسانەوە خوازبێنی لێ بکەمەوە. زیاتر لەوەیش ناتوانم شرۆڤەی بکەم، بەلام بێگومان بەلامەوە ناخۆش نییە ئەگەر وا بیر بکەمەوە ئەمجارەیان داواکارییەکم قبوڵ بکرێت، تەنها مەسەلەی حساب و کتێب لە گۆڕێدایە و جاری یەکەم کاتێک داواکارییەکەمی قبوڵ نەکرد بەهۆی حساب و کتێبەوە بووە.

ئەو شرۆڤەیە من ڕازی ناکات و بە گشتی دەبوایە لە پرسیارکردن لە بارەی وردەکارییەکانەوە دووریم بکردایە. سەرباری ئەوەیش زیاتر ڕۆیشتم و پرسیم: بەلام بە گشتی چی ڕووی دا، کە تۆ مەسەلەی تایبەتی و شەخسیی خۆتت لە ناوەڕۆکی هۆنراوەی "دەستگیرانی کۆرینت" هێنا؟ ئایا بەو شێوەیەی لە بەرهەمەکەی گوتەدا ناکۆکی ئاینی لە نێوان دوو دەستگیرانەکەدا هەیە، تۆ و ئەو کچەی خۆشت دەوێ دوو ئاینی جیاوازتان هەیە؟ گوتە لە بەشێکی تری هۆنراوەکەدا دەڵێت:

(Kommt ein Glaube neu,

Wird oft Lieb, und Treu

Wie ein böses Unkraut ausgerauft).

(باوەڕی نوێ – عەشق و خۆشەویستی– وەک ئەلەفێکی بێسوود بژار دەکات).

بیرکردنەوەکەم ڕاست نەبوو، بەلام تێگەیشتم پرسیارێک لە شوێنی

گونجاوی خۆیدا و ڕێنوێنیکەر بێت تا چ ڕادەیەک دەتوانێت زەینی مرۆڤێک لە بارەی ئەو مەسەلانەی کە خۆی پێشتر ئاگاداریان نەبووە ڕوونی بکاتەوە: بەرامبەرەکەم بە خەفەت و پەژارەوە سەیری کردم و بە چپەوە دەتوت بۆ خۆی بەشێکی تری لە هۆنراوەکەی لەبەر خوێندەوە:

Sieh Sie an genau!

Morgen ist sie grau.

(باش سەیری بکە! سبەینێ پیر دەبێت و مووی سپی دەبێت).

پاشان زیادی کرد: ئەو تاڕادەیەک لە من بە تەمەنترە.

چونکە دەمویست زیاتر لەوە نەبمە هۆکاری خەم و پەژارە بۆ هاوکارە گەنجەکەم، دەستم هەڵگرت لە پرسیار و وەڵام. ئەزموونێکی باشم وەرگرتبوو، بەڵام ئەو شتەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو ئەو خاڵە بوو، هەوڵدانم بۆ بە دەستهێنانی هۆکارێک لە کەموکورتیدا زەینی کەم بایەخی هان دام بۆ ئاڕاستەی تایبەت و خەفەتاوی، ئەو مەسەلانەی کە بە هەستی خەفەتاوی بەرامبەرەکەم پەیوەندییەکی تۆکمە بوو.

ئێستایش نموونەیەکی تر بۆ لەبیرکردنی ڕستەیەک، کە بەشێکە لە هۆنراوەیەکی بەناوبانگ دەهێنمەوە. ئەمەیان کاک ک.گ. یۆنگ لە چاپی داوە و منیش وەک خۆی دەیگێڕمەوە.

پیاوێک دەیویست هۆنراوەی بەناوبانگی "سنەوبەرێک بە تەنیایی سەر هەڵدێنێت"، بەرهەمی هانریش هاین لەبەر بخوێنێتەوە. لەو ڕستەیەدا کە بە "خەوی دێت" دەست پێ دەکات، ئەو وشەکانی "بە بەتانییەکی سپی" بە تەواوی لەبیر کردبوو و بە داماوی و ناتوانییەوە لە خوێندنەوە ڕاوەستا. لەبیرچوونەوەی دێڕێکی بەناوبانگی وەها بەلامەوە سەیر بوو، پاشان لەو پیاوە ویستم هەر شتێک لە بارەی

ئەو وشـانە، واتە "بە بەتـانییەکی سـپی" بە زەینیـدا هـات بە ئـازادی بیگێڕێتەوە. کۆی قسەکانی وەها بوو.

"لە بـارەی بەتـانیی سـپی، مـرۆڤ بیـر لە کفـن دەکـاتەوە، بیـر لەو قوماشـەی کە تەرمـی پـێ دادەپۆشـن بیـدەنگی و پاشـان بیـر لە هاوڕێیەکی خۆشەویست دەکەمەوە لەناکاو براکەی تیاچوو بە ڕواڵەت وا دیار بوو بەهۆی جەڵدەی مێشکەوە مردووە جیا لەوەیش کەڵەگەت بوو هاوڕێیەکەشم هەر بەو ڕادەیە لەشی جوانە من پێشتر وام بیر کردووەتەوە ڕەنگە ئەوەیش هەر بەو شێوەیە بمرێت ئەگەری زۆری هەیە هاوڕێکەم وەرزشی زۆر ناکات کاتێک هەواڵی مردنیم پێگەیشت لەناکاو تووشی دڵەڕاوکێ بووم و ترسام منیش بەهۆی کارەساتێکی وەهـاوە بمـرم، چـونکە هەمـوو ئەنـدامانی خێـزانەکەم توانـایی قەڵەوبوونیان تێدایە، باپیریشم جەڵدە لێی دا، پێموایە زۆر قەڵەوم و چەند ڕۆژێک دەبێت ڕێجیمی لاوازیم کردووە".

پۆنـگ دەڵێـت: "ئەو کەسـە بەبـێ ئەوەی ئاگـادار بێـت، لەگـەڵ سنەوبەرێکی وەستێنراو لە کفنێکی سپیدا بیرکردنەوەی هاوشێوەی کردبوو.

نمـوونەی لای خـوارەوە قەرزداری هـاوڕێم س. فرنـزی خەڵکـی بۆداپێست دەزانم. ئەو نموونەیە لە هۆنراوەی هۆنراوەبێژان تێهەڵکێش نەکـراوە، بـەڵکوو قسـەی کەسـێکە. لەم نمـوونەیەدا ئـێمە یەکێـک لە بوارەکانی کەم باوتر دەبینین: لێرەدا لەبیرچوونەوە دەکەوێتە خزمەتی هەسـتی دوورەپەرێـزی و کاتێـک کە نـزیکە تەسـلیمی ئـارەزووی هەڵخەڵەتاندن بین، ئەو هەڵە ڕەفتارییە ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ و بەسوود دەگێڕێت. کاتێـک دیسـانەوە عەقڵـی باشـمان بەدەسـت دێنیـنەوە ئەو بەرپەرچـدانەوە دەروونیـیە هـان دەدەیـن، چـونکە کاتێـک دەکەویـنە ژێررکێفی ئارەزوویەکی توندەوە، ئەو بەرپەرچدانەوەیە تەنها دەتوانێ

...ی سپی بە ڕەییدا هات بە ئازادی بیگێڕێتەوە. کۆی قسەکانی وەها بوو.

"لە بارەی بەتانیی سپی، مرۆڤ بیر لە کفن دەکاتەوە، بیر لەو قوماشەی کە تەرمی پێ دادەپۆشن بێدەنگی و پاشان بیر لە هاوڕێیەکی خۆشەویست دەکەمەوە لەناکاو براکەی تیاچوو بە ڕواڵەت وا دیار بوو بەهۆی جەڵدەی مێشکەوە مردووە جیا لەوەیش کەڵەگەت بوو هاوڕێیەکەشم هەر بەو ڕادەیە لەشی جوانە من پێشتر وام بیر کردووەتەوە ڕەنگە ئەوەیش هەر بەو شێوەیە بمرێت ئەگەری زۆری هەیە هاوڕێکەم وەرزشی زۆر ناکات کاتێک هەواڵی مردنیم پێگەیشت لەناکاو تووشی دڵەڕاوکێ بووم و ترسام منیش بەهۆی کارەساتێکی وەهاوە بمرم، چونکە هەموو ئەندامانی خێزانەکەم توانایی قەڵەوبوونیان تێدایە، باپیریشم جەڵدە لێی دا، پێموایە زۆر قەڵەوم و چەند ڕۆژێک دەبێت ڕێجیمی لاوازیم کردووە".

پۆنگ دەڵێت: "ئەو کەسە بەبێ ئەوەی ئاگادار بێت، لەگەڵ سنەوبەرێکی وەستێنراو لە کفنێکی سپیدا بیرکردنەوەی هاوشێوەی کردبوو.

نموونەی لای خوارەوە قەرزداری هاوڕێم س. فرنزی خەڵکی بۆداپێست دەزانم. ئەو نموونەیە لە هۆنراوەبێژان تێهەڵکێش نەکراوە، بەڵکوو قسەی کەسێکە. لەم نموونەیەدا ئێمە یەکێک لە وارەکانی کەم باوتر دەبینین: لێرەدا لەبیرچوونەوە دەکەوێتە خزمەتی ەستی دوورەپەرێزی و کاتێک کە نزیکە تەسلیمی ئارەزووی ەڵخەڵەتاندن بین، ئەو هەڵە ڕەفتارییە ڕۆڵێکی پۆزەتیڤ و بەسوود ەگێڕێت. کاتێک دیسانەوە عەقڵی باشمان بەدەست دێنینەوە ئەو ڕپەرچدانەوە دەروونییە هان دەدەین، چونکە کاتێک دەکەوینە ڕکێفی ئارەزوویەکی توندەوە، ئەو بەرپەرچدانەوەیە تەنها دەتوانێ

دەناسم" و منیش بە ئاماژەدان بە ئەزموونە دەروونشیکارییەکان وەڵامم دابووەوە: "دەبێ زیاتر لەوەیش بڕۆیتە پێشەوە و دانی پێدابنێیت کە هەموو سووچەکانی ڕۆحی حەیوانی مرۆڤ دەناسی".

پاشان دەرئەنجام ئەو بیرەوەرییەی دەمویست دۆزیمەوە، تێگەیشتم لەو کۆڕەدا کە ئامادە بووم ئەگەری ڕاڤەکردنی ئەو بیرەوەرییە بوونی نەبوو. لەگەڵ هاوسەرە گەنجەکەی ئەو هاوڕێیەم لە بارەی سروشتی حەیوانی ویژدانی نەستی مرۆڤەوە پێکەوە قسەمان کردبوو لە کۆڕی ئامادەبواندا بوو و من بە باشی دەمزانی بە هیچ شێوەیەک ئامادەیی بیستنی قسەی وەها ناخۆشی نییە. لەبیرچوونەوە ببووە هۆی ئەوەی کە لە باسێکی دووروودرێژدا لەگەڵ ئەو ژنەدا و پرسیاری دوابەدوای یەک و نیگەرانکەری ئەو بپارێزرێم. ئەگەری هۆی "بۆشایی کاتی"ی من هەر ئەوە بووە. سەیر لەوەدایە ئەندێشەی جێگر لە ڕستەیەکی تردا وترابوو و ڕستەی لەبیرکراو لەسەر لایەنی حەیوانیی مرۆڤ جەختی دەکردەوە. بۆیە لە هەردوو نموونەکەدا بایەخەکان زیاتر لە ڕاستییەکان بینراوە. وا دیارە هەموو ئەو بیرکردنەوانە بە دوای یەک زنجیرە بیرکردنەوەدا سەبارەت بە ڕستەی "تێگەیشتن و لێبوردەیی"، واتە مەسەلەیەک بۆ باسلێوەکردن هاتبووە ئارا. ڕەنگە گونجاو بێت بڵێم ئەگەر توانیم ڕستەی مەبەست بە خێرایی بدۆزمەوە بێگومان ئەو کارە قەرزداری گۆشەنشینی و دوورەپەرێزی لە کۆمەڵگە بووم کە ڕستەکەم لەوێدا بە شێوەیەک سانسۆر کرابوو. لەوە بەدوا من چەند نموونەیەکی ترم لە بارەی لەبیرچوونەوە، یان وتنی هەڵەی کۆمەڵێک وشەوەم شی کردەوە و تێگەیشتم بەو شێوەیەی لە نموونەکانی aliquis و دەستگیرانەکەی کۆرێنت بەدەستمان هێنا، میکانیزمی لەبیرچوونەوە لە هەموو بوارەکاندا یەکسانە. ئەو جۆرە شیکردنەوە و وردەکاریانە ناکرێ بەو ئاسانییە بخرێتە بەر دەستی مامم، چونکە بەو شێوەیەی لە

نموونەکانی پێشودا بینیم زۆر جار ناچارم ئاماژە بدەمە مەسەلەی تایبەت و ئازاراوی تاکەکەس، کە تاقیکردنەوەی لەسەر کراوە. بۆیە من لە هەڵسەنگاندنی نموونەی جۆراوجۆردا دووری دەگرم.

سەرەرای جیاوازی لە بواری ناوەڕۆکەوە ئەو شتەی لە هەموو بوارەکاندا هاوبەشە، جۆرێک پەیوەندییە، بەهۆی وەبیرهێنانەوەوە لە نێوان وشەی لەبیرچوو یان ئاڵوگۆڕدا بەسەردا هاتوو و ئەندێشەی نەستە و کاردانەوەی بەرجەستەی ئەو بیرکردنەوەیەیە ڕێک بە شێوەی لەبیرچوونەوەیەک خۆی دەنوێنێت. لەمڕووەوە مەسەلەی لەبیرچوونەوەی ناوی تایبەت دەبێ دیسانەوە بخرێتە ڕوو، چونکە بنەما و هاندەرەکانیمان هێشتا بە تەواوی نەناسیوە. من جارناجار ئاگاداری ئەو جۆرە هەڵە ڕەفتارییانەی خۆم هەم، کەواتە دەتوانم نموونەی زۆر لەو بارەوە بخەمە ڕوو. ئەو ژانەسەرە لاوازانەی کە هێشتا بە دەستیانەوە دەناڵێنم چەند کاتژمێر پێش دەرکەوتن لەگەڵ لەبیرکردنی ناوە تایبەتەکاندا خۆی دەنوێنێت. لە قەیرانی ئازاردا هەرچەند دەتوانم درێژە بە کارەکەم بدەم، بەڵام زۆر جار هەموو ناوە تایبەتەکان لەبیر دەکەم. هەروەها ڕێک دەکرێ بوارە هاوشێوەکانم بکرێنە پاڵپشت و بە گشتی دەکرێ نارەزایی دەرببڕدرێت بەرامبەر بە هەموو هەوڵدانێک لە ئاراستەی هۆکاری لەبیرچوونەوە، ئایا ناکرێ لەو جۆرە تاقیکردنەوانە ئەنجام وەربگیردرێت کە هۆکاری ئاراستە بۆ لەبیرچوونەوە و بە تایبەتی لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتییەکان دەبێ لەناو سووڕی خوێن و تێکچوونی کارکردنی گشتی لە مێشکدا بە دوایدا بگەڕێیت و وای بە باش دابنێی لە هەوڵدان بۆ شرۆڤەی دەروونی دیاردە ناوبراوەکان دوورەپەرێزی بگریت؟ بە ڕای من وا نییە. لەو جۆرە دەرئەنجام وەرگرتنەدا لە ڕاستیدا میکانیزمی کارێکی ئەنجامدراو کە لە هەموو بوارەکاندا یەکسانە لەگەڵ بارودۆخێکدا کە ناچار نین، بەڵکوو دەتوانن

هاندەرێک بن بۆ دەرکەوتنی ئەو میکانیزمە و بە یەکسانی دایدەنێن.
من لەبری وتوویژ لەو بوارەدا ئێستا هەوڵم داوە تا لەگەڵ پێوانەکردنێکدا بەتاڵبوونی ئەو نارەزایەتییە دەربخەم.

وا بیر بکەنەوە من بەبێ هیچ دوورەپەرێزییەک لە نیوەی شەودا برۆم بۆ یەکێک لە گەڕەکە چۆڵەکانی ناو شار، ئینجا وێڵ و بەرەڵڵا پەلامارم بدەن و جزدانی پارەکەم بدزن. ئەوسا برۆم بۆ نزیکترین بنکەی پۆلیس و شکاتێک بەم شێوەیە بنووسم: "کاتێک لە فلان شەقامدا بووم، لە تەنیایی و تاریکیدا پارەکەمیان دزی". هەرچەند بە وتنی ئەو ڕستانە من هیچ بابەتێکی ڕێکوپێکم نەوتووە، بەڵام ڕەنگە خەڵک بە کەسێکی شێت یان کەسێکی نامەنتقی ناوم بەرن. بۆیە بۆ وەسفکردنی ڕێکی ئەو بارودۆخە دەبێ بڵێم: "وێڵ و بەرەڵای نەناسراو لە تاریکی و چۆڵبوونی شەقامدا هەڵیان قۆستووەتەوە و شتومەکەکانیان بردووم." لە ڕاستیدا لە کاتی لەبیرچوونەوەدا بارودۆخ ڕێک بە هەمان شێوەیە: وزەیەکی نەناسراو لە بارودۆخی هیلاکی و تێکچوونی سووڕی خوێن و ژەهراویبوونی بیری من یارمەتی وەردەگرێت و هێزی بەدەستهێنانی ناوە تایبەتەکانی تر کە لە زەیندا هەیە بەتاڵی دەکاتەوە و هەر ئەو وزەیەش لە بوارەکانی تردا دەتوانێ ببێتە هۆی تێکچوونی زەین. واتە کاتێک تاک تەندروستیی تەواوی هەیە و ئەندامی جەستەی کارکردنێکی سروشتییان هەیە.

کاتێک بوارەکانی لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکان کە بۆ خۆم ڕووی داوە شی دەکەمەوە بەو دەرئەنجامە دەگەم کە ناوی لەبیرکراو لە بارەی ئەو مەسەلەیەوەیە کە کارم تێدەکات و دەتوانێ هەستە توندەکان و زۆر جار خەفەتاوییەکان لە ناخمدا دروست بکات. لەو ڕووەوە لە ڕێکەوتن لەگەڵ شێوەی سادە و بە ڕاستی شیاوی دڵنیابوون کە قوتابخانەی سویسرا کردویەتیە باو (بلۆلێر، یۆنگ، ڕیک

لین)، دەتوانم قسەکانی لای خوارەوە بەو شێوەیە کورت بکەمەوە.

ناوی لەبیرکراو لە بوونمدا "گرێیەکی شەخسی" لەگەڵدایە، ئەو پەیوەندییەی لە نێوان ئەو ناوە و کەسیی مندا دروست بووە پەیوەندییەکی چاوەڕواننەکراوە و زۆر جار وەبیرهێنانەوەیەکی سادەی (وەک دوو جۆربوونی واتای وشەیەک یان یەکسانبوونی دەنگەکان)، ئەو پەیوەندییە دابین دەکات. بە گشتی دەکرێ ئەو پەیوەندییە بە پەیوەندییەکی لاوەکی بزانرێت. بۆ باشتر ناساندنی چۆنیەتی ئەو پەیوەندییە چەند نموونەی سادە دەهێنمەوە.

١- یەکێک لە نەخۆشەکان داوای لێ کردم تا ناونیشانی شوێنی ئاوی گەرمی کانزایی لە ناوچەی ڕیڤییێرای پێ نیشان بدەم. من دەمزانی لە نزیک شاری جێندا شوێنێکی وەها هەیە و تەنانەت هاوکارێکی ئەڵمانیاییم دەناسی، لەوێ کاری پزیشکی دەکرد، بەڵام هەرچەند هەوڵم دا ناوی ئەو شوێنە کە وامدەزانی بە باشی دەیزانم بیڵێم. تەنیا ڕێگاچارە ئەوە بوو داوا لە نەخۆشەکە بکەم چەند خولەکێک چاوەڕێ بکات تا من لەو بارەوە لە یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەم بپرسم. کاتێک ناوی گەرمەکەم دەپرسی، وتم:

٢- ناوی ئەو گەرمەکەی لە نزیکی شاری جێندایە و ناوی ئەو بنکە تەندروستییەی دکتۆر ن. دروستی کردووە، چییە؟ هەر ئەو بنکە تەندروستییەی کە تۆ و فلان خانم بۆ ماوەیەک لەوێ چارەسەر کران.

بەرامبەرەکەم وەڵامی دایەوە:

سەیرە تۆ ئەو ناوەت لەبیر کردووە! ناوی ئەو شوێنە نرڤی Nervi یە".

هۆی لەبیرچوونەوەکەم ئەوە بوو کە وشەی Nervi شێوازی

وتنەکەی وەک شێوازی وتنی Nerven عەسەبە. ئنجا عەسەبیش بابەتی سەرقاڵی بیر و پیشەی منە.

١- یەکێک لە نەخۆشەکانم لە بارەی هاوینەهەوارەکانی نزیکی شار لەگەڵمدا قسەی دەکرد و دەیوت، کە لە یەکێک لە هاوینەهەوارەکاندا دوو میوانخـــانەی بەناوبانــگ و میوانخـــانەیەکی تریشـــی لێـیە کە بیرەوەرییەکی خۆشی لەوێدا هەیە و تا چرکەیەکی تر ناوی ئەوێی پێ دەڵێت. من دەموت میوانخانەیەکی تر لەو هاوینەهەوارەدا نییە و بۆ سەلماندنی قسەکانم وتم حەوت ساڵە بە بەردەوامی هاوینان لەوێ کـاتم بەســەر بــردووە، بۆیە ئەو شــوێنە باشــتر لە بەرامبەرەکەم دەناسم. نەخۆشەکەم لەو نارەزایەتییە ورووژایەوە و لە ئاکامدا ناوی ئەو میوانخانەیەی بەبیر هێنایەوە. میوانخانەکە ناوی دێر هۆشوارتنێر Der Hochwartner بوو. ناچار بووم قسەکەی قبووڵ بکەم و دانـــی پێـــدابنێم، کە حەوت هـــاوین بە دوای یەکـــدا لە نزیـــک ئەو میوانخانەیەدا -کە تا چەند چرکە لەوەو پێش حاشام لە بوونی ئەوێ دەکـرد- نیشـتەجێ بـووم، بەڵام بـۆچی نـاوی ئەو شـوێنەم لە بیـر کردبوو؟ پێم وایە ناوی میوانخانەکە زۆر هاوشێوەی ناوی یەکێک لە هاوکارە پسپۆڕەکانم بوو، کە لە شاری ڤیەننا ژیانی بەسەر دەبرد و هۆکاری لەبیرچوونەوەیش "گرێیەکی پیشەیی" بوو.

٢- جارێکیان کە دەمویست لە وێستگەی شەمەندەفەری ڕایشێن هۆڵا Reichenhallدا بلیت بکرم، نەمتوانی ناوی ئەو وێستگە گەورەیە کە زۆر جار لەوێوە تێپەڕیبووم بە بیر خۆمی بهێنمەوە و ناچار بووم بە وردی لەسەر نەخشەکە بەدوایدا بگەڕێم. ئەو وێستگەیە ناوی ڕۆزێن هـایم Rosenheim بـوو، منـیش خێـرا تێگەیشـتم چ جـۆرە وەبیرهێنـانەوەیەک بـووەتە هـۆی لەبیرچـوونەوەی ئەوە. کاتژمێرێـک پـێش ئەو ڕووداوە مـن بـۆ بینینـی خۆشـکەکەم ڕۆیشـتبووم بـۆ

هاوینەهەوارێـک لە نزیکـی رایشـێن هـۆلا. خۆشـکەکەم نـاوی ڕۆزە Rose، بۆیە ئەو هاوینەهەوارەی ئەو تیایدا دەژیا لە زەینمدا نـاوی ڕۆزێـن هـایم بـوو (واتە ئەو شـوێنەی کە خۆشـکەکەم لەوێ نیشـتەجێ بـوو). لەو بـوارەوە "گرێیەکـی خێزانـی" ببـووە هـۆی لەبیرچوونەوەی ناوی وێستگەکە.

٣- من دەتوانم کاریگەریی ئەو "گرێ خێزانییە" وێرانکەرە لە هەندێ نموونەی جۆراوجۆردا بسەلمێنم.

ڕۆژێکیان پیاوێکی گەنج هات بۆ عیادەکەم. ئەو برای بچووکی یەکێک لە نەخۆشەکانم بوو. چەندین جار ئەوم بینی بوو و خووم بەوەوە گرتبوو بە ناوی بچووک (نەک ناوی بنەماڵەیی) بانگی لێ بکەم. دوای ماوەیەک کاتێک ویستم بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵیدا قسە بکەم، نەمتوانی ناوی بە بیر بهێنمەوە و هەرچەند پەنام بۆ مێشکم برد نەمتوانی ئەو نـاوەی کە بە باشـی دەمزانـی زۆر قـورس یـان دژوار نییە بە بیـری بهێنمەوە. پاشان لە ماڵ چوومە دەرەوە و لەناو شەقامدا دەستم کرد بە خوێنـدنەوەی تـابلۆی ڕاگەیانـدن، یەکەمـین جارێـک کە چـاوم بە نـاوەکەی کەوت بەبێ هـیچ گومانێک ناسیمەوە. ئەو شـیکردنەوەیەی لەو بارەیـەوە کـردم پیشـانی دا، کە لە نێـوان ئەو پیـاوە گەنـجە و براکەمـدا پێـوانەیەکم کردبـوو و مەسـەلەیەکی سـەرکوتکراو لەو پێوانەکردنەدا بەشدار بوو. ئایا بـراکەم لە بـارودۆخێکی هاوشێوەدا ڕەفتارێک وەک ڕەفتـاری ئەو پیاوە گەنجەی دەکـرد یـان باشـتر لەو ڕەفتاری دەکرد؟ وەبیرهێنانەوەی دەرەکی پەیوەند بوو لە نێوان ئەو ئەندێشـەیەی بنەمـاڵەی خـۆم و ئەو ئەندێشـەیەی کە لە بـارەی بنەماڵەیەکی ترەوە بوو، بە هۆیەوە کە بە تەواوی بە ڕێکەوت ئەنجام درا بـوو، کە دایکـی ئەو گەنـجە و دایکـی مـن هاونـاو بـوون و هەردووکیان ناویـان ئامالیا Amalia بوو. واتای ئەو نـاوە جێگیرانە

که لەو کـاتەدا بە زەینمـدا هـاتبوو، بەڵام زانیـاری لە بەردەسـتمدا دانەنابوو پاش ماوەیەک درکم پێ کردبوو. ئەو ناوانە "دانیل" و "فرانز" بوون. ئەو دوو ناوە کۆتاییە و هەروەها ئامالیا ناوی کەسایەتییەکانی نمایشنامەی چەتەکان بەرهەمی "شلێر"ـە و دانیل ئەسپیتزێر وردبینی شاری ڤیەننا گاڵتەیەکی گشتی بۆ ئەو سێ کەسایەتییە کردبووە باو.

٤- جارێکیان نەمتوانی ناوی یەکێک لە نەخۆشەکانم بەبیر بهێنمەوە. ئەو یەکێک بوو لە ناسراوەکانی دەورانی گەنجێتیم. شیکردنەوەی ئەو بوارە منی لە هەندێ ڕێگای دژوار و سەختەوە برد و لە ئاکامدا ناوی ئەو بـۆ ڕوون کـردمەوە. پیـاوە نەخۆشـەکە وای دەرخسـتبوو لە نابینـابوون دەترسـێت. ئەو وتەیە بیـرەوەری پیـاوێکی گەنجـی بەبیـر هێنـامەوە کە پـاش بریـنداربوون بە چەکێکـی گەرم بینـایی خـۆی لەدەسـت داوە. ئەو بیـرەوەرییە بەشـبەحاڵی خـۆی وێنەی گەنجێکـی تری بە ویژدانی نەستم هێنایەوە، کە بە هاویشتنی فیشـەکێک کۆتـایی بە ژیانی خۆی هێنابوو. هەرچەند ئەو دوو گەنجە خزمایەتیان پێکەوە نەبوو، بەڵام هاوناو بوون. من ناوی یەکەم نەخۆشم کاتێک دۆزییەوە کە تێگەیشتم کارەساتی ناخۆش  بۆ ئەو دوو گەنجە ڕووی دابوو، بە هەست گرێم دابـوو بە کارەسـاتێکی هاوشـێوەی ئەوەوە. لەو کـاتەدا دەترسـام کارەسـاتێکی وەهـا بۆ یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەم ڕوو بدات.

لەو ڕووەوە زەیـنم  گورەپـانی لافـاوی ئـاڵوگۆڕنەکراوی "پەیوەنـدی شەخسـی"یە کە خـۆم لێـی ئاگـادار نـیم، بـەڵکوو ئەو لافـاوە بە لەبیرکردنـی ناوەکـان ئامـادەبوونی خـۆی ئاشـکرا دەکـات. گـوایە دیاردەیەک من هان دەدات ئەو شتانەی لە بارەی خەڵکەوە دەیبیستم، یـان بـۆم دەیگێـڕنەوە بەو کەسـە پەیوەنـدی بـدەم، گـوایە هەمـوو زانیـارییەک لە بـارەی خەڵـکەوە گرێیە شەخسـییەکانمی دەبزوانـد. بە

دڵنیاییەوە ئەو بەرچدانەوەیە تایبەتمەندییەکی تایبەت نییە، بەڵکوو بە بڕوای من ڕەنگە پیشان بدات کە ئێمە چۆن "کەسێکی تر" واتە لە کارەساتە دەرەکییەکانی چوارچێوەی شەخسی تێدەگەین. هەروەها بە هەندێ هۆکار لەو بڕوایەدام کەسانێکی تر هەر بەو شێوەیە "بەرپەرچدانەوە" پیشان دەدەن.

باشترین نموونەیەک لەو بارەوە دەتوانین بڵێین کارەساتێکە، کە پیاوێک بە ناوی "لی دیریر"ەوە بۆمی گێڕاوەتەوە. ئەو پیاوە لە ماوەی گەشتی مانگی هەنگوینیدا دیداری لەگەڵ پیاوێکدا کرد کە تاڕادەیەک ئەوی دەناسی، ئەوسا دەبوا ئەوی بە هاوسەرەکەی بناساندایە، بەڵام چونکە ناوی ئەو کەسەی بەبیر نەدەهێنایەوە، جاری یەکەم بە چپەکردنی هەندێ وشەی نادیار کۆتایی بە مەسەلەکە هێنا.

پاشان بۆ جاری دووەم ئەو پیاوەی بینی، (چونکە لە شاری ڤنیزدا چاوپێکەوتن لەگەڵ گەشتیارەکانی تردا دووری هەڵنەگر بوو)، ئەوی بردە لایەکەوە، کێشەکەی خۆی بۆ باس کرد و تکای لێ کرد ناوی خۆی پێ بڵێت. وەڵامی پیاوی بێگانە پیشانی دەدا کە دەروونناسێکی وردبین بووە، چونکە وەڵامێکی دابووەوە:

٥- تێدەگەم بۆچی ناوی منت لەبیر کردووە. ناوم لی دیریرە، ڕێک وەک تۆ.

کاتێک لەگەڵ نەناسراوێکدا چاوپێکەوتن دەکەین کە ڕێک هاوناوی خۆمانە، خۆنەویست هەستێکی ناخۆشمان پێ دەدات. منیش لەم دواییانەدا تووشی وەها هەستێک بوومەتەوە، چونکە ڕۆژێکیان پیاوێک کە ناوی س. فرۆید بوو، بۆ ڕاوێژکردن هات بۆ لام.

سەرباری هەموو ئەو شرۆڤەکردنانە دەبێ ئەوەش بڵێم کە کەسێک ڕەخنەی لە وەها بیروبۆچوونی من گرتووە و جەختی لەسەر ئەوە

کردووەتەوە، کە لە وەها کاتێکدا پەرچدانەوەیەکی ڕێک بە پێچەوانەی منی هەیە، ئەوسا بە پێویستی دەزانم ئەو خاڵە لەوێدا باس بکەم.

٦- کاریگەریی "پەیوەندیی شەخسی" لە نموونەی لای خوارەوە کە لە ڕێگای کاک یۆنگەوە گێڕراوەتەوە، دەکرێ بدۆزرێتەوە:

"کاک Y خۆشەویستییەکی یەکلایەنەی بۆ خاتوونێک هەبوو. ئەو خاتوونە پاش ماوەیەک لەگەڵ کاک X دا هاوسەرگیری کرد. کاک Yهەرچەند دەمێک بوو کە کاک Xـی دەناسی و تەنانەت پەیوەندی پیشەیی لەگەڵیدا هەبوو، بەڵام بە بەردەوامی ناوی لەبیر دەکرد بە شێوەیەک کاتێک دەیویست نامەیەک بۆ کاک X بنووسێت ناوی ئەوی لە کەسانی تر دەپرسی. "هەڵبەت لەو نموونەیەدا هاندانی لەبیرچوونەوەی ناوی تایبەت لەو هۆکارانەی کە تا ئێستا باسمان لێیەوە کرد و لە یاسای "پەیوەندیی شەخسی"دا پەیڕەوی دەکرد ئاشکراتر بوو. لێرەدا وا دیارە لەبیرچوونەوە دەرئەنجامی ڕاستەوخۆی هەستی ڕق و کینی کاک Y بەرامبەر بە ڕکابەرە بەختەوەرەکەی خۆی کاک X بوو. کاک Y نەیدەویست بچووکترین شت لە بارەی Xـەوە بزانێت و خەڵک وتەنی: "تەنانەت پێی ناخۆش بوو ناوەکەیشی ببیستێت."

٧- هاندانی لەبیرچوونەوەی ناوێکی تایبەت دەتوانێت تایبەتمەندییەکی ناسکتری هەبوو بێت و لە توندوتیژیی "خاوێن کراو" بەرامبەر بە خاوەنی ئەو ناوە سەرچاوە بگرێت. خاتوو ژ. دۆ. کا لە بۆداپێست لەو بارەیەوە دەنووسێت: "من بیرۆکەیەکی کورتم بۆ خۆم هەیە: تێگەیشتووم ئەو کەسانەی توانای نیگارکێشییان هەیە بە تایبەتی هیچ لە مۆسیقا تێناگەن و بە پێچەوانەشەوە. ماوەیەک لەوەوبەر لەو بارەوە لەگەڵ کەسێکدا قسەم دەکرد، پێم وت: توێژینەوەکانم جەختی لەسەر ئەو تیۆرییە کردووەتەوە و تەنیا یەک نموونەی تایبەتم بینیوە،

بەلام کاتێک ویستم ناوی تەنیا کەسێک کە تایبەت بە بیرۆکەکەی من بوو بهێنمە سەر زار، نەمتوانی ئەوە بڵێم، هەرچەند بە باشی دەمزانی ئەو کەسە لە نزیکترین کەسەکانمە. پاش چەند ڕۆژ کاتێک بە ڕێکەوت ناویم بیست خێرا تێگەیشتم ئەوە ناوی ئەو کەسەیە کە لەگەڵ بیرۆکەکەمدا یەک ناگرێتەوە. من بەبێ ئەوەی ئاگادار بم بەرامبەر بەو کەسە تووڕە بووم و ئەو هەستەیش بە شێوەی لەبیرکردنی ناوی ئەو کە بە باشیش دەمناسییەوە خۆی نواندبوو".

٨- لە نموونەی لای خوارەوەدا، کە لە لایەن کاک فرنزییەوە گێڕراوەتەوە و شیکردنەوەشی بەتایبەتی لە بواری شرۆڤەی ناوە جێگرەکان (وەک Boltraffio و Botticelli لە بری Signorelli ) ئەزموونبەخشە، "پەیوەندی شەخسی" لە هەندێ ڕێگاوە کە کەمێ جیاوازییان هەیە، بووەتە هۆی لەبیرچوونەوە.

"ئەو خاتوونەی لە بارەی دەروونشیکارییەوە هەندێ شتی بیستبوو، نەیتوانی ناوی یۆنگ دەروونناسیی بەناوبانگ بە بیر بهێنێتەوە و لە بری ئەو ناوانە: کێل Kl ناوێکە، وایلد و نیچە و هاپتمانی بەبیر هاتەوە. لە بارەی کێلەوە ئەو خێرا کەوتە یادی خاتوو کێل کە ژنێکی زۆر نازکەر و بەفیز بوو و بە بەردەوامی زێڕ و زیوی بە خۆیدا هەڵدەواسی و لە تەمەنی خۆی گەنجتر دەهاتە پێش چاو، واتە ژنێک بوو کە پیر نەدەبوو. ئەو لە بارەی خاڵی هاوبەشی نێوان وایلد و نیچەوە وەک واتایەکی سەرووتر "نەخۆشیی دەروونی" خستە ڕوو، پاشان بە دوای هۆکاری نەخۆشی دەروونیدا دەگەڕا تا دەرئەنجام خۆتان لە بواری دەروونییەوە نەخۆش بکەون" و پاشان وتی: "من حەزم لە نیچە و وایلد نییە، لە بیروڕایان تێناگەم. لە هەندێ کەس بیستوومە ئەو دوو کەسە هۆمۆسێکسواڵی بوون. وایلد حەزی لە کوڕە گەنجەکان کردووە." ئەو خاتوونە هەرچەند لە کاتی وتنی

دوایین ڕستەدا –هەڵبەت بە زمانی مەجارستانی– ناوی دروستی دەروونشیکارە مەبەستەکەی هێنا بووە سەر زار، بەڵام دیسانەوە نەیدەتوانی ئەو ناوە بە بیر بهێنێتەوە. ئەو لە بارەی ناوی هایتمانەوە کەوتە یادی هاڵب و پاشان بیری لە یەکێک لەبەرهەمەکانی کردووە بە ناوی "گەنجێتی" و تەنیا کاتێک من سەرنجیم ڕاکێشا بۆ لای وشەی "گەنجێتی" تێگەیشت کە بە دوای ناوی یۆنگدا گەڕاوە.

جیا لەوەیش ئەو خاتوونە لە تەمەنی ٣٩ساڵیدا هاوسەرەکەی لەدەست دابوو و لەوەبەدوا هیچ ئومێدیکی تری بە هاوسەرگیری نەبوو. بۆیە بە پێی چەند هۆکارێک وای بە باش دەزانی بیر لە مەسەلەی تەمەن نەکاتەوە.

ئەو شتەی لەم مەسەلەیەدا سەرنجڕاکێشە وەبیرهێنانەوەی تەواو ناوەکی (وەبیرهێنانەوەی ناوەڕۆک)ـە لە نێوان ناوی جێگر و ناوی لەبیرکراودا، بەڵام ئێستاکە هیچ هاوشێوەییەکی زارەکی لە نێوان ناوەکاندا نابینرێت.

٩- ئێستا نموونەیەکی تر بۆ لەبیرکردنی ناوەکان دەهێنمەوە، کە مەبەستێکی جوانی هەبوو و کەسی مەبەست خۆی توانی ئەو مەبەستە ئاشکرا بکات.

"لە ئەزموونی وانەی فەلسەفەدا، تاقیکەرەوەکە پرسیاری لێکردم لە بارەی قوتابخانەی ئەپیکۆرەوە و ویستی تا ناوی هەموو ئەو فەسلەسووفانە بەرم، کە لە سەدەکانی ڕابردوودا لە بارەی ئەو قوتابخانەیەوەی کۆڵیوەتەوە. من ناوی پیرگاساندیم هێنا، چونکە دوو ڕۆژ لەوەوبەر ناوی ئەوم وەک یەکێک لە لایەنگرانی ئەپیکۆر لە چایخانەیەکدا بیستبوو. کاتێک ممتحن بە سەرسووڕمانەوە لێی پرسیم چۆن ئەو ناوە دەناسم؟ بەبێ هیچ شک و گومانێک وەڵامم دایەوە "ماوەیەکی زۆرە خولیای بیروبۆچوونی ئەو فەیلەسووفەم". ئەو

وەلامە بووە هۆی ئەوەی کە لە تاقیکرنەوەکەدا بە نمرەی زۆر باش (دەرچاندن بە ئافەرین وتنی تاقیکەرەوەکان)، دەرچووم، بەلام بەداخەوە ئاراستەیەکی زۆرم بۆ لەبیرکردنی ناوی گاساندی هەبوو. بە بڕوای خۆم ئەگەر تا ئێستا سەرباری هەموو هەوڵدانەکانم ناتوانم ئەو ناوەی ئەو بە زەینم بسپێرم بەهۆی نیگەرانی ویژدانمەوەیە. خۆزگە لە ڕۆژی تاقیکردنەوەدا ناوی ئەو فەیلەسووفەم نەزانیبا".

بۆ تێگەیشتن لە زۆربوونی نیگەرانی ئەو کەسە بەهۆی بیرەوەریی تاقیکردنەوەی دەورانی خوێندن با بڵێم ئەو بۆ ناوبانگی دکتۆرای خۆی بایەخێکی زۆری دادەنا بە ڕادەیەک کە بیرەوەریی هەمان پرسیار دەیتوانی لە بایەخی ئەو ناوبانگە لە بیروڕای ئەو کەم بکاتەوە.

١٠- ئێستا نموونەیەکی تر بۆ لە بیرکردنی ناوی شارێک دەهێنمەوە. ئەو نموونەیە هەرچەند لە نموونەکانی پێشوتر ئاڵۆزتر دیارە، بەلام بە ڕای هەموو ئەو کەسانەی پەیوەندییان لەگەڵ ئەو جۆرە توێژینەوانەدا هەیە بە تەواوی پەسەندە و ئەزموونبەخشە. زۆر جار خەڵک ناوی شارێک، کە زۆر هاوشێوەی ناوی کچێکە لە بواری زارەکی، یان فۆنێتیکی لە بیر دەکەن. ئەو ناوە بیرەوەری سۆزداری جۆراوجۆر دەجووڵێنێت، کە ڕاپۆرت هەڵسەنگاندنێکی تەواوی لەوانە نەخستوتە ڕوو. کاک فرنزی کە ئەو بوارەی لە کەسی خۆیدا شرۆڤە کردووە ئەو مەسەلەیە وەک خەونێک یان بیرکردنەوەیەک کە سەرچاوەکەی لە ئازاری دەروونەوەیە شی کردووەتەوە و لەو بوارەدا تووشی هیچ هەڵەیەک نەبووە. ئەو دەنووسێت:

"ئەمڕۆ لە ماڵی یەکێک لە هاوڕێیانمدا میوان بووم، ئێمە باسمان لە زۆر شتی جۆراوجۆر و هەروەها باسمان لەسەر شارەکانی ئیتالیای باکوور کرد. یەکێک لە ئامادەبوان وتی هێشتا لەو شارانەدا ئاسەوار

و کاریگەری کولتووری وڵاتی نەمسا دەبینرێت. ئامادەبوان ناوی چەند شاریان هێنا، منیش دەمویست ناوی یەکێک لەو شارانە بهێنمە سەر زار، بەڵام هەرچەند دەمزانی دوو ڕۆژ بە خۆشی لەوێ تێپەڕم کردووە، بەڵام ناوەکەم بە بیر نەهاتەوە. ئەو کارە لەگەڵ ئەو چوارچێوەیەی کە فرۆید بۆ بوارەکانی لەبیرچوونەوە دایناوە پێوانە ناکرێت. لە بری ئەو ناوەی بە دوایدا دەگەڕام ئەم ناوانەم بە بیر دەهاتەوە: کاپواCapua ، برسیاBrescia ، شیربرسیا Le lion de Brescia بە زەینمدا هات. من گوایە ئەو شێرەم وەک پەیکەرەیەکی مەرمەڕی دەهاتە پێش چاوم. بەڵام خێرا زانیم ئەو پەیکەرەیە زۆر هاوشێوەی پەیکەری ئازادی برسیا نییە (کە من تەنیا وێنەکەیم بینی بوو)، بەڵکوو هاوشێوەی پەیکەرێکی شێری مەرمەڕییە کە لە لۆسرون Lucerne لە سەر گۆڕی سەربازانی سویسرا کە لە تویلێریسدا Tuileries خەڵتانی خوێن بوون، بینیومە و وێنەکەیم وەک میناتۆر لە کتێبخانەکەمدا داناوە. لە ئاکامدا ئەو ناوەی بە دوایدا دەگەڕام دۆزیمەوە. ئەو ناوە ڤێرۆن Verone بوو. بێگومانم تێگەیشتم هۆکاری ئەو بۆشاییە چ کەسێک بووە. تاوانبارەکە یەکێک بوو لە خزمەتکارە پێشووەکانی ماڵەوەمان کە ئەو ڕۆژە من میوانی بووم. ئەو ناوی ڤرنیک یان بە زمانی مەجارستانی ناوی Verone بوو. من بەهۆی ڕووخساری ناشیرین و دەنگی زل و بەرزی و ئەو ڕەفتارەی کە وا دەینواند خۆمانەیە، بەڵام تەحەمول نەدەکرا ڕقم لەو ژنە هەڵگرتبوو. ئەو چەندین ساڵ دوا بەدوای یەک لە ماڵی ئێمەدا خزمەتی کردبوو و خۆی بە حەق دەزانی ڕەفتارێکی خۆمانەی هەبێت. لە دەورانی خزمەتەکەیدا ڕەفتاری زاڵمانەی لەگەڵ منداڵەکانی خێزانەکەماندا دەبووە هۆی تووڕەیی و ڕقی من. لەو ڕووەوە تێگەیشتم ناوە جێگرەکان چ واتایەکیان هەبووە. بۆ ناوی کاپوا من خێرا وەبیرهێنانەوە لەگەڵ وشەی Coput mortuum م دۆزیەوە.

راستییەکەی ئەوە بوو من زۆر جار سەری ڤرنیکم بە سەری پەیکەرێک دەشوبهاند و بە دڵنیاییەوە وشەی مەجارستان Kapezi بەخیلیبردن بە ماڵ و منداڵ لەو جێگۆڕکێیەدا ڕۆڵێکی هەبوو. من بە شێوەی سروشتی چەند ڕێگایەکی ڕاستەوخۆم بۆ وەبیرهێنانەوە لە نێوان ناوی ڤرنیک و کاپوادا دۆزییەوە. هەر دووی ئەو ناوە ئیتاڵییانە هاوکێش و هاوفۆنەتیک و دیاریکەری شوێنی جوگرافیایین. ئەو شرۆڤەیە لە بارەی برسیاشەوە پشتڕاست دەکاتەوە، بەڵام وەبیرهێنانەوەی واتاکان لێرەدا لە ڕێگای لاوەکی و ئاڵۆزەوە پێک هاتبوو.

ڕقی من لە ڤرنیک لە سەردەمێکدا ئەوە بوو، کە بە ڕاستی بەلامەوە ناشیرین و پەست دەهاتەر بەر چاوم و هەندێک جار پرسیارم لە خۆم دەکرد کەسێکی وەها نەفریناوی چۆن دەتوانی پەیوەندییەکی نزیکی هەبووبێت یان خۆشەویستی و میهرەبانی بۆ دەربڕێت. دەموت تەنانەت بیرکردنەوە لەوەی ماچی بکەیت هێڵنجهێنەر بوو. سەرباری ئەو وەسفکردنە بە دڵنیاییەوە پەیوەندییەک لە نێوان ڤرنیک و ئەو سەربازانەی لە خوێندا خەڵتان بوون هەبوو. ناوی برسیا Brescia لانی کەم زۆر جار لە مەجارستاندا لەگەڵ ناوی حەیوانێکی وەحشی تردا جیا لە شێر وەبیر دێتەوە. ناوێک کە لە ئیتاڵیای باکووری و هەروەها لە مەجارستاندا زیاتر لە هەر ناوێکی تر بێزی لێ دەکەنەوە، ناوی جەنەڕاڵ هین(Haynau)ە و پێی دەوترێت کەمتیار برسیا.

بۆیە ڕووداوێکی فیکری لە جەنەڕاڵ هینۆ، ئەو پیاوە بێزەونە سەرچاوەی گرتووە و لە ڕێگای برسیاوە گەیشتووەتە ڤرنیک. لە حاڵێکدا ڕووداوێکی فیکریی تر لە ڕێگای حەیوانێکی دەنگ بەرز کە مردووەکان لە خاک دێنێتە دەرەوە (کەمتیار) –ئەو بیرکردنەوەیەی کە وێنای پەیکەری تایبەتی تەرمەکانی بەدواوە بوو– بووە

هاوشێوەی تەرم و بە دەنگی ناحەزی ڤرنیک کۆتایی پێ هاتبوو. ویژدانی نەستم زۆر ڕقی لە ڤرنیک بوو، چونکە ئەو ژنە بۆ ماوەیەک لە ماڵی ئێمەدا زوڵمێکی وەهای کردبوو کە هاوشێوەی زوڵم و ستەمی جەنەڕاڵی نەمسایی پاش شەڕە ئازادیخوازەکانی مەجارستان و ئیتالیا بوو. بیروڕام لە بارەی شاری لۆسرون دەگەڕایەوە بۆ هاوینێک کە ڤرنیک لە بارەی ئەربابەکانی خۆی لە پاڵ دەریاچەی کاترکانتۆن Guatre Cantonsـەوە لە نزیکی شاری لۆسروندا بەسەر دەبرد. بیرەوەری ئەو زوڵم و ستەمەی کە ئەو وەک سەرپەرەشتی خێزان دەژمێردرا و ئەو ئەرکەی داگیر کردبوو نەک هەر لەسەر منداڵان، بەڵکوو لەسەر گەورەکانی خێزان کاریگەری دادەنا، ناوی ئەو ژنەی لە ئەندێشەی مندا بە سەربازانی سویسرایی پەیوەند دەدا.

دەبێ ئەوەیش بڵێم کە لە ویژدانی هەستمدا ڕقم لە ڤرنیک پەیوەند بوو بەو کێشانەی کە زۆر دەمێکە بەلاوە نرابوو. هەر لەو سەردەمانەوە تا ئێستا ڤرنیک بە ڕواڵەت و جووڵە و ڕەفتار زۆر گۆڕابوو و ئەو گۆڕینە لە ئاراستەی پۆزەتیڤدا بوو. لە زۆر کاتی دەگمەندا کە ئەو دەبینم بە گەرمی بەرەوپیری دەچم، بەڵام چونکە ویژدانی نەست بە ئینکاری و پێداگری هەست و ڕوانگەکانی ڕابردووی پاراستووە، لەو ڕووەوە ڕقلەدڵ و دووڕەپەرێزە.

بیرکردنەوە لە بارەی تۆیلێری، ئاماژە بوو بۆ کەسێکی تر. ئەو کەسە خاتوونێکی بەتەمەنی فەرەنسی بوو کە لە بارودۆخی جۆراوجۆردا "سەرپەرەشتی" ڕاستەقینەی خاتوونەکانی ناو خێزان بوو و هەموویان لە گەورە تا بچووک ڕێزیان لێ دەگرت و کەمێکیش لێی دەترسان. خودی منیش ماوەیەک بۆ فێربوونی قسەکردن بە زمانی فەرەنسی قوتابی ئەو بووم. سەبارەت بە وشەی "قوتابی" بە بیرم

دیت کە لە ماوەی نیشتەجێبوونمدا لە بوهمی باکووریدا Boheme
du Nordلە لای ژنبرا تازەکەم کە خانەخوێ بوو جاریکیان بیستم
کە گوندنشینەکانی ئەو ناوچەیە (بە زمانی ئەڵمانی (Eleven بە
ئەکادیمیای پاسەوانی دارستانی ناوچەکە نازناوی "شێر
(Löwen)یان پێ داوە، من بەو ناولێنانە زۆر پێکەنیم. ڕەنگە ئەو
بیرەوەرییە خۆشە بۆ جێگۆڕکێی بیروباوەڕم لە کەمتیار بۆ شێر
کاریگەر بووە.

أ- نموونەی لای خوارەوە پیشانی دەدات، کە چۆن گرێیەکی شەخسی لە بارەی دەورانی ڕابردوو دەتوانێت بۆ ماوەیەک ببێتە هۆی لەبیرکردنی ناوێک.

دوو پیاو یەکێکیان گەنجتر و ئەویتریان بەتەمەنتر، شەش مانگ لەوەوبەر پێکەوە گەشتێکیان بۆ سیسیل کردبوو و لە بارەی بیرەوەری ڕۆژە خۆشەکان و پڕ لە تێگەیشتن و هەستەکانیان قسەیان دەکرد. پیاوە گەنجەکە پرسی:

ب- ئەرێ بەڕاست، ناوی ئەو شوێنەی کە شەو پێش ئەوەی بڕۆین بۆ سلی نینت Selinunt لەوێ بە سەرمان برد، چییە؟ ئایا کالاتافیمایە؟

ج- نا، بە دڵنیاییەوە نا. بەڵام منیش ناوی ئەو شوێنەم لەبیر چووەتەوە هەرچەند هەموو وردەکارییەکانی نیشتەجێبوونمان لە بیرە. هەر ئەوەندە بەسە کەسێک لە بەردەممدا ناوێک لە بیر بکات تا لەبیرکردنی ئەو کەسە وەک درم ئەو ناوەیش لە بیری من بباتەوە. پێت چۆنە پێکەوە بە دوای ئەو ناوەدا بگەڕێین؟ تەنیا ناوێک کە بە بیرم بێتەوە "کاتانیزتا"یە کە بە دڵنیاییەوە ڕاست نییە.

ح- پیاوە گەنجترەکە وتی: نا، ناوی ئەو شوێنە لەگەڵ پیتی W و

دەست پێ دەکات یان لانی کەم ئەو پیتە لە ناوەکەدا بوونی هەیە.

بەرامبەرەکەی وەلامی دایەوە: بەلام پیتی W لە زمانی ئیتالیدا بوونی نییە.

خ- هەڵبەت مەبەستی منیش هەمان پیتی V ڤییە، بەلام بە گوێرەی خوو و لەژێر کاریگەریی زمانی دایکمدا پیتی W م هێنایە سەر زار.

پیاوی بەتەمەن ناڕەزایەتی دەربڕی بەرامبەر بە پیتی V و وتی: پێموایە زۆربەی ناوەکانی سیسیلیم لەبیر چووەتەوە. چۆنە ئەو مەسەلەیە تاقی بکەمەوە؟ بۆ نموونە ناوی شوێنێکی بەرز کە لە دەورانی دێریندا "ئینا-Enna "یان پێ دەوت، ئێستا چییە؟ ئۆ، بەڵێ، بە بیرم دێتەوە. کاستڕۆجیڤانی. Castelvetrano

پاش چرکەیەک پیاوە گەنجەکە ناوە لەبیرکراوەکەی بەبیر هێنایەوە و بە دەنگی بەرز وتی کاستێلا ڤێرتانۆ.Castelvetrano

ئەو لەوەی توانی بیسەلمێنێت حەقی هەبووە و پیتی (ڤێ) لە ناوی شوێنەکەدا هەبووە خۆشحاڵ بوو. پیاوە بە تەمەنەکەیش بۆ چەند خولەکێک دیسانەوە گومانی پیشان دا، بەلام لە ئاکامدا قبوڵی کرد ئەو ناوەی بەرامبەرەکەی دۆزیویەتیەوە ڕاستە. ئەوسا توانی تێبگات هۆی لەبیرچوونەوەی چی بووە.

پاشان بیری لێ کردەوە ئاشکرایە، چونکە نیوەی دووەمی ئەو ناوە واتە ڤێترانۆ Vetrano هاوشێوەی وشەیVeteranـە بە واتای "پیری"یە. من باش دەزانم پێم خۆش نییە بیر لە پیری بکەمەوە و کاتێک کەسێک لە بارەی پیرییەوە قسە دەکات پەرچدانەوەیەکی سەیر پیشان دەدەم. بۆ نموونە ماوەیەک لەوەوبەر هاوڕێیەک کە زۆر خۆشم دەویست بە توندی ڕەفتارم لەگەڵی کرد و پێی وتم "دەمێکە دەورانی گەنجێتی تێپەڕ کردووە". هۆی ئەو ڕەفتارەم ئەوە بوو

هاوڕێیەکەم پاش وتنی هەندێ ڕستەی زمانلووسانە و ستایشئاسا بۆ وەسفکردنم وتبووی: "تۆ ئیتر گەنج نیت". هەروەها ئەگەر لە بەرامبەر نیوەی دووەمی ناوی تەواوی کاستیلا ڤیترانۆدا خۆڕاگری پیشان بدەم، لە بەر ئەوە بوو کە بەشی یەکەمی ئەو ناوە کاتانیزتا Caltanisettaیش بوو.

پیاوە گەنجترەکە پرسی:

- ناوی کالتانیزتا چ واتایەکی هەیە بە لاتەوە؟

پیاوە بە تەمەنەکە دانی پیا دانا:

- ئەو وشەیە بە لامەوە مۆسیقای خۆشی ژنێکی هەیە. پاش چەند چرکەیەک وتی:

ناوی ئێستای ئێنا ناوێکی جێگرە. من ئێستا تێدەگەم کە ناوی کاستروجیڤانی Castelvetrano، کە بە یارمەتیی هۆهێنانەوە پێیگەیشتم منی خستە یادی وشەی گەنجێتی (بە ئیتالی دەبێتە giavane). هەر وەک چۆن وشەی کاستیلا وترانۆ Castelvetranoدەمخاتە یادی تەمەنی پیری. (Veteran)

پیاوە بەتەمەنەکە وای دەزانی بەو شێوەیە لەبیرچوونەوەکەی خۆیی شرۆڤە کردووە، بەڵام بزواندنەکانی لەبیرکردنی پیاوە گەنجترەکە هەڵنەسەنگێندرا.

میکانیزمی لەبیرچوونەوەی ناوەکان بە ئەندازەی بزواندنیان سەیرە. ئێمە لە زۆر بواردا ناوێک لەبیر دەکەین، نەک لە بەر ئەوەی هەندێ هۆکار دەبنە بەربەست بۆ دەربڕینیان، بەڵکوو لەو ڕووە کە ئەو ناوە لە بواری فۆنتیک یان تێکەڵاوی پیتەکانیەوە هاوشێوەی ناوێکی ترە و ئنجا لە بەرامبەر ئەو ناوەکەی تر یان بیرکردنەوە لە بارەیەوە خۆڕاگری پیشان دەدەین. دەبێ ئاگادار بین کە ڕێژەی ئەو

هەڵومەرجە بە شێوەیەکی سەیر یارمەتیدەر بێت بۆ دیاردەی لەبیرچوونەوە. لەو بارەوە چەند نموونەیەک دێنینەوە.

د- نموونەیەکی وەرگیراو لە کتێبی دەروونشیکاری، بواری دووەم:

کاک ن. دەیویست بڵاوگە و چاپەمەنیی گیلهۆفێر و ڕانشبۆرگ بە کەسێک بناسێنێت و هەرچەند ئەو بڵاوگەیەی بە باشی دەناسی، بەڵام سەرباری هەموو هەوڵدانێکی سەرنەکەوت ناوەکەی بە بیر بهێنێتەوە و تەنیا ڕانسبۆرگی بە بیر هێنایەوە. ئەوسا بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام ئەو مەسەلەیە بە ڕادەیەک نیگەرانی کرد، کە بڕیاری دا کە براکەی چاوی چووبووە خەو خەبەری بکاتەوە و ناوی شەریکەکەی ڕانشبۆرگی لێ بپرسێت. براکەی بە ئاسانی ئەو ناوەی هێنایە سەر زار. ناوی گیلهۆفێر خێرا ناوی گالا هۆفی بە زەینی کاک ن. هێنایەوە، ناوی ئەو شوێنەی کە ماوەیەک لەوەوبەر لەگەڵ کچە گەنج و جوانەکەیدا بۆ گەشت و سەیران ڕۆیشتبوو بۆ ئەوێ و بیرەوەری زۆر خۆشی لێ وەرگرتبوو. کچە جوانەکە شتێکی بە دیاری پێ دابوو کە ئەم ڕستەیە لەسەری نووسرابوو: "بە یادی ئەو کاتە خۆشانەی کە لە گالا هۆفدا تێپەڕمان کرد". چەند ڕۆژ پێش ئەوەی ناوی گیلهۆفێر لەبیر بکەم، کاک ن. لە کاتی داخستنی چەکمەجەی ئەو مێزەدا کە دیاریەکەی لە ناوی دانابوو، زیانێکی توندی لەو شتە ناوبراوە دابوو و هەرچەند ئەو کارە بە گشتی بەڕێکەوت بوو، بەڵام ئەو واتای کارە سومبولیکەکانی دەناسی، بێ ویست هەستی بە تاوانێکی زۆر کردبوو. کاک ن. پاش ئەو ڕووداوە لە بەرامبەر کچەکەدا دۆخێکی تارادەیەک دژبەری هەبوو، هەڵبەت حەزی لێ بوو، بەڵام کاتێک کچە ئارەزووی بۆ هاوسەرگیری لەگەڵیدا پیشان دەدا، کاک ن. تووشی جۆرێک خۆراگری و گومان دەبوو.

ژ- دکتۆر هانس ساکس دەنووسێت:

لە وتووێژێکدا لە بارەی شاری جێن و شارۆچکەکانی دەوروبەری، پیاوێکی گەنج دەیویست ناوی گەڕەکی پلی "Pegli" بهێنێتە سەر زار، بەلام ئەو ناوەی پاش هەوڵدانێکی زۆر بە بیر هاتەوە. ئەو لە کاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە بیری دەکردەوە بۆ لەبیرکردنی ناوێکی ناسراو وەک ئەو، ئنجا لەناکاو وشەی پلی Peli لە زەینیدا دەرکەوت. ئەو وشەیە ڕێک شێوازی وتنەکەی وەک وشەیPegli یە. ئەو دەیزانی کە peli ناوی دوورگەیەکە لە ئۆقیانووسی ئەتلەس، کە دانیشتوانەکەی دابونەریتێکی زۆر سەیریان پاراستووە. پیاوە گەنجەکە وەسفکردنی ئەو دابونەریتەی لە کتێبێکی نەتەوەناسیدا خوێندووەتەوە و بیری لەوە کردووەتەوە کە لەو زانیاریانە بۆ بیرۆکەیەکی شەخسی کەڵک وەربگرێت. هەروەها بە بیری دێتەوە کە پلی Pali شوێنی ڕوودانی کارەسات و چیرۆکەکانە، کە بە زەوق و حەزەوە خوێندوویەتەوە. ئەو کتێبە باشترین دەورانی ژیانی "وان زانتێن" بەرهەمی "لۆرید زبرۆن" بوو. ئەو بیرکردنەوانەی پیاوە گەنجەکە بەبێ ڕاوەستان بە درێژایی ئەو ڕۆژە لە مێشکیدا هەیبوو لە بارەی ئەو نامەیەوە بوو کە سەرلەبەیانیی هەمان ڕۆژ لە هاوسەرە خۆشەویستەکەی وەرگرتبوو. لە ناوەڕۆکی نامەکە تێگەیشتبوو دەبێ گوێ نەدات بەو مەوعید و کاتەی بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ کچەکە دایناوە. پیاوە گەنجەکە ئەو ڕۆژەی بە خەمۆکی و نائومێدییەوە تێپەڕ کرد و شەو بەتەمای کردنی کارێک لە ماڵ چووبووە دەرەوە تاکو نیگەرانییەکەی لەبیر بکات و لەو کۆڕەی میوانەکانی زۆر لە بەر ڕووناکی هاندانی ئەودا بوون چێژ وەربگرێت کە بەڵێنی بە خۆی دابوو. بە دڵنیاییەوە هاوشێوەی فۆنێتیکی وشەی پلی Pegli چۆنیەتییەکی لەگەڵ وشەی پلی Peliدا هەبوو، کە مەبەستی پیاوە گەنجەکەی بە توندی تێک دا. چونکە ئەو وشەیەی بە تەنیا لە ڕێگای نەتەوەناسییەوە بە لاوە گرنگ نەبوو، بەڵکوو لەگەڵ "باشترین

دەورانی ژیان* (بە گوێرەی هاوشێوەبوونی ناونیشانی چیرۆکێک کە پێشتر باسمان کرد) هەموو نیگەرانی و ئەو ڕەنجانەی بە درێژایی ڕۆژ هەستی پێ کردبوو بەرجەستەی دەکرد. سەیر لەوەدایە ئەو لێکدانەوەیە زۆر سادەیە تەنیا پاش وەرگرتنی دووەمین نامە و گۆڕینی خەم و خەفەتی پیاوە گەنجەکە بۆ دڵنیابوونێکی شادومانبەخش لە چاوپێکەوتنێکی زۆر نزیک لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئەنجام درا.

ئەگەر لە بارەی ئەو نموونەیەوە بوارێکی هاوشێوە بە بیر بهێنمەوە، کە لەبیرچوونەوەی ناوی نرڤی Nervi لەخۆ دەگرت، تێدەگەیشتین هاوشێوەبوونی فۆنێتیک لە نێوان دوو ناودا وەک دووشێوەبوونی واتای ناوێکە ببێتە هۆی لەبیرچوونەوە.

١٤- لەساڵی ١٩١٥ی زاینیدا کاتێک شەڕ لە گەڵ وڵاتی ئیتاڵیا دەستی پێ کرد، تێگەیشتم کە ناوی زۆربەی شار و شوێنەکانی ئەو وڵاتە کە زۆر بەلامەوە ناسراو بوو لە زەینمدا نەمابوو. منیش وەک زۆربەی ئەڵمانییەکان خووم وابوو بەشێک لە پشووەکانم لە ئیتاڵیا تێپەڕ بکەم و دڵنیاش بووم لەبیرچوونەوەی ڕێژەیەکی زۆر ناو تەنیا دەتوانێ دەبڕی دوژمنایەتییەکی شیاوی تێگەیشتن بێت بەرامبەر بە وڵاتی ئیتاڵیا، ئەو دوژمنایەتییەی کە لە دڵی هەموو خەڵکی ئەڵمانیادا شوێنی خۆی دابووە هاوڕێیەتی و ئارەزووی پێشوو. لەپاڵ ئەو لەبیرچوونەوەیەدا کە مەبەستێکی ڕاستەوخۆی هەبوو نموونەیەکی تر بینی هەرچەند مەبەستێکی ناڕاستەوخۆی هەبوو، بەڵام بەو مەبەستانەی ناوی لێبرا یەکسان بوو. لە ڕاستیدا لەو کاتە ئاڕاستەم هەبوو بۆ لەبیرچوونەوەی ناوەکانی تر جیا لە ئیتاڵیا، پاش شیکردنەوەی ئەو مەسەلەیە تێگەیشتم ئەو ناوانەی لە بیری دەکەم لە بواری فۆنێتیکەوە تاڕادەیەک هاوشێوەی ناوە ئیتاڵییەکانن. بۆ نموونە

ڕۆژێکیان هەوڵم دا تا ناوی شارێکی مۆراڤی Moravie واتە بیزانس Bisenzوەبیر بهێنمەوە، لە ئاکامدا پاش هەوڵدانێکی زۆر توانیم و خێرایش تێگەیشتم ئەو لەبیرچوونەوەیە دەبێ بیخەمە پاڵ مەسەلەی بیزانسیBisenzi لە ئەریۆتو. هۆتێل بێلا ئارتی Bell – Aetí لەو کۆشکەدایە و منیش هەر کات گەشتم بۆ ئەریۆتو دەکرد دەچوومە ئەو هـوتێلە. بیرەوەریـی زۆر خـۆش کە لە نیشـتەجێبوونەکانم لەو گەرەکەدا لە زەینمدا بوو بە شێوەیەکی سروشتی لەژێر کاریگەریی ئالوگۆری هەستەکانمدا لەناو چوو بوو.

ئێسـتا خـراپ نییە هەنـدێ نمـوونە هەڵبسـەنگێنین، کە تیایانـدا لەبیرچـوونەوەی ناوەکان ڕەنگە هەندێ مەبەست و ئامانجی دیار بەتاڵ دەکاتەوە و تێری دەکات.

١- لەبیرچـوونەوەی ناوەکـان بـۆ گەرەنتیکردنـی لەبیرچـوونەوەی بەرنامەکان:

ا.ی. ئەشتێرفێر دەنووسێت:

ژنێکی خەڵکی باڵا ڕۆژێکیـان سـەرلەبەیانی تێگەیشت، کە یەکێک لە هاوڕێیانی دەورانـی منداڵیی بە نـاوی سـەلما بـۆ مـانگی هەنگوینی هاتووە بۆ باڵا و تەنیا یەک ڕۆژ لەو شارەدا دەمێنێتەوە. ئەو خێرا بۆ بینینی هاوڕێکەی ڕۆیشتت بۆ هۆتێل. ئەوان لە کاتی ماڵئاواییدا کاتیان دانا دوای نیوەڕۆ یەکتر ببینن و تا کاتی گواستنەوەی بووکەخان لە باڵا یەکتر بەجێ نەهێڵن. من هۆکاری لەبیرچوونەکەی نازانم، بەڵام ئەو ڕاستییە (چـاوپێکەوتن لەگـەڵ هـاوڕێی دەورانـی منـداڵی کە لەم دواییەیانـدا هاوسـەرگیریان کـردووە) دەتوانێت چەنـدین مەبەسـتی بەرجەسـتەی هاوشـێوەبوونیان هەبووبێـت کە ببێـتە ڕێگـر بـۆ چـاوپێکەوتنێکی تـر. تایبەتمەنـدی سەرنجراکێشـی ئەو نمـوونەیە لەوەدایە کە هەڵەیەکـی ڕەفتـاری بە مەبەسـتی ئەسـتی بەهێزکردنـی

لەبیرچوونەوەی سەرەتایی پاش ئەو لەبیرچوونەوەیە پێک هات لە هەمان کاتژمێردا ئەو خانمەی خەڵکی باڵا دەبوایە لەگەڵ بووکەخاندا چاوپێکەوتنی بکردبا، چوو بوو بۆ ماڵی هاوڕێیەکی تر. لە کاتی قسەکردندا وتووێژی ئامادەبوان بۆ هاوسەرگیری گۆرانیبێژی ئۆپێرای ڤییەننا بە ناوی "کورز" ئاراستەی پێ درا. خاتوونی خەڵکی باڵا ڕەخنەی لەو هاوسەرگیرییە کرد، بەڵام ڕێک لەو چرکەیەدا کە دەیویست ناوی تەواوی ئەو گۆرانیبێژە بهێنێتە سەر زار بە نائومێدی تێگەیشت کە ناوی یەکەمی بەبیر ناهێنێتەوە (دەزانین ئەگەر ناوی بنەماڵەیی کەسێک یەک هونجیی هەبووبێت، زۆر جار ناوی بچووکی لەگەڵ ناوی بنەماڵەییدا دێنە سەر زار). ئەو خاتوونە لە لاوازیی زەینی خۆی زۆر تووڕە بوو بەتایبەتی کە چەندین جار ناوی "کورز" بە شێوەیەکی تەواو (واتە لەگەڵ ناوی بچووکیدا) بیستبووی و بە تەواوی دەیناسی، بەڵام پێش ئەوەی یەکێک لە ئامادەبوان ئەو ناوەی بە بیر بهێنێتەوە باسی مەسەلەکەی گۆڕی.

دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ ئەو ژنە لە میوانییەکی تردا وەک میوانییەکەی دوانیوەڕۆ بەشداری کرد و چونکە بە ڕێکەوت دیسانەوە وتووێژ لە بارەی هەمان گۆرانیبێژ کرا، ئەو بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی بچووکترین کێشە ببێتەوە: "سەلما کورز"، هاوکات لە گەڵ بەسەرزارهێنانی ئەو ناوەدا بە دەنگێکی بەرز وتی: "ئێستا بیرم کەوتەوە. بە تەواوی لەبیرم کردبوو ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ لەگەڵ هاوڕێکەمدا سەلما کاتی چاوپێکەوتنم هەبووە". پاشان سەیری کاتژمێرەکەی کرد و تێگەیشت لەو کاتژمێرەدا هاوڕێکەی شاری باڵی بەجێ هێشتووە".

هێشتا بنەمای سەرەکیمان بۆ دەربڕینی بیروڕا لە بارەی ئەو نموونە جوانەی کە لە زۆر بوارەوە سەیر دێتە بەرچاو، لە بەردەستماندا نییە.

نموونەی دوایی سادەتر دەردەکەویت و سەبارەت بە لەبیرچوونەوەی وشەیەک بە زمانی دەرەکی نەک ناویک، هۆی ئەو لەبیرچوونەوەیە گریدراوی باروودۆخیکی دیاریکراوە، بەلام ئیستا دەبی ئاماژەی پی بدەم کە دەرەئەنجامەکانی لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکان و ناوی یەکەم و وشەی دەرەکی و زنجیرە وشەکان بە هەر شیوەیەک یەکسانن. لە نموونەیەکدا کە ئیستا دەیهینینەوە پیاویکی گەنج بیانوویەک دینیتەوە تا بتوانیت ئەو کارەی ئارەزووی لییەتی ئەنجامی بدات بەو واتایەیە ئەو کانزایە لە زمانی بەریتانی و ئەلمانی پیی دەوتریت Gold و لە هەردوو زمانەکەدا شیوەزاریکی یەکسانی هەیە.

پیاوە گەنجەکە لە پانسیۆنیکی خیزاندا ژنیکی بەریتانی ناسی و حەزی لی کرد. شەوی یەکەمی ناسراوی پیکەوە بە زمانی دایکی ژنەکە (واتە بەریتانی) قسەیان کرد. پیاوە گەنجەکە ئەو زمانەی بە باشی دەزانی، بەلام کاتیک ویستی وشەی ئالتوون بە بەریتانی بلیتەوە بە هەموو هەولیکیەوە وشەی پیویستی نەدۆزییەوە و لەبری وشەی aurum بە زمانی لاتینی و Chrysos بە زمانی یۆنانی بە بیریدا هاتەوە و وەها زەینی سەرقال کرد، هەرچەند دەیزانی ئەو وشانە لە بواری زارەکییەوە هاوشیوەی وشە مەبەستەکەی ئەو نین بە سەختی توانی ئەوانە لە زەینی دوور بخاتەوە. لە ئاکامدا بیجگە لەوە چارەیەکی نەبینیەوە ئەو مستیلە ئالتوونییەی کە خاتوونی بەریتانی بەدوایدا دەگەڕا لە هەر بواریکەوە هاوشیوەی وشە ئەلمانییە دیاریکراوەکەی هەمان کانزایە."Gold" واتای ئەو بەرکەوتنە کە لەبیرچوونەوە بووەتە هۆی ئەوە، دەبی لە ئارەزووی هەموو دلداریکدا بۆ هەستکردن بە دولبەرەکەی بە دوایدا بگەڕیین، بەلکوو ئەو کارە لەبارەی مەبەستی پیاوە گەنجەکە بۆ هاوسەرگیری لەگەل ئەو ژنەدا هەندی زانیاریمان دەخاتە بەردەست. هەروەها ویژدانی نەستی ژنیک بەتایبەتی ئەگەر

ئەوەش حەزی لە پیاوە گەنجە هەبوو، دەیتوانی مەبەستە خۆشەویستییەکانی ئەو لە ڕواڵەتی پاک دڵانەی لەبیرچوونەوەیەکی سادە هەستی پێ بکات. جیا لەوەیش چۆنیەتی پاساو و پەسەند کردنی ڕەفتاری بەرامبەر دەتوانێت زۆر پڕ واتا بێت و مەبەستەکانی ویژدانی نەستی ژنەکە بدرکێنێت و یارمەتیمان دەدات بۆ پێشبینی ئاکامەکانی ئەو چاوپێکەوتنە.

٢- نموونەیەکی تر بۆ لەبیرکردنی ناوە تایبەتەکان لەگەڵ بیرەوەرییە ڕۆتینییەکان من دیسانەوە نموونەیەکی سەیرت بۆ دەگێڕمەوە لە "شتریک" بۆ لەبیرچوونەوە و بیرهاتنەوەی ناوێک. تایبەتمەندی ئەو نموونەیە لەوەدایە، کە لەبیرکردنی ناوێک بۆ گۆڕینی وشەیەک لە هۆنراوە پێچوپەنادارتر بووە. بۆ نموونە: "دەستگیرانەکەی کۆرێنت."

زمانناس و نووسەرێکی پیر، کاک ز. لە بەرامبەر هەندێ کەسدا دەیگێڕایەوە، کە لە دەورانی خوێندندا لەگەڵ خوێندکارێکدا ئاشنا بووەتەوە کە زۆر گەمژە دەهاتە بەر چاو. ئەو دەیوت دەتوانێ لە بارەی ئینکاربوونی ئەو خوێندکارەوە چیرۆکی زۆر بگێڕێتەوە و بەو وەسفکردنەشەوە ناوەکەیی بەبیر نەدەهێنایەوە. سەرەتا پڕوپاگەندەی دەکرد کە ناوەکەی بە "و" دەست پێ دەکات، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ئەو بیرۆکەیەی گۆڕی و تەنیا ئەوەی بە بیر هاتەوە کە خوێندکارە گەمژەکە دوایی بوو بە شەرابفرۆش. "Weinhändler" پاشان پاشان چیرۆکێکی لە گەمژەیی ئەو گێڕایەوە و سەری سوورمابوو سەرباری ئەوەیش ناوەکەی بە بیر نایەتەوە. لە ئاکامدا وتی: "ئەوەندە کەر بوو کە من هێشتا نازانم چۆن توانیم دوای چەند جار دووپاتکردنەوە کەمێ زمانی لاتینی بکەمەوە مێشکیەوە." ئنجا پاش چرکەیەک بە بیری هاتەوە، کە ناوی لەبیرکراو بە مان "...Man" کۆتایی پێ دێت. ئێمە پرسیارمان لێ کرد ئایا ناوێکی تر بە زەینیدا

دێت کە بەو بەشە ناوەکە تەواو بکات. ئەو وەڵامی دایەوە:

ر- ئەردمان. Erdman

ئێمە پرسیمان:

- ئەردمان کێیە؟

ئەویش یەکێک بوو لە خوێندکارانی هاودەورەی من.

کچە نووسەرە پیرەکە پێی وت مامۆستایەکیش هەر بەو ناوەوە هەیە. کاک ز. پاش گەڕان لە بیرەوەریەکانیدا بە بیری هاتەوە کە مامۆستا ئەردمان لەم دواییانەدا لەو گۆڤارەی کە بەرپرسیاریتی لە ئەستۆیدا بووە، بە بڵاوکردنەوەی یەکێک لە توێژینەوەکانی ئەو تەنیا بە شێوەیەکی کورت لەگەڵیدا هاوڕا بووە، چونکە لەگەڵ هەموو بیروبۆچوونەکانی نووسەردا هاوڕا نەبووە و ئەو کارەیش بووەتە هۆی خەم و خەفەتی. (جیا لەوەیش من دوایی تێگەیشتم کە کاک ز. ئارەزووی هەبووە ببێتە مامۆستا و لە هەمان پسپۆڕیدا وانە بڵێتەوە کە ئێستاکە مامۆستا ئەردمان وانە دەڵێتەوە)، بۆیە ڕەنگە لەو پەیوەندییەدا حەساسیەتێک بوونی هەبێت.

ئنجا لەپڕ کاک ز. ناوی خوێندکاری بێتوانای پێشووی بە بیر هاتەوە و وتی "لایندەمەن" Lindemann ، چونکە ئەو پێشتر بە بیری هاتبووەوە کە ناوی ئەو خوێندکارە بە "مان Man کۆتایی پێ دێت، کەواتە وشەی Linde بە شێوەیەکی قووڵتر سەرکوت کرابوو. کاتێک تکامان لێ کرد هەر شتێک لە بارەی ئەو وشەیەوە بە مێشکیدا تێپەڕ دەبێت، بیڵێتەوە، سەرەتا وەڵامی دایەوە: "هیچ شتێک. من پێداگر بووم و وتم ناکرێ لە چوارچێوەی ئەو وشەیەدا هیچ ئەندێشەیەک بە بیری نەیەتەوە. نووسەری پیر چاوەکانی بۆ سەرەوە ڕوانی و لە حاڵێکدا بە جووڵەی دەستی شتومەکێکی دەنەخشاند، وتی: "زۆر چاکە، زیرفۆن

داری زیرفۆن،Linden درەختێکی جوانە.

پاشان شتێکی پێ زیاد نەکرد. هەموو بێدەنگ بوون و دەستیان بە خوێندنەوەی کتێب یان کارێکی تر کرد، بەڵام پاش چرکەیەکی تر دەنگی کاک ز.م بیست کە گوایە لە دنیای خەیاڵیدا ئەو هۆنراوەیە لەبەر دەخوێنێت:

کاتێک ئەو بە پێی پتەو و نەرم

بەسەر زەوییەکەدا دەمێنێتەوە

ناتوانێ خۆی لەگەڵ زیرفۆن

یان ڕەزەکەدا

پێوانە بکات

"Steht er mit festen Gefügigen knochen

Auf der Erde;

So rejcht er nicht auf;

Nur mit der linde

Oder der Rebe

Sich zu vergleichen."

منیش سەرکەوتوانە هاوارم کرد: بەهەرحاڵ، ئەردمانەکەی تۆم دۆزییەوە، پیاوێک کە "لەسەر زەوی دادەمایەوە" کەواتە بوونەوەرێکی زەمینییە Erdemann یان Erdman پاشان ناتوانی خۆی لەگەڵ زیرفۆن (Linde) و هەروەها لەگەڵ لایندمەن (Lindeman) و تاک

(Rebe)و لەو ڕووەوە لەگەڵ شەرابفرۆشەکەدا (Weinhändler) پێوانە بکات. بە واتایەکی تر ئەو لایەندمەنە خوێندکارە گەمژەیە کە دوایی بوو بە شەرابفرۆش لە ڕاستیدا کەر بوو، بەڵام ئەردمان لەوەیش کەرتر بوو بە ڕادەیەک کە لەگەڵ لایەندمەندا پێوانە نەدەکرا. ئەو جۆرە قسە سووکوسەلیمکردنانە، یان پڕ گاڵتەجاڕییە لە ویژدانی نەستماندا بە فراوانی دەردەکەوێت. لەبەر ئەوەیە دەتوانین بڵێین کە هۆکاری سەرەکی لەبیرچوونەوەی ناوەکە دۆزراوەتەوە. ئەوسا لە کاک ز.م پرسیم ئەو دێرە هۆنراوانەی لەبەر دەیخوێنێت لە چ هۆنراوەیەکەوە تێهەڵکێشی کردووە. ئەو وتی هەندێ لەو دێرانە بەشێکن لە هۆنراوەکانی گۆتە، کە پێی وابوو بەو دوو نیودێرە دەست پێ دەکات:

(دەبێ مرۆڤ، بە شەرەف و

خێرخواز و میهرەبان بێت)

Edel sei der Mensch,

Hilfreich und gut!

پاشان درێژەی پێ دا و وتی هۆنراوەکە ئەم دێرانەیش لەخۆ دەگرێت:

(پاشان کاتێک ئەو هەڵدەستێت

باکان یاریی لەگەڵ دەکەن)

Und hebt er sich aufwrts

So spielen mit ihm die winde.

سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی من ئەو هۆنراوەیەی گۆتەم دۆزییەوە و تێگەیشتم، کە نموونەکەی کاک ز. لەو شتەی سەرەتا بیرم لێ دەکردەوە سەیرتر و هەڵبەت ئاڵۆزترە.

أ- دوو نیوەدێڕی یەکەم (کە پێشتر باس کرا) وەها بوو:

Steht er mit festen

Mar Kigen Knochen

Markigen لێوانلێـــــو لە شـــــیرەی گیـــــاییە، نەک Gefügigenتێکەڵاوکردنی دوو وشەی "قاچی نەرم" هەندێ سەیر دێتە بەرچاو، بەڵام من درێژە بە خوێندن دەدەم.

ب- دێڕەکانی تر وەها بوون:

(لە سەر زەوییەکەدا پتەو و پێداگر

ئەو ناتوانێ خۆی لەگەڵ

داربەڕوو یان لەگەڵ ڕەزدا

پێوانە بکات).

Auf der Wohlbegründeten

Dauernden Erde

Reicht er nicht auf.

Nur mit der Eiche

Oder der Rebe

Sich zu Vergleichen."

لەو ڕووەوە لە هیچ شوێنێکی هۆنراوەکەدا ئاماژەیەک بە درەختی زیرفۆن (Linde) نەبوو. جێگۆڕکێی داربەڕوو (Eiche) لەگەڵ داری زیرفۆندا (Linde) لە ویژدانی نەستی کاک ز.دا بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە ئەو بتوانێت بە چەند وشەیەکی وەک (Rede, Linde. Erde)

زەوی و زیرفۆن و ڕەز جۆرێک هاورەگەزی دروست بکات.

ج- هۆنراوەی ناوبراو پێی دەوترێت "سنووره مرۆڤایەتییەکان" و پێوانەیەکە لە نێوان هێزی تەواوی خواکان و لاوازییەکانی مرۆڤدا، بەلام ئەو هۆنراوەیەی لەگەل نیوەدێڕەکانی Hilfreich und gut!/ Edel sei der Mensch دەست پێ دەکات. بە هیچ شێوەیەک ئەوە هۆنراوەیە نییە کە کاک ز. پەرەگرافێکی لێ تێهەلکێش کردبوو. ئەو هۆنراوەیە لە چەند لاپەڕەی دواییدا بە چاپ گەیشتووە و ناویشی "خواییە" و وەک "سنوورەکانی مرۆڤایەتی" بریتییە لەو ئەندێشانەیە کە لە بارەی خواکان و مرۆڤەکانەوەیە. ئێمە لە بارەی ئەو مەسەلەیەوە بە قوولی باسمان نەکردبوو لەو ڕووەوە من ئەوپەڕی دەتوانم بلێم، کە هەندێ بیروباوەڕ لەبارەی مردن و ژیان، نەمری و نەبوونی، ناسەقامگیری ژیانی خودی کاک ز. و مەرگی داهاتووی ڕەنگە ڕۆلی هەبووە لە دابینکردندا بۆ لەبیرچووەنەوەی.

لە هەندێ نموونەدا دەبێ بە هەموو وردەکاری و وردبینیی تەکنیکییەوە، پشت بە دەروونشیکاری ببەسترێت تا بۆ لەبیرکردنی ناوێک شرۆڤەیەک بدۆزرێتەوە. من ئامادەم پێشنیار بکەم بەو کەسانەی دەیانەوێ لە بواری ئەو جۆرە لێکۆلینەوانەدا وردەکاری زیاتر بەدەست بهێنن، سەردانی بابەتەکەی کاک جۆنز بکەن.

بە پێی لێکۆلینەوەکانی کاک فرێنزی، لەبیرچوونەوەی ناوەکان دەتوانێ وەک هێمایەکی نەخۆشی هیستریا دەربکەوێت. ئەوە میکانیزمێکی ئاشکرا کردووە کە بە تەواوی جیاوازە لەگەل ئەو میکانیزمەی کە لە هەلە ڕەفتارییەکاندا کاریگەرە. ڕاپۆرتی لای خوارەوە ئەو جیاوازییە بۆ درکپێکردن شیاو دەکات.

"لە ئێستادا سەرقالی چارەسەرکردنی نەخۆشێکم هەرچەند زەینێکی باشی هەیە، بەلام ناتوانێت ناوە تایبەتەکان تەنانەت ناوی زۆر باو و

ناوی زۆر ئاسیاو بەبیر بهێنێتەوە. شیکردنەوە پێشانی داوە ئەو هێمایانە یارمەتیی دەدات تا جەخت لەسەر نەزانینی خۆی بکاتەوە. لە لایەکی ترەوە ئەو نەخۆشە بە پێداگری لەسەر نەزانین بە شێوازێک باوک و دایکی لۆمە دەکات، چونکە ئەوانە نەیانویستووە ئەو درێژە بە خوێندنی بالا بدات. بیرکردنەوەی سەقامگیری ئەو بۆ پاککردن و خاوێن ڕاگرتنی هەموو شتێک (دەروون شڵەژاویی کابانی ماڵ) تارادەیەک لەو مەسەلەیە سەرچاوە وەردەگرێت. لە ڕاستیدا ئەو ئەم ڕەفتارە بەرامبەر بە باوک و دایکی دەیکات: "ئێوە تەنیا کەسێکی فەراشتان لێ دروست کردووم!"

من دەتوانم نموونەی جۆراوجۆر بۆ لەبیرچوونەوەی ناوەکان بهێنم و باسەکەیش قووڵتر بکەم، بەڵام وای بە باش دادەنێم هاوکات باس لە هەموو بیروبۆچوونەکان نەکەین کە لە درێژایی کتێبەکەدا بۆ مەسەلەکانی تر دەیخەینە بەر باس. سەرباری ئەوەیش یارمەتی وەردەگرم ئەو دەرئەنجامانەی لە شیکردنەوەی لای سەرەوە وەرمان گرت لە چەند ڕستەیەکدا کورتی بکەمەوە.

میکانیزمی لەبیرچوونەوەی ناوەکان (یان وردتر بڵێین لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکان) بریتیە لە بەربەستێک، کە زنجیرەیەک ئەندێشەی دەرەکی و نەست لە بەرامبەر دەربڕینی ویستی ناوەکەدا دابینی دەکەن. لە نێوان ناوی تێکچوو و گرێی پەرێشانکەردا پەیوەندییەک لە ئارادایە، کە یان هەر لە ڕابردووەوە هەبووە یان لە ڕێگاکانی بە ڕواڵەت دەستکرد و بەهۆی وەبیرهێنانەوەکانی دەرەکی و ئاسایی پێک دێت. گرنگترین گرێیەکانی پەرێشانکەر ئەو گرێیانەن کە پەیوەندیی شەخسی یان خێزانی و پیشەیی کاری تێ دەکەن. ئەو ناوەی بە گوێرەی واتا جۆراوجۆرەکەی بە چەندین کۆمەڵە ئەندێشە (گرێ)وە گرێ دراوە

زۆر جـار بە دژواری دەتوانیـت لە پەیوەنـدی لەگـەڵ کۆمەڵێـک ئەندێشـەی تایبەتدا دابڕێت، چونکە لەگەڵ گرێیەکی تر و بەهێزدا هاورایە و لەو ڕووەوە بەربەستێک لەو ڕێگایە پێک دێت. لە نێوان ئەو جۆرە هۆکارە جۆراوجۆرانەدا تێکچوونەکانمان دەبێ بە پلەی یەکەم و بە ڕاشـــکاوییەکی تەواو بە ئاراســـتەی دوورەپەرێزیکـــردن لە هەستێکی ناخۆش یان خەفەتاوی ئاماژە بکەین کە فلان بیرەوەری بە دوو دەستە دابەش دەکرێت: ئێمە ناوێک لە بیر دەکەین، یان بەهۆی ئەوەی کە ئەو ناوە گرێدراوی ناوێکی ترە و ئەو ناوە دووهەمەیش ڕەنگە هەستێکی ناخۆش دروست بکات. کەواتە دەربڕینی ناوەکان یـــان بەهـــۆی خـــودی ئەوانەوە تێـــک دەچێـــت یـــان بەهـــۆی وەبیرهێنانەوەکانیەوە تارادەیەک ناڕاستەوخۆ.

ڕوانینێکی خێرا بەسـەر ئەو بیرۆکـانە و مەرجە گشـتیانەدا بـاوترین جۆری هەڵەی ڕەفتارین.

سەرباری ئەوەیش هێشتا بە هیچ شێوەیەک هەموو تایبەتمەندییەکانی مەسـەلەی مەبەسـتمان بـاس لـێ نەکـردووە. پێم خۆشـە سـەرنجی خـوێنەران بـۆ لای ئەو خـاڵە ڕابکێشـم کە لەبیرچـوونەوەی ناوەکـان یەکێکە لە نهێنیترین دیاردەکـان. ئەگەر لە کـاتی وتـوویژدا یەکێک لە وتەبێژان بڵێت کە فڵان نـاوی لە بیر کردووە کەسـانی تریش نـاتوان دەمێنـنەوە بـۆ وەبیرهێنـانەوەی ئەو نـاوە، بەڵام کەسـێک کە تووشـی لەبیرچـوونەوەی درمـی دەبێـت ئاسـانتر دەتوانێت ئەو نـاوە بەبیـر بهێنێـــتەوە. لە بیرکردنـــی "بەکـــۆمەڵ" یەکـــێکە لەو دیـــاردانەی کە دەروونناســـی گشـــتیی خەڵـــک تیایـــدا دەردەکەوێـــت، بەڵام ئەو دەروونناسییە هێشتا نەبووەتە مەسەلەی توێژینەوەی دەروونشیکاری و لەو ڕووەوە کاک ت. ڕێک توانیویەتی شرۆڤەیەکی باش لە بارەی ئەو مەسـەلەیەی شـیاوی سـەرنجدانە بخـاتە ڕوو. شـرۆڤەکردنی لە

بارەی مەسەلەیەکی زۆر سەیر و سەرنجڕاکێشە.

"لە کۆبوونەوەیەکی زانکۆییدا کە دوو خوێندکاری بەشی فەلسەفە تیایدا بەشدار بوون، مەسەلەی باسکردنەکە لە بارەی مەسەلە جۆراوجۆرەکان بوو کە مێژووی شارستانیەت و زانستی ئیلاهیات لە بارەی پرەنسیبی مەسحیەت لەگەڵیدا ڕووبەڕووین. یەکێک لە خاتوونە گەنجەکانی ئامادە بوو لە کۆڕەکەدا کە بەشداری وتوویژەکەی کردبوو بە بیریدا هاتەوە کە لە ڕۆمانێکی بەریتانیدا لەم دواییانەدا خوێندوویەتیەوە، وێنایەکی سەیری لە ڕووداوە ئایینەکان سەبارەت بەو سەردەمانە دۆزیوەتەوە. ئەو درێژەی پێ دا: "هەموو ژیانی حەزرەتی مەسیح لە ژیان تا مردن لەو کتێبەدا نووسراوە". بەڵام نەیتوانی ناوی چیرۆکەکە بەسەر زار بهێنێتەوە (لە حاڵێکدا بیرەوەرییەکی بەرچاوی زۆر ئاشکرا لە وێنەی پشت بەرگەکە و پێتچنی ناو کتێبەکەی هەبوو). سێ کەس لەو پیاوانەی لە کۆڕەکەدای ئامادە بوون دەریان بڕی ئەو کتێبە دەناسن، بەڵام سەیر لەوەدا بوو ئەوانە وەک ژنە گەنجەکە نەیانتوانی ناوی کتێبەکە بە بیر بهێننەوە!

ژنە گەنجە تەنیا کەسێک بوو کە ئامادە بوو شیکردنەوەی دەروونی لەسەر بکرێت تا شرۆڤەیەک بۆ لەبیرچوونەوەکەی بدۆزێتەوە. باشتر وایە هەر لە ئێستاوە بڵێین ناوی کتێبەکە بن هۆر (بەرهەمی لۆییس والاس) بوو. بیرەوەرییە جێگۆڕکێیەکان بریتین بوو لە: homo - sum,ecce homo, vadis ئەوەندەی نەخایاند کچە گەنجەکە بەتایبەتی تێگەیشت بۆچی ئەو ناوەی لە بیر چووەتەوە. لە ڕاستیدا کتێبەکە دەستەواژەیەکی لەخۆ گرتبوو کە بە وتەی ئەو هیچ کچێکی گەنج ئارەزووی نەبوو لە کۆڕی پیاوەکاندا بیهێنێتە سەر زار. شیکردنەوەیەکی زۆر سەیر بووە هۆی ئەوەی بتوانین ئەو ڕاڤەیە بەربڵاوتر بکەین. کاتێک ڕاڤەکە لە نێوان ناوی لەبیرچوو و

دەستەواژەی نەشیاو لەو شوێنەدا دابین کرا، وەرگێڕانی وشەی (homoپیاو – مرۆڤ) واتایەکی گوماناوی پەیا کرد. کاک ڕیک وەها ئەنجامی وەرگرت: ژنە گەنجەکە وەها ڕووبەڕووی وشە لەبیرچووەکە بووەوە کە گوایا بە وتنەوەی ئەو ناوە، ئەو لە بەرامبەر پیاوە گەنجەکاندا دان بەو خواستانەدا دادەنێت کە شیاوی کەسایەتی ئەو نییە و دەبێ ئەوانە لە خۆیان دوور بخاتەوە. بە کورتییەکەی ئەو ژنە بەبێ ئەوەی تێبگات دەبڕینی ناوی بن هۆری بە جۆرێک دەعوەتکردن دادەنێت و لەبیرچوونەوەکەیشی بە جۆرێک بەرگری لە بەرامبەر ئەستدا هاوشێوە بوو. ئێمە بە پێی هەندێ هۆکار وای بۆ دەچین کە دەرئەنجامی ئەستێکی هاوشێوە بووەتە هۆی لەبیرچوونەوەی ناوی کتێبەکە لە ڕێگای پیاوە گەنجەکانی ئامادەبوو لە کۆڕەکەدا بوو. ویژدانی ئەستیان واتای ڕاستەقینەی لەبیرکردنی کچەکەی دۆزییەوە. لەبیرچوونەوەی پیاوە گەنجەکان هێمای ڕێزگرتن لە بەرامبەر شەرم و حەیای کچە گەنجەکەدا بوو. گوایە ئەو بە بۆشایی لەناکاوی زەینی بابەتێکی بە شێوەی ڕاشکاو گواستەوە بۆ ویژدانی ئەستیان و ئەو واتایەیش خێرا درکی پێ کرا.

جۆرێکی تری لەبیرچوونەوەیش هەیە، کە بریتییە لە زنجیرە ناوێک. ئەگەر لە کاتی لەبیرچوونەوەی ناوێک بمانەوێت پەنا بەرینە بەر ناوەکانی تر کە لەگەڵ ناوی یەکەمدا پەیوەندییەکی ئەتۆ و چڕوپڕیان هەیە و ناوە لەبیرکراوەکە بەبیر بهێنینەوە، ئەو ناوانە کە خاڵی پشت بەستنی ئێمەن زۆر جار لە بیر دەچنەوە و لەو ڕووەوە لەبیرچوونەوە لە ناوێک بۆ ناوێکی تر بڵاو دەبێتەوە و گوایە هەوڵ دەدات تا بوونی بەربەستێکی کارتێنەکەر و دژوار بسەلمێنێت.

# بەشی چوارەم

## بیرەوەرییەکانی منداڵی و بیرەوەرییە داپۆشراوەکان

من لە بارەی بابەتێکی تر کە لە ساڵی ١٨٩٩ی زایینی بە چاپم گەیاند، توانیم پیشانی بدەم کە بیرەوەرییەکان لەو بوارانەی، کە هیچ جۆرە کاردانەوەی خراپی تیاماندا نابزووێنێت، ناوەڕۆکی دژبەریان هەیە. لە سەرەتای توێژینەوەکەدا لە ڕاستییەکی سەیر تێگەیشتم: یەکەمین بیرەوەرییەکانی هەر کەسێک زۆر جار دەگەڕێتەوە بۆ مەسەلە بێبایەخ و لاوەکییەکان لە حاڵێکدا لە یادگەی کەسی پێگەیشتوو (بالغ)دا (هەندێک جار نەک بە تەواوی) هیچ ئاسەوارێک لە کاریگەرییە سۆزداری و توندی ئەو دەورانە نامێنێتەوە. ئێمە بە باشی تێدەگەین، کە یادگە لە نێوان کاریگەری و ئەو هەستانەی کە لە بەرامبەریدا دەوەستن، هەڵبژاردنێک ئەنجام دەدات ئەوسا ناچارین وا بیر بکەینەوە ئەو هەڵبژاردنە لە سەردەمی منداڵیدا بە پێی ڕێسای جیاواز لەگەڵ ڕێسای سەردەمی پێگەیشتوویی زەینی مرۆڤ ئەنجام دەدرێت، بەڵام هەڵسەنگاندنی وردتر پیشان دەدات ئەو بیرۆکەیە هیچ یارمەتییەکمان نادات، چونکە بوونی بیرەوەریی بێبایەخ لە زەیندا قەرزداری دەرئەنجامێکی جێگۆڕکە، ئەو بیرەوەرییانە لە ڕاستیدا هۆکارێکە بۆ هەبوونی کارتێکردن و هەستی بەبایەخی تر کە شیکردنەوەی دەروونیی بوونیان ئاشکرا دەکات، بەڵام چاککردنەوەی ڕاستەوخۆ یان ڕووبەڕوویی خۆڕاگری جددییە. هەرچەند چونکە پاراستنی ئەو بیرەوەرییانە گرێدراوی ناوەڕۆکی ئەوانە نییە، بەڵکوو بەندە بە وەبیرهێنانەوەی نێوان ئەو ناوەڕۆکە و ناوەڕۆکێکی سەرکوتکراوی ترەوە. من ئەوانەم بە "بیرەوەری داپۆشراو" ناو ناوە، چونکە ئەو بیرەوەرییانە دەبنە ڕێگر لە بەردەم دەرکەوتنی

بیرەوەرییە گرنگەکاندا.

لە بابەتێکدا کە باسم لێیەوە کرد لە ڕیشە و جۆراوجۆری پەیوەندییەکان و چەمکەکانی بیرەوەری داپۆشراو بە شێوەی ئاسایی و کاتبەر قسەم کرد، بەڵام مەسەلەکەم بە قووڵی کەڵەبەر نەکرد. نموونەیەکم بە وردی هێنایەوە و یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی پەیوەندیی زەمەنی لە نێوان بیرەوەرییەکانی داپۆشراو و ئەو ناوەڕۆکەی لە پشت ئەوەدا حەشار دراوە، پیشانم دا. لە نموونەی بەر توێژنەوەکانم بیرەوەریی داپۆشراو گرێدراوی یەکێکە لە یەکەمین ساڵەکانی دەورانی منداڵی، لە حاڵێکدا ئەو بیرەوەرییەی لە یادگەدا تاڕادەیەک بە شێوەی نەست مابووەوە، بەند بوو بە سەردەمی دوای ژیانی کەسی مەبەست. من ئەو جۆرە جێگۆڕکێیەم ناونا جێگۆڕکێی "گەڕانەوە بۆ دواوە". ڕەنگە زۆر جار ئێمە زۆربەی نموونەی دژبەری ئەو جۆرە ببینین، واتە ببینین کە کاریگەری و هەستێکی بێبایەخی لە سەردەمی دوایی لە یادگەی کەسەکەدا وەک بیرەوەرییەکی داپۆشراو جێ دەگرێت، تەنیا بەو هۆیە ئەو بیرەوەرییە بەندە بە ڕووداوی پێشووەوە، کە هەندێ خۆڕاگری دەبێتە ڕێگر لە بەردەم خۆدەرنواندنێکی تر و ڕاستەوخۆ. ئەوانە بیرەوەریی "بەرەوپێشڕوانین" یان ئەو بیرەوەرییانەن بە ناچاری بەرەو جێگۆڕکێیەکی داهاتوو ڕۆیشتوون. بواری سێهەمیش لە بەردەستدایە: بیرەوەری داپۆشراو دەتوانێت بەند بێت بە کارتێکردن، یان هەستێک و نەک تەنیا سەرپۆش لەسەر ناوەڕۆکەکەی دابنێت، بەڵکوو لە بواری کاتییەوە پێوە نزیک بێت. ئەو جۆرە بیرەوەرییە داپۆشراوە پێیان دەڵێین بیرەوەریی داپۆشراوی "هاوکات"، یان سەردەم. بیرەوەرییەکانمان بە گوێرەی چی لە چوارچێوەی بیرەوەرییەکانی داپۆشراودا دادەنرێن؟ ئەو جۆرە بیرەوەرییانە لە دەرئەنجامی زەینیی دەروون پەرێشیدا چ ڕۆڵێکیان هەیە؟ من لە بابەتی ناوبراودا نەمتوانی

ئەو مەسەلەیە هەڵبسەنگێنم و لێرەدا باسێک لەو بارەوە دەست پێ ناکەم. تەنیا دەمەوێ هاوشێوەیی لە نێوان لەبیرچوونەوەی ناوەکان لەگەڵ بیرەوەرییە ڕۆتینییەکان و پێکهاتەی بیرەوەرییە داپۆشراوەکاندا پیشان بدەین.

لە یەکەمین ڕوانیندا جیاوازی لە نێوان ئەو دوو دیاردەیە لە هاوشێوەیی نێوانیان بەرجەستەتر دێتە بەرچاو. لە لایەکەوە مەسەلەی ناوە تایبەتەکان لە ئارادایە و لە لایەکی ترەوە مەسەلەی بیرەوەریی تەواو یان ڕووداوە ڕاستەقینەکان، کە کەسەکە لە بواری زەینییەوە تێپەڕی کردووە. لە لایەکی ترەوە مەسەلەی ڕاوەستانی بەرجەستەی ئەنجامدانی "یارمەتیدەری زەین" و لە لایەکی ترەوە ئەو ئەنجامدانەی "یارمەتیدەری زەین" بوونی هەیە و سەرسووڕمانەکەی و سەیربوونەکەی شیاوی بینینە. بۆ بواری یەکەم ئێمە شایەتحاڵی تێکچوونێکی تێپەڕکراوین، (چونکە ناوی لەبیرکراو پێشتر سەدان جار بە شێوەیەکی ڕاست و ڕێک و ورد دەبڕیوە و ڕەنگە بەیانی ئەو ڕۆژە بەبیر بێتەوە) و بۆ بواری دووەم شایەتحاڵی داگیرکارییەکی سەقامگیرە بەبێ هۆ، چونکە وا دیارە کە بیرەوەرییەکانی منداڵیی بێبایەخ بە درێژایی بەشێک لە تەمەن لە زەینا دەمێننەوە. لەو ڕووەوە وا دیارە لەو دوو بوارەدا مەتەڵەکە ئاڕاستەیەکی جیاوازی هەیە. ئەو شتەی لە بواری یەکەمدا لە بواری زانستییەوە سەرنجمان دەبزووێنێت لەبیرچوونەوەیە و لە بواری دووەمدا پاراستنی بیرەوەرییە، بەڵام هەڵسەنگاندنێکی تاڕادەیەک قووڵ پیشان دەدات، سەرباری بوونی ئەو جیاوازییانەی کە لە نێوان ئەو دوو دیاردەیەدا لە بواری دۆخە دەروونییەکان و درێژایی ماوە دەبینرێت، هەندێ هاوشێوەیی خۆی دەردەخات، کە گرنگی جیاوازییەکان زۆر کەم دەکاتەوە. لە هەردوو بوارەکەدا مەسەلەی سەرەکی بۆشایی زەینە، کە بیرەوەریی دروست بە زەیندا ناهێنێت، بەڵکوو شتێکی تری جێگر

دەکات. لە بارەی لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکانەوە زەین کار دەکات، بەڵام ناوە جێگرەکان دەخاتە ڕوو. لە بارەی بیرەوەرییە داپۆشراوەکانەوە، کارتێکردن و هەستە گرنگەکانی تر لەبیر دەچنەوە. لە هەر دوو بوارەکەدا هەستی زانایی سەرنجمان ڕادەکێشێت کە تێکچوونێکی پێکهێنراو، کە شێوەکەی لەم و لەودا جیاوازە. ئێمە تێدەگەین کە لە کاتی لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکاندا، ناوە جێگرەکان ڕۆتینین، سەبارەت بە بیرەوەرییەکانی داپۆشراو تەنیا بە سەرسوورمانەوە لە خۆمان دەپرسین ئەو بیرەوەرییانە لە کوێوە سەرچاوە دەگرن. کاتێک شیکردنەوەی دەروونی دەتوانێت پیشان بدات، کە پێکهاتنی ناوە تایبەتەکان یان بیرەوەرییە جێگرەکان بە شێوەیەکی یەکسان ئەنجامی دەبێت، واتە بە یارمەتی جێگۆڕکێ سەرچاوەی وەرگرتووە لە وەبیرهێنانەوەیەکی ئاسایی جیاوازی نێوان دوو دیاردەدا: (لە بواری چۆنیەتی مادەکان و درێژەی کات و ئەو ناوەندەی کە دیاردەکان لەملا و لەولایدا گەشە دەکەن و دەنوێنن) ناوەڕۆکێکی هەیە، کە ئومێدەوارمان دەکات بتوانین بنەمایەکی گرنگ بدۆزینەوە، کە هەم بۆ لەبیرچوونەوەی ناوەکان و هەم بۆ بیرەوەریی بیرەوەرییە داپۆشراوەکان شیاوی پەسەندکردن بێت. دەکرێ ئەو بنەما گشتییە بەو شێوەیە بەیان بکرێت: ڕاوەستانی ئەنجامدان یان ئەنجامدانی کەموکورتداری وزەی چاکسازی زیاتر لەوەی زۆر جار بیری لێ دەکەینەوە پیشاندەری دەستێوەردانی هۆکارێکی مەبەستدار، یان ئاراستەدارە و دەبێتە هۆی دەرکەوتنی بیرەوەرییەک، یان هەوڵ دەدات لە بەرامبەر خۆنواندنیدا خۆڕاگری بکات.

بە بۆچوونی من مەسەلەی بیرەوەریی منداڵی ئەوەندە سەیر و گرنگە، کە دەبێ وەبیرهێنانەوەی چەند خاڵ بەوە تایبەت بکرێت. ئەو خاڵانە لەو ڕوانگانەی تا ئێستا پەسەند کراون زیاتر دەڕوات.

کۆنترین بیرەوەری سەردەمی منداڵی دەگەڕێتەوە بۆ چ تەمەنێک؟ تا ئەو ڕادەیەی من تێگەیشتووم لەو بوارەدا بەتایبەتی لە لایەن و.س هانری و پۆتونەوە ئەنجام دراوە و ئەنجامێکی وەهایان دەست کەوتووە و لەو بارەیەوە جیاوازی تاکەکەسی پەست لە ئارادا بووە. هەندێ کەس یەکەمین بیرەوەریی منداڵیان دەگەڕێننەوە بۆ تەمەنی شەش مانگی، بەڵام هەندێ کەسی تر هیچ ڕووداوێک لە ژیان پێش تەمەنی شەش، یان تەنانەت هەشت ساڵان وەبیر ناهێننەوە. ئەو جیاوازییانە هۆکارەکەی چییە و واتایان چییە؟ وا دیارە کۆکردنەوەی زانیاری و بەڵگەکان بە پشتبەستن بە "هەڵسەنگاندنی بیروڕا" لەو بوارەدا بەس نییە، بەڵکوو دەبێ ئەوە بە مەتەڵێکی سەیر دابنێین. زۆر جار لە بیر دەکەین کە منداڵێکی چوار ساڵان توانای چالاکی زەینی زۆری هەیە و ڕەنگە ژیانێکی سۆزداری زۆر ئاڵۆزی هەبێت و لە ڕاستیدا سەیرە هەموو ئەو دەرئەنجامە دەروونیانە کاریگەریی وەها کەمی لەسەر زەین داناوە. لەو ڕووەوە چۆن دەکرێت ئەو ڕاستیانە سەرباری کاریگەری سەیر و سەرووی ئاسایی کە هەیانە لە بیر چووبێتنەوە؟ کەواتە دەبێ بە ناچاری پەسەندی بکەین کە بیرەوەری (وەک چاکسازییەکی هەست) لەژێر کاریگەریی هەلومەرجی زۆر تایبەتدایە و توێژینەوەکانمان تا ئێستا نەیتوانیوە دیاری و دەستنیشانیان بکات. ئەو ئەگەرە لە ئارادایە کە لەبیرچوونەوەی منداڵی بۆ تێگەیشتن لە نەبوونەکان لەسەر بنەمای دوایین دەسکەتە زانستییەکان بنەڕەتی پێکهاتەی هەموو هێما دەروون ئازاربینیوەکانن ڕێگایەکی نوێمان بخەنە بەر دەست.

هەندێ لە بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵی، کە پارێزراون لە یادگەی تەواو شیاوی تێگەیشتندا دێنە بەرچاو، بەڵام هەندێکی تر سەیرن و ڕاڤەنەکراون. هەندێ لە هەڵەکان لە بارەی هەر کام لەو بابەتانەوە دەکرێ بە ئاسانی پێدابچینەوە. کاتێک بیرەوەرییە تاکەکەسییەکان

هەڵدەسەنگێنین و شییان دەکەینەوە بە ئاسانی تێدەگەین، کە هیچ جۆرە گەرەنتییەک بۆ ڕاستی و دروستییان بوونی نییە. هەندێ لە بیرەوەرییەکان بەبێ هیچ شک و گومانێک ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە، یان کەموکورتیان هەیە و یان لە بواری کات و شوێنەوە ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە. بۆیە ئاشکرایە جەختکردنی کەسانی تاقیکراوە لەسەر خاڵە، کە یەکەمین بیرەوەرییان بۆ نموونە دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی دووساڵان شیاوی متمانە نییە. ئێمە بە ئاسانی هەندێ ئەو مەبەستانە دەدۆزینەوە کە بوونەتە هۆی ئاڵوگۆڕی شێوە و جێگۆڕکێی ئەو ڕووداوانەی بوونەتە هۆی دروستبوونی بیرەوەرییەکان و لە هەمان کاتیشدا مەبەستەکان پیشان دەدەن، کە مەسەلەکە تەنیا لە هەڵە ساکارەکانەوە نییە کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زەینێکی نادروست، بەڵکوو لە سەردەمی دواییدا ژیان کاریگەری دەخاتە سەر وزەی پڕ توانای هێزی وەدەستهێنانەوەی بیرەوەرییەکانی منداڵی و پەروەردەی کردوون. ڕەنگە هەر ئەو وزانەیش بە شێوەیەکی گشتی وا بکات لە ساڵانی منداڵی تێنەگەین و دژواری بکات.

دەزانین بیرەوەریی پیاوێکی پێگەیشتوو هۆکاری دەروونیی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت و هەندێ کەس وێنەی دیتەنی وەبیر دێننەوە، ئەوانە ناوەڕۆکی بیرەوەرییەکانیان دیدەنین، بەڵام هەندێ کەسی تر بە دژواری دەتوانن تەنانەت چوارچێوەیەک لەو شتەی بینیویانە چاکسازی بکەن. لەسەر بنەمای "شارکۆ" ئەو جۆرە کەسانە بە پێوانەکردن لەگەڵ ئەو کەسانەی "دیتنین"، پێیان دەڵێین "بیستەنی" و "جووڵەیی". ئەو جیاوازییانە لە خەوندا ون دەبن، چونکە هەموومان زۆر جار بە وێنای دیتەنییەوە خەو دەبینین. دەکرێ بوترێت بۆ بیرەوەری منداڵیمان شایەتحاڵی هەمان "بەرەودواوەچوون" دەبین، کە لە خەوندا بوونی هەیە: واتە بیرەوەرییەکان ناوەڕۆکی دیدەنی و

وێناکردن لەخۆ دەگرن و ئەو کارەیش تەنانەت لەو کەسانەی کە بیرەوەری دەورانی دوایی ژیانیان لە هەر جۆرە هۆکارێکی دیتەنی بەتاڵە، پشتڕاست دەکاتەوە. لەو ڕووەوە بیرەوەرییە دیتەنییەکان نزیکی هاوشێوەیی بیرەوەری منداڵیی دەبێتەوە. هەموو بیرەوەرییەکانی منداڵیی خودی من بە گشتی ناوەڕۆکی دیدەنیان هەیە: ئەو دیمەنانەن کە بە شێوەیەکی وێناکردن دروست بوون و ئامادەکراون، ئەو دیمەنانە تەنیا دەکرێ لەگەڵ دیکۆری نمایشنامەیەکدا پێوانە بکەین. لەو دیمەنە ڕاستیانە یان ڕۆتینیانەی سەبارەت بە سەردەمی منداڵی خۆشمان، هەروەها وەک منداڵێک بە ڕووخسار و جلی ئەو سەردەمە دەردەکەوین. ئەو هەڵومەرجە سەرسووڕهێنەرە، چونکە پێگەیشتووی هاوشێوەیی دیتەنی لە بیرەوەرییەکانی لە بارەی ڕووداوەکانی دوایی ژیانیانەوەیە، ئیتر ئەو کەسە خۆی لە دیمەنەکەدا نابینێتەوە. چۆن دەکرێ پەسەند بکرێت لەو هەموو کاتەی کە منداڵ شایەتحاڵ یان بکەری کارەکانی بووە، سەرنجدانی لە بری ئەوەی بخرێتە سەر کارتێکردن و هەستە دەرەکییەکان بخرێتە سەر خودی خۆیان، بە تایبەتی ئەو کارەیش لەگەڵ هەموو ئەزموونەکانماندا ناکۆکە. بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو بابەتانە بە ناچار دەبێ قبوول بکەین ئەو شتانەی لە بیرەوەریی سەردەمانی منداڵیدا دەیدۆزینەوە لە ڕاستیدا پاشماوەی ڕاستەقینە نین، بەڵکوو دروستکراو و ئامادەکراوی دوایی ئەو پاشماوانەن و دروستکراو و ئامادەبوو لەژێر کاریگەری وزە دەروونییە جیاوازەکانەوە، کە لە دەورانی دواییدا کارتێکەر بوون ئەنجام دراوە. لەو ڕووەوە "بیرەوەرییەکانی منداڵی" بە شێوەیەکی گشتی واتای "بیرەوەریی داپۆشراو" لەخۆ دەگرێت و لە هەمان کاتدا شێوەیەکی سەروو ئاسایی بۆ بیرەوەریی منداڵی نەتەوەیەک دەدۆزێتەوە، ئەو بیرەوەری و ئەفسانانەی وەک دیمەن و وێنە نەخشێنراون.

به دڵنیاییەوە هەموو ئەو کەسانەی کاریان لەسەر دەروونیشکاری کەسانی جۆراوجۆر کردووە، نموونەیەکی زۆریان لە جۆری بیرەوەریی داپۆشراو کۆکردووەتەوە. هەروەها بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە نموونانە بەهۆی ناوەڕۆکی ئەو پەیوەندیانەی کە لە نێوان بیرەوەریی منداڵی و ژیانی دوایی تاکەکاندا هەیە پێشتر جەختمان لە سەر خاڵە کردەوە زۆر سەروو ئاسایی دێتە بەر چاو.

بۆ دۆزینەوەی بیرەوەریی داپۆشراو لە ناوەڕۆکی منداڵیدا، زۆر جار دەبێ سەرانسەری ژیانی ئەو کەسە لە بەرامبەر چاوی تاقیکەرەوەکاندا بڵاو بکرێتەوە. بە دەگمەن دەکری بیرەوەرییەکی منداڵیی جیاواز لە کۆمەڵێک جیا بکرێتەوە و بخرێتە ڕوو. ئێستایش نموونەیەکی زۆر سەیر لەو بوارە دەخەینە ڕوو:

"پیاوێکی گەنجی تەمەن بیستوچوار ساڵ لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە ئەو بیرەوەرییەی بە زەینی سپاردووە. ئەو لە باخێکی هاوینەهەواریدا لەسەر کورسییەکی بچووک لە پاڵ پووریدا دانیشتووە. پووری ئەلفوبێی فێر دەکات. جیاوازی نێوان m و n بۆ منداڵەکە دژوارە و داوا لە پووری دەکات چۆنیەتی ناسینی ئەو دوو پیتە و جیاوازییانی فێر بکات. پووری سەرنجی ئەو بۆ ئەو خاڵە ڕادەکێشێت کە m یەک چیلکە زیاتری لە n هەیە." ئێمە هیچ هۆکارێکمان لە بەردەستدا نییە تا نارەزایەتی دەرببڕین بۆ ڕاست و دروستی ئەو بیرەوەرییە، بەڵام واتای ڕاستەقینەی ئەو دیمەنە ماوەیەکی تر دەرکەوت، واتە کاتێک تێگەیشتین، کە دەتوانین ئەو بیرەوەرییە وەک خۆنواندنەوە (جێگرکردن)ـی سومبۆلیکی وردبینی منداڵانەیەکی تر لێک بدەینەوە: منداڵەکە بەو شێوەیەی لەو چرکەیەدا دەیویست فەرقی نێوان m و nبناسێت، ماوەیەکی تر هەوڵی دا تا لە جیاوازیی نێوان کوڕ و کچەکە تێبگات و ئارەزووی هەبوو لەو بوارەدا هەر ئەو پوورە

ڕێنوێنی بکات. لە ئاکامدا دۆزییەوە کە فەرقی نێوان کوڕ و کچ هەمان جیاوازییە کە لە نێوان کوڕ و کچدا هەیە، بەو واتایەی کە کوڕەکان شتێکیان زیاترە لە کچەکان، بیرەوەریی وانەی ئەلفوبێ کاتێک لە زەینیدا وریا بووەوە کە ئەو ناسینە بەدەست هاتبوو.

ئێستایش نموونەیەکی تر دێنینەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ دەورانی دووەمی منداڵی. ئەو نموونەیە پەیوەندە بەو پیاوە تەمەن چل ساڵەیەی کە لە ژیانی عاشقانەی خۆیدا ڕووبەڕووی نائومێدی و خەفەتێکی زۆر بووەتەوە. ئەو گەورەی نۆ منداڵ بوو و پڕوپاگەندەی دەکرد کاتێک بچووکترین خوشکەکەی لەدایک بووە پانزە ساڵ تەمەنی بووە، بەڵام هەرگیز ئاگای لە دووگیانی دایکی نەبووو. من بڕوام بە قسەکەی نەدەکرد بۆیە دیسانەوە بیری لە بیرەوەرییەکانی کردەوە و دەرئەنجام بە بیری هاتەوە کە لە تەمەنی یانزە یان دوانزە ساڵیدا ڕۆژێک دایکی بینی بوو، کە بەپەلە تەنوورەکەی خۆی لە بەرامبەر ئاوێنەکەدا دادەکەنێت. ئەمجارەیان بەبێ ئەوەی من تکای لێ بکەم بیرەوەرییەکەی تەواو (کامل) کرد و وتی ئەو ڕۆژە دایکم تازە گەڕابووەوە بۆ ماڵەوە و هەستی بە ئازاری چاوەڕواننەکراو دەکرد. بەهەرحاڵ، کردنەوەی "Aufbinden" قۆپچەکانی تەنوورەکەی لەو بوارەدا تەنیا بیرەوەرییەکی داپۆشراوە بۆ کاری زاوزێکردن "Entbindung"لێرەدا جۆرێک لە "پردی وتاری" لە ئارادایە و ئێمەیش لە نموونەکانی تردا شێوەی کەڵکوەرگرتنیان دەبینین.

ئێستایش دەمانەوێ بە هێنانەوەی نموونەیەکی تر پیشانی بدەین دوای هەڵسەنگاندنی شیکردنەوەی، بیرەوەرییەکی بە ڕواڵەت بێ واتا چ واتایەکی هەیە. کاتێک لە تەمەنی چلوسێ ساڵیدا سەرنجم خستە سەر پاشماوەی بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیم، دیمەنێکم بە بیر دێتەوە کە ماوەیەکی زۆر لەوەوبەر (تەنانەت هەمیشە بە گومانی من)

هەندێک جار لە ویژدانی هەستمدا پێک هات و هۆکاری باشیشم لە بەردەستدا بوو، کە ئەو دیمەنە پەیوەند بە تەمەنی سێ ساڵیم دابنێم. من خۆمم لە کاتی شیوەن و هاواردا دەبینیەوە و زڕبراکەشم کە بیست ساڵ لە من بچووکترە دەرگای سنووقێکی بچووکی بە دەستەوە گرتبوو کە لە بەردەممانددا بوو. لەپڕ دایکم بە لەش و لارێکی جوان و بەژن و باڵاوە هاتە ژوورەوە، گوایە لە بازار دەگەڕایەوە. من لەو دیمەنە تەنیا وێناکردنێکی دیدەنیم هەبوو، بەڵام نەمدەتوانی سەرباری ئەو دیمەنەیش لە واتاکەی تێبگەم. ئایا براکەم دەیویست دەرگای سندووقەکە بکاتەوە یان دایبخات (لە یەکەمین وەسفکردن لە دیمەنی کۆمیدیکدا لەبری سنووقێکی بچووک)؟ چ پەیوەندییەک لە نێوان کاری براکەم و هاتنەوەی دایکمدا هەبوو؟ ئەوانە هەندێ پرسیار بوون کە وەڵامەکانیانم نەدەزانی و ئاراستەم کردبوو بۆ ڕاڤەکردنی ئەو دیمەنە وا بیر بکەمەوە کە مەسەلەکە فێڵێک لە لایەن براکەمەوە خراوەتە ڕوو و ئینجا بە گەیشتنی دایکم ناتەواو ماوەتەوە. زۆر جار بارودۆخێک بە بیر دێنینەوە، بەڵام ئەو بارودۆخە ناوەندگەرایی نییە و نازانین گرنگبوونی دەروونی بە چ هۆکارێکەوە پەیوەند بدەین، بۆیە واتای نادروست بەرامبەر بەو دیمەنانەی لە منداڵییەوە لە زەیندا ماونەتەوە پەیوەندیان دەکەین. لە ڕاستیدا کاتێک لە نەبوونی دایکم تێگەیشتم و زانیبووم کە ئەو لە سندووقە بچووکەیان لە کۆمیدییەکەدا گیری خواردبوو و بە شێلکاری داوام لە براکەم کردبوو دەرگاکەی بکاتەوە. کاتێک تکاکەی منی جێبەجێ کرد و دڵنیا بووم دایکم لە سندووقە بچووکەکەدا نییە دەستم کرد بە هاوارکردن. بە دوای ئەو ڕووداوەوە دایکیشم لە ڕێگاوە گەیشت و نیگەرانی و خەفەتەکەم دامرکایەوە. بەڵام چۆن دەکرێت منداڵێک لە خەونەکانیدا سەبارەت بە دەورانی منداڵی لە زەینمدا وێنای "پەرستیارێکی منداڵ" زیندوو بکاتەوە کە بیرەوەری

تریشم لێی هەیە. بۆ نموونە ئەو خووی وابوو هانم بدات ئەو پارە وردانەی "سکە" وەک دیاری وەرم دەگرتن، هەمووی بێ ئەلاوئەولا بدەمێ، ئەو خاڵە وردە بەش بە حاڵی خۆی دەیتوانی بیرەوەرییەکی داپۆشراو بۆ ڕووداوەکانی دوایی دابین بکات. لەم ڕووەوە بۆ ئاسانکردنی کاری لێکدانەوەی بیرەوەری، لە دایکم لەبارەی ئەو پەرستیارەوە هەندێ پرسیارم کرد. دایکم زانیاریی زۆری لە بەردەستم دانا و ئاماژەی بەو خاڵە کرد کە ئەو ژنە فرتوفێلبازە لە کاتی خەواندنی بۆ زاوزێکردن تووشی دزی زۆر بووەتە لە ماڵی ئێمەدا و پاشان بە دوای شکاتی زڕبراکەم کار کێشایە دادگاییکردن. ئەو زانیارییانە لە ناکاو وەک دۆزینەوە و شایەتحاڵێک ئەو دیمەنەی زیاتر وەسفم کرد درککردنەکەی ئاسان کردەوە. ونبوونی ژنە پەرەستیارەکە لەو سەردەمەدا بەلامەوە بێبایەخ نەبووە و تەنانەت لە براکەمم پرسی بوو کە براکەم لەو نەبوونەدا ڕۆڵێکی هەبووە. براکەم وەڵامێکی نادیاری بە من دابوو (بە پێی ڕەفتار و خووی گاڵتەجاڕی) وتبووی کە ئەو "زیندانی"یە. من وەڵامەکەم بە وەڵامێکی مندالانە لێک دایەوە، بەڵام ئیتر شتێکم نەپرسی بوو، چونکە پێموابوو لە مەسەلەکە تێگەیشتووم. ماوەیەکی تر کاتێک ماوەیەک دەبوو دایکم ماڵەوەی بەجێ هێشتبوو من تووڕە ببووم و دڵنیاببووم کە براکەم هەمان بەڵای بەسەریدا هێناوبوو کە بەسەر ژنە پەرەستیارەکەدا هێنابووی، لەو ڕووەوە بە پێداگرییەوەداوام کردبوو دەرگای سندووقەکە بکاتەوە. هەروەها ئێستا تێدەگەم بۆچی لە خۆنەواندنەکەدا دیمەنی دیتنی، لەشولاری دایکم سەرنجڕاکێش بوو. لە ڕاستیدا دایکم گوایە بە دوای ڕەستاخیزێکی ڕاستەقینەکەدا لە بەرامبەرمدا دەرکەوتبوو، چونکە من دوو ساڵ و نیو لە خوشکەکەم گەورەترم و خوشکەکەم ڕێک هەر لەو کاتەدا لەدایک ببوو و کاتێک من گەیشتبوومە تەمەنی سێ ساڵان زڕبراکەم ماڵی باوکی بەجێ هێشتبوو.

# بەشی پێنجەم

## هەڵەی زمانەوانی

هەرچەند لە وتوویژ و باسکردنەکاندا وادیارە، کە وشە باوەکانی زمانی دایکی لە بەرامبەر لەبیرچوونەوەدا پارێزراون، بەڵام لەو رووەوە بەکارهێنانیان زۆر جار تێکچوونێکی تر کاری تێدەکات و پێی دەوترێت "هەڵەی زمانەوانی". هەڵە زمانەوانییەکانی کەسێکی تەندروست وەک جۆرێک لە قۆناغی سەرەتایی "نەگونجاو وتن" وا دێتە بەرچاو کە لە هەلومەرجی زیانناسیدا دەردەکەوێت.

من ئیمکاناتی زۆرم لە بەردەستدایە بۆ توێژینەوەی ئەو دیاردەیە، چونکە دەتوانم لە نامەیەک یارمەتی وەربگرم کە "مرینگێر" و "مایێر" لە ساڵی ١٨٩٥ـی زایینیدا وەک "هەڵەی زمانەوانی و هەڵەی خوێندنەوە" بڵاویان کردووەتەوە. یەکێک لەو دوو توێژەرە، کە رۆڵێکی گرنگی لە دابینکردنی بەرهەمەکەدا هەبووە خۆی پسپۆری زمانە و بۆیە بە لەبەرچاوگرتنی مەسەلەکانی زمانناسی توێژینەوەی لەسەر هەندێ ڕێسا و نەریتی زمانەوانی کردووە، کە هەڵە زمانەوانییەکان لەوەوە سەرچاوە دەگرن. لەو چاوەڕێ بوون و لەو ڕێسایانەدا دەرئەنجامێکی وەها وەربگرێت: "جۆرێک میکانیزمی دەروونی، فۆنێتیکی یەک وشە و یەک ڕستە و تەنانەت خودی وشەکانیش بە شێوەیەکی تەواو تایبەت پێکەوە گرێدەدرێن و گرێدراوی دەکات".

نووسەرانی ئەو بەرهەمە، چەند نموونەیەکیان لە هەڵەی زمانەوانی کۆکردووەتەوە و بەتایبەتی بە بواری وەسفکردنەوە پۆلێنیان کردووە: سەراونوقم (بۆ نموونە میلۆ ڤینۆس لە بری ڤینۆس میلۆ)، پێشکەوتن

و دەستدرێژیکردنی یەک وشە یان بەشێک لە وشە لەسەر وشەی پێش خۆی، بۆ نموونە:

Es war mir auf der Schwest .... auf der Brust so schwer ...

کەسێک دەیویست بڵێت: "بارێکی وەها قورس لەسەر سنگمە"، بەڵام لەو وشەیەدا Schwest (قورس) تاڕادەیەک لەسەر وشەی پێشو واتە Brust سنگ دەستریژی کرد، داینا، درێژەی بێهوودەی وشەیەک، بۆ نموونە:

Ich fordere sie auf , auf das Wohl unseres chefs Aufzustossen.

(داوات لێ دەکەم بەختەوەری بەرپرسەکەمان لەناو بەرین، لەبری... بۆ بەختەوەریی بەرپرسەکەمان بخۆینەوە (Stossen)، ئالوودەبوون بۆ نموونە "er setzt sich auf den Hinter kopf" ئەو لەسەر پشتەملی دادەنیشێت") ئەو وشەیەی بەهۆی ئالۆدەبوونەوە، لە تێکەڵاوبوونی دوو ڕستەی لای خوارەوە پێک هاتووە:

(ئەو سەری بەرز دەکاتەوە er setzt sich einen Kopf auf).

پاشان

(ئەو لەسەر قاچی دواوەوەی بەرز دەبێتەوە er stelit sich auf die Hinterbeine).

جێگۆڕکێ ich gebe die Präparate in den Briefkasten

بۆ نموونە "من مەوادی ئامادەکراو لە سندووقەکەمدا دادەنێم" لەبری نووسەرانی بەو شێوازانە، چەند جۆرەی تر و کەم بایەختریان زیاد

کردووه (که به لامانەوە کەمێ نادیارە). ئەوان لە پۆلێنکردنەکانیاندا هەرگیز ئەو خاڵەیان لە بەرچاو نەگرتووە کە ئاڵوگۆڕ، جێگۆڕکێ یان تێکچوون و... هتد وەک دەنگ یان بەشەکانی وشەیەک، یان وشەکانی یەک ڕستە لەخۆ دەگرێت.

"مرینگێر" بۆ شرۆڤەکردنی چەند جۆر هەڵەی زمانەوانی کە هەڵسەنگێندراوە وا بیر دەکاتەوە کە دەنگە جۆراوجۆرەکانی زمان خاوەن بایەخی دەروونی جیاوازن. کاتێک عەسەبمان بۆ دەربڕینی یەکەمین دەنگی وشەیەک یان یەکەمین وشەی ڕستەیەک هان دەدرێت و ئەو هاندەرە عەسەبیانە هەوکات و یەکسان بەسەر یەکدا پێش دەکەون و هەندێ ئاڵوگۆڕ و لە ڕێ لادان پێک دێنن. هاندەری دەنگ کە توندبوونی دەروونیی زیاتر هەبوو بێت لەسەر دەرئەنجامی هاندەری عەسەبی، کە بایەخی پێش دەکەوێت یا پاش ئەوە دەرئەنجامەکە وەک خۆی سەقامگیر دەمێنێتەوە و لەم ڕووەوە یان وەک "پێشکەوتن" یان بە شێوەی "پس روند" تێکچوون دروست دەکات. بۆیە دەبێ گرنگترین دەنگەکانی یەک وشە بدۆزرێتەوە، مرینگێر دەنووسێت: "ئەگەر بمانەوێت بزانین کام وشە لە وشەیەکدا توندیەکی زیاتری هەیە، هەر ئەوەندەی بەسە کاتێک بەدوای وشەیەکی لەبیرکراودا، بۆ نموونە بە دوای وشەیەکدا دەگەڕێین لە دۆخی خۆماندا بە وردی سەیری بکەین. یەکەمین دەنگێک کە دەیدۆزینەوە هەمان دەنگە کە پێش لەبیرکردن زیاترین خێرایی هەبووە". "بۆیە گرنگترین دەنگەکان، یەکەمین دەنگی بەشی سەرچاوە، یەکەمین دەنگی وشە و پیت یان ئەو پیتە دەنگدارانەن کە پاڵپشتن".

من ناڕازیم لە بەرامبەر ئەو تیۆرییە: یەکەمین دەنگی ناوێک، یەکێک لە گرنگترین لەبیرچوونەوەکانی یەکەمین دەنگێکە کە دێتە زەین، کەواتە ئەو ڕێسایەی مرینگێر ڕایگەیاندووە بایەخ و متمانەیەکی نییە. ئەگەر

کاتێک ئێمە بەدوای ناوێکی لەبیرکراودا دەگەڕێین، لە ڕەفتارماندا ورد ببینەوە، تێدەگەین زۆر جار وا بیر دەکەینەوە دەتوانین یەکەمین پیتی ئەو نـــاوە دەربـبـــڕین، بەڵام لە ســـەدا پەنجـــای بوارەکانـــدا ئەو پروپاگەندەیە ڕاست نییە. تەنانەت بە ئازایەتییەوە دەڵێم ئێمە زۆربەی کـات لە بـارەی یەکەمـین پیتـی ئەو نـاوە بێنیـنە سـەر زار. لە نموونەی Signorelliدا کە پێشتر باسمان لێوە کرد دوو ناوی جێگری دەنگی دەسپێک و دەنگی سەرەکی ناوی ڕاستەقینەیان لەخۆ نەگرتبوو، تەنیا کەم بایەخترین دەنگ، واتە elli، لە یەکێک لە دوو ناوی جێگر Botticelli دەست دەکەوێت. ناوە جێگرەکان پەیوەندییەکی کەمیان هەیە لەگەڵ دەنگی دەسپێکی ناوی لەبیرکراودا و نموونەی لای خوارەوە جەختکردنەوەیەکە بۆ ئەو پروپاگەندەیە.

ڕۆژێکیان هەستم کرد ناتوانم ناوی وڵاتێکی بچووک بە بیر بێنمەوە، کە مۆنت کارلۆ بەناوبانگترین شاری ئەوێیە. ئەو ناوە جێگرانەی بە مێشکمدا هات بریتی بوو لە: ئالبانی و مۆنتانگرۆ و کۆلیکۆ. وشەی مۆنتاگرۆ خیرا بووە جێگری وشەی ئالبانی و منیش تێگەیشتم کە بەشی "مۆن" لە هەموو ناوە جێگرەکاندا جگە لە دوایین ناو هەیە و بە زانینی ناوی شازادە "ئالبێر" بە ئاسانی توانیم ناوی لەبیرکراو واتە مۆناکۆ بدۆزمەوە، بەڵام لە بارەی ناوی کۆلیکۆ دەبێ بڵێم، ئەو ناوە تاڕادەیـەک زنجیـرەی دەنـگ و مۆسـیقای نـاوی "مۆناکۆ"ـی لە خۆ گرتووە.

ئەگەر قبـــووڵ بکەیـــن میکانیزمێـــک هاوشـــێوەی میکـــانیزمی لەبیرچـوونەوەی نـاوە تایبەتەکـان دەتوانێـت لەسـەر دیـاردەی هەڵە زمانییەکـان زاڵ بێـت، شـرۆڤەی ئەو جـۆرە هەڵانە ئاسـانتر دەبێـت. تێکچـوونی وتـاری کە لە هەڵەیەکـی زمانەوانیـدا دەردەکەوێـت لە قۆنـاخی یەکەمـدا ڕەنگـە بەهـۆی کـارتێکردنی دواخەرەوە یـان

پێشەکەوتنی بەشێک لە قسەکان یان ئەندێشەیەکی تر پێک بێت، کە ناوەڕۆکی ڕستە یان کۆمەڵێک ڕستەیە، کە مەبەستی دەربڕینیانم هەیە. هەموو ئەو نموونانەی کە لە لای سەرەوە لە مرینگێر و مایێر گێڕامەوە، دەتوانن لەو شێوەیە بن، بەڵام لە قۆناخی دواییدا تێکچوون دەتوانێت بە شێوەیەکی هاوشێوە ئەو شتەی لە نموونەیSignorelli بینیمان دەربکەوێت یان بە واتایەکی تر تێکچوون دەتوانێت سەرچاوەی لە کارتێکردنەکانی دەرەوە بێت، کە هیچ پەیوەندییەکی بە وشە و ڕستە یان کۆمەڵی قسەکردنەکانەوە نەبێت، واتە دەکرێ لە هەندێ مادە پێک بێت کە بە هیچ شێوەیەک مەبەستی دەربڕینیمان نییە، بەڵام کاریگەرییان لە زەینماندا بە شێوەی تێکچوون خۆی دەردەخات. خاڵی هاوبەش لە نێوان تێکچوونەکانی گرووپی یەکەم و دووەم هاوکات بوونی هاندانی دوو مادەیە، بەڵام جیاوازی نێوان ئەو دوو گرووپە لەوێوە سەرچاوە دەگرێت کە لە گرووپی یەکەمدا مادەی پەرێشانکەر لەناو وشەکە یان ڕستە یان قسە دەربڕاوەکاندا هەیە و لە گرووپی دووەمدا ئەو مادانە دەرەکین. هەڵبەت ئەو جیاوازییە بە تەواوی نایەتە بەرچاو و پێموایە دەبێ ئەوە لە بەرچاو نەگیرێت تا لە بارەی ڕواڵەتناسیی هەڵەی زمانەوانی هەندێ ئەنجام بەدەست بێت. خۆ ڕوونە تەنیا نموونەکانی گرووپی یەکەم ئەو دەرئەنجامانە بە ڕەوا دادەنێن کە بوونی میکانیزمێک، یان دەنگ و وشەکان پێکەوە گرێ دەدات و کاریگەری پەرێشانکەر لە نێوانیاندا ئاسان دەکاتەوە. بە واتایەکی تر ئەو دەرئەنجامەیش لە توێژینەوەی تەواوی زمانناسانەی هەڵە زمانەوانییەکان بەدەست دێت، بەڵام لەو بوارانەدا کە مادەیەک لە دەرەوەی ڕستە یان باسەکەمان دەبێتە هۆی دەرکەوتنی تێکچوون، ئێمە پێش هەموو شتێک دەبێ ئەو مادەیە بناسین و مەسەلەکە لێرەدایە کە ئایا میکانیزمی وەها تێکچوونێک دەتوانێت یاسا ناچارییەکان لە پێکهاتنی زمان بەسەر ئێمەدا ئاشکرا بکات؟



CS CamScanner

دەبێ بێ لایەنانە ئاگاداری بدەم کە مرینگیر و مایەر ئەگەری تێکچوونی وتارییان دەستنیشان کردووە بەهۆی "کاریگەریی دەروونی ئاڵۆز" لە لایەن مادەی دەرەوەی وشە یان ڕستە یان ئەو قسانەی کە دەمانەوێت دەریانببڕین. ئەوانە بە پێویست تێگەیشتن کە تیۆریی بایەخی دەروونیی نایەکسانی دەنگەکان بە شێوەیەکی براوە و تەواو تەنیا بۆ شرۆڤەی تێکچوونی فۆنیتیک (لەحن) و پێشکەوتن و کارتێکردنی پس روند بەکار دێت، بەڵام چونکە تێکچوونی وشەکان بۆ نموونە لە بارەی جێگربوون و ئاڵوودەبوونی وشەکانەوە ناکرێ تەنیا سنووردار بکرێت بە تێکچوونی فۆنێتیکەوە. ئەو دوو توێژەرە بەبێ پێش دادوەریکردن بەدوای هۆکاری هەڵەی زمانی دەرەکی لە وتاری مەبەست گەڕان و دۆخی ئەو جۆرە بوارانە بە یارمەتی نموونەی زۆر سەیر پیشانیان دا. نموونەکانی لای خوارەوە لە کتێبەکانیان دەگێڕینەوە.

لاپەڕەی ٦٢: "ڕۆ.٧٧ باسی لەو شێوازانەی دەکرد کە بە ناوەڵناوی "پیس (Schweinereien)" لێکی دابووەوە، بەڵام دەیویست وشەیەکی گونجاوتر بەکار بهێنێت. کەوابوو بەو شێوەیە دەستی پێ کرد:

"Dann sind aber Tatsachen zum Vorschein gekommen"

(ئەوسا ڕووداوەکان ئاشکرا کران).

من و مایێر ئامادەبووین و "ڕۆ" جەختی لەسەری کردەوە، کە لە کاتی دەربڕینی دوایین ڕستە بیری لە وشەی "پیس" کردووەتەوە. هاوشێوەیی لە نێوان وشەکانی Vorschein و Schweinereien کارتێکردنی وشەی دووەم لەسەر وشەی یەکەم و هەروەها ئاڵوگۆڕی شێوەی وشەی یەکەم لەژێر کاریگەریی وشەی دووەم

شرۆڤە دەکات".

لاپەڕەی ٧٣: "وێنەی وتاری "هاتوچۆ" یان "جوولەدار" وەک ئالۆدەبووەکان و ڕەنگە زیاتر لەوانەیش لە جێگۆڕکێدا ڕۆڵی بەرچاو دەگێڕن. هەرچەند ئەو وێنانە لەژێر سایەی ویژدانی هەستدا دانراون، بەڵام دیسانەوە بە ڕادەی پێویست نزیکن و دەتوانن بە شێوەیەکی کاریگەر کار بکەن. ئەو وێنانە بە یارمەتی هاوشێوەبوونێکەوە، کە لەگەڵ بەشێک لە ڕستەیەکدا هەیانە دەچنە ناو ڕستەکە و دەبنە هۆی ئەو لادانە یان لەگەڵ زنجیرەی وتاریی "هاتوچۆ" یان "جوولەدار" زۆر جار پاشماوەی هێشتا زیندووی وتارین کە تازە کۆتاییمان پێ هیناوە. (کارتێکردنی پس روند).

لاپەڕەی ٩٧: "ئەو ئالوگۆڕەی کە بە دوای هاوشێوەییدا ئەنجام دەدرێت بەهۆی بوونی وشەیەک وەک -لەژێر سایەی ویژدانی نەست- ئاسان دەکرێتەوە. ئەو وشە هاوشێوەیە وشەیەکە نەدەبوا دەربڕڕایە، لە جێگربووندا هەمان ڕووداو ڕوو دەدات. ئومێدەوارم کە هەڵسەنگاندنی دووبارە بتوانێت ئەو ڕێسایانەی کە دیاریم کردوون جەختی لە سەر بکەنەوە، بەڵام بەو مەبەستە پێویستە کاتێک کەسێک قسە دەکات بە تەواوی تێبگەین لە کاتی قسەکردندا بیر لە چ شتێک دەکاتەوە. لەو بوارەدا نموویەکی ئەزمووندار دێنینەوە: کاک "لی" لە کاتی قسەکردندا لە بارەی ژنێکەوە دەیویست بڵێت ئەو ژنە دەیترسێنێتSie würde mir Furcht einjagen، بەڵام لە بری وشەیeinjagen ئەم وشەیەی بەکار هێنا enlagen کە واتایەکی زۆر جیاوازی هەیە. جێگۆڕکێی وشەی j لەگەڵ پیتی l بە بۆچوونی من شیاوی ڕاڤەکردن نەبوو، بۆیە ئیجازەم بە خۆم دا سەرنجی کاک لی. بۆ لای هەڵەکەی ڕابکێشم. ئەو خێرا وەڵامی دایەوە: هەڵەکەم لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە لە کاتی قسەکردندا بیرم دەکردەوە

ئەو دەسەڵاتەم نییە کە ich wäre nicht in der lage.
"نموونەیەکی تر: من لە ئار. وی. سین پرسیم بارودۆخی ئەسپەکەت
چۆنە. ئەو وەڵامی دایەوە: "Ja , das drautvʌ ... dauert
vielleicht noch einen Monat" ڕەنگە دیسانەوە یەک مانگ
بخایەنێت) وشەی "draut" بە یەک R بە ڕای من پەسەند ناکرێت،
پیتی R لە وشەی دروستدا dauert ناتوانێت کاریگەرییەکی وەهای
هەبوو بێت. من سەرنجی کاک ئار. وی. سینم بۆ ئەو خاڵە ڕاکێشا و
ئەویش خێرا شرۆڤەی کرد کە لە کاتی قسەکردندا بیری لەوە
دەکردەوە:

"das ist eine traurige Geschichte" (چیرۆکێکی خەفەتاوی
بوو) بۆیە ئەو بیر لە دوو وەڵام کردبووەوە کە تێکەڵاوی یەک ببوون
لە تێکەڵاوبوونی دوو وشەی dauert و traurige draut
سەرچاوە دەگرێت.

خوێنەر بە ئاسانی تێدەگات کە تێگەیشتنی مرنگێر و مایێر بەهۆی
تیۆریی وێنە وتارییەکانی "جووڵەدار"، کە لەژێر سایەی ویژدانی
هەستدان و کەسەکەیش مەبەستی دەبڕینیانی هەیە و هەروەها
بەهۆی جەختکردنەوەی دوو نووسەرەوە وەک پێویستییەک بۆ
تێگەیشتن لەو شتەی کەسی تاقی بوو لە کاتی قسەکردندا بیری لێ
دەکاتەوە، بە شێوەیەکی سەیر هاوشێوەی دەروونشیکاریی ئێمەیە.
ئێمەیش بە هەمان شێوە بە دوای ناوەڕۆکی نەستەوەین بەو
جیاوازییەی کە ئێمە ڕێگایەکی درێژخایەنترمان هەڵبژاردووە: خاڵی
دەسپێکی کارەکانمان ئەو بیرکردنەوانەن کە کاتێک لە کەسی تاقی
کراوە پرسیار دەکەین بە زەینیدا تێپەڕ دەبن، ئەوسا ئێمە لە نێوان
زنجیرە وەبیرهێنانەوەی ئاڵۆزێکدا ناوەڕۆکێکی پەریشانکەر
دەدۆزینەوە.

مـن ئێسـتاکە تایبەتمەنـدییەکی سـەیریتر لە بەرچـاو دەگـرم، کە نموونەکانی مرینگێر شایەتحاڵن لەسەری. بە ڕای مرینگێر ئەو شتەی ئیجـازە دەدات ئەو وشـەیەی نەماندەویسـت بەسـەر زاری بێنـین بە گـۆڕینی شـێوەکەی و تێکەڵبـوونی تێکچـوون یـان تێکەڵاوبـوونی ئـاڵوودەبوون بەسـەر زەینمانـدا زاڵ بێـت، هاوشـێوەیی لە نێوان ئەو وشـەیە و وشـەیەکی تـر لە ڕستەیەکە کە دەمانویست بەسـەر زاری بێنین.

بۆ نموونە:

Lagen – jagen; dauert traurig ; Vorschein – Schwein.

هەرچەند من لە کتێبی لێکدانەوەی خەونەکاندا بە تەواوی پیشانم داوە کە کـاری تـێکەڵ بـوون بە پێـی ئەندێشـە شـاراوەی خەونەکـان لە پێکهاتەی ئەو شتەی پێی دەڵێین ناوەڕۆکی ئاشکرای خەونەکان، چ کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە. هاوشێوەبوون لە نێوان دوو شتدا، یان لە نێـوان خۆنوانـدنەوەی وتاریـدا دوو دۆخ لە دۆخەکـانی نەسـت، پاڵپشـتێک دابـین دەکـات تـا خۆنەوانـدنەوەیەکی سـێیەم پێـک بێـت، خۆنەوانـدێنێکی تـێکەڵاوی (دووجۆربـوون)، یـان ئـاڵوودەبوون کە لە ناوەڕۆکی خەونـدا دەبێتە جێگری دوو دۆخی پێکهێنەری خـۆی. ئەو خۆنەوانـدنەوەی سـێیەمە بەهـۆی پرەنسـیپ و ئەو سـەرچاوەیەی هەیەتـی زۆر جـار تایبەتمەنـدییەکی دژبە یەک لەخـۆ دەگرێـت و لەو ڕووەوە شێوەکە دەردەکەوێت. لەو ڕووەوە جێگری و ئاڵوودەبوون لە هەڵە زمانەوانییەکاندا دەتوانن دەسپێکێک بن بۆ کاری تێکەڵبوون و تێکەڵبوون لە پێکهاتەی خەونەکاندا ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان هەیە.

لەو بابەتەیدا کە "مرینگێر" بۆ ئاگاداری خەڵک بە چاپی گەیاند و ناوی "چۆن تووشی هەڵەیەکی زمانەوانی دەبین"ی لەسەر دانابوو، نووسەر واتای پراکتیکیی جێگربوونی وشەکانی لە هەندێ شوێن و بەتایبەتی

لەو بـوارانەی کە وشـەیەکی دژ دەبێـتە جێگـری وشـەی سـەرەکی ئاشکرای کرد. "ئێمە هێشتایش لە بیرمان دێت کە سەرۆکی پەرلەمانی لیژنەی نەتەوەی نەمسا چۆن کۆبـوونەوەی ڕۆژێکی بە وتنی ئەو وشانە دەست پێ کرد: "براکانم من ئێستا دەبینم ڕێژەیەکی زۆر لە نـوێنەران لێـرەدا ئامـادەن و بـۆیە کۆتـایی کۆبـوونەوە ڕادەگەیەنـم". دەنگی پێکەنینێک کە شـوێنەکەی گرتەوە خێرا سـەرنجی سـەرۆکی پەرلەمانی ڕاکێشا بۆ لای هەڵەکەی و ئەویش هەڵەکەی چاک کردەوە. شیاوترین شرۆڤە بۆ قبوولکردنی ئەو هەڵەیە دەتوانێت بەم شێوەیە بێت: سەرۆکی پەرلەمان لە ناخەوە ئارەزووی هەبوو کە دەرئەنجام بتوانێـت کۆتـایی ئەو کۆبـوونەوەیە ڕابگەیەنێـت، چـونکە لەو کۆبوونەوەیەدا چاوەڕێی هیچ دەرئەنجامێکی دڵخۆشکەر نەبوو. لەو ڕووەوە بەو شێوەیەی زۆر جار ڕوو دەدات ئەندێشـەی پەیوەند بەو ئارەزووە بۆ دەربڕینی ئارەزووەکانی لانی کەم بە شێوەی وردەکاری کـارلێکەر بـوو و ئەوی هـان دا لەبـری وشـەی "دەسـپێک" وشـەی "کۆتایی" واتە ڕێک دژی وشەی گونجاو بەکاری بهێنێت. توێژینەوەی زۆر پیشـانیان داوە کە جێگـۆڕکێی وشـەیەک لەگـەڵ وشـەی دژ بە خۆیـدا دیـاردەیەکی زۆر بـاوە. وشـە دژ بە یەکەکـان لە ویژدانـی وتاریماندا وەبیرهێنانەوەیەکی چڕوپڕیان هەیە، لە شوێنی زۆر نزیک بە یەکتر دانراون و هەر کامەیان بە ئاسانی ئەویتر دەکاتە مێشک".

بەڵام لە هەمـوو بوارەکانـدا بەو ئاسـانییە (کە مرینگێـر نمـوونەی سەبارەت بە سەرۆکی پەرلەمان شی دەکاتەوە) ناکرێ پیشان بدرێت کە هەڵەی زمانەوانی دەرەنجام لە جێگۆڕکێی وشە لە ڕێگای وشـەی دژبەیەکی خۆی لە دژایەتییەکی ناوەکی لەگەڵ واتـای ڕسـتەییدا کە دەمانەوێت یان دەبێ بیڵێین سەرچاوە دەگرێت. ئێمە بە شیکردنەوەی نموونەی aliquis میکانیزمێکی هاوشێوە دەدۆزینەوە، لەو نموونەیەدا دژایەتـی نـاخ لەگـەڵ لەبیرچـوونەوەی ناوێـک دەرکەوتبـوو نەک بە

جێگۆڕکێکردنی وشەیەک لە ڕێگای وشەی دژ بە خۆی کە لە نێوان وشەی 'دەسپێک' و 'کۆتایی'دایە و درێژەی پێ دەدەین کە وشەی 'دەسپێک' بە ڕادەیەک باوە کە بێگومان لەبیرکردنی ئەوە دەگری بە پێشهاتەیەکی تایبەت دابنرێت.

دوایین نموونەکانی 'مرینگێر' و 'مایێر' پیشان دەدات، کە دەنگەکان یان وشەکان (کە بە شێوەی پێشکەوتن یان دواخەرەوە کار دەکەن)، دەتوانن ئەو ڕستەیەی کە دەمانەوێت بێینە سەر زار تێکی بدەن یان ئەو وشـــانەی بەشـــێک لەو ڕســـتەیە نـــین و لە دەرەوەی ئەو ناوەڕۆکەدان و شێوەی هاندانیان تەنیا بە پێکهاتەی هەڵەی زمانەوانی دەردەکەوێت دەبێتە هـۆی تێکچوونی وتاری، ئەو تێکچوونانەی کە پێیان دەڵێین هەڵە زمانەوانییەکان. ئینجا پێمان خۆشە بزانین ئایا ئەو دوو گرووپە هەڵە زمانەوانییە بە شێوەیەکی ئاشکرا و بڕواوە شیاوی جیابوونەوەن یان نا؟ ئەگەر وەڵامەکەیش پۆزەتیڤ بێت دەمانەوێت بزانین بینینی بـوارێکی تـایبەت، کام یەک لە هێماکان پەسـەند دەکەن ئنجا بڵێن ئەو هەڵە زمـانەوانییە بەم گرووپە یان ئەو گرووپە گرێ دراوە.

'وۆنـت' لە کتێبـی 'دەروونناسـیی نەتەوەکـان'دا لە کـاتی گەڕان بـۆ دۆزینەوەی یاسـاکانی بڵاوبوونەوەی زمانەوانی کاری کردووە و لە بارەی ئەو هەڵانەوە هەندێ بیروبۆچوونی دەربڕیوە کە خراپ نییە سەرنجیان بدەین. بە ڕای ئەو هەڵە و دیاردە هاوشێوەییەکان هەرگیز بەتـاڵ نـین لە کـاریگەریی دەروونـی، ئەو دەنووسـێت: 'هەلـومەرج لە سەرەتاوە پۆزەتیڤ بوو، واتە دەنگە وتراوەکان دەبنە هۆی دەربڕینی ئازاد و لەناکاوی وەبیرهێناوەی فۆنێتیک و وتاری، بەڵام لە پاڵ ئەو هەلـــومەرجە پۆزەتیڤـــانەدا هەلـــومەرجی نێگەتیڤـــیش هەیە و ئەو هەلومەرجانەیش وەک شێوازە کارکردنێکی ئیرادی کار دەکەن. ڕەنگە

گایەی وەبیرهێنانەوە بە چەندین شێوە خۆی دەربخات: دەنگێک دەتوانێت بە پێشکەوتن دەربېردرێت یان دەنگەکانی پێش خۆی دیسانەوە دابین بکات، ئەو دەنگەی کە کەسەکە خووی پێوە گرتووە بۆ دەربڕینی دەتوانێت لەناو دەنگەکانی تردا شوێنی خۆی بگرێت و بەهەرحاڵ، وشە زۆر بێگانەکان لەگەڵ ناوەڕۆکی ڕستەدا کە ئەوەیش لەگەڵ ئەو دەنگانەی کە کەسەکە مەبەستی دەربڕینیانی هەیە پەیوەندییەکی وەبیرهێنانەوەیان هەیە، دەتوانن کارلێکەرییەکی شلەژێنەر لەسەر ئەو دەنگانەدا دابنێن. بەڵام چۆنیەتیی کارتێکردن بە هەر شێوەیەک بێت تەنیا جیاوازیی بەرچاو بە هەر شێوەیەک بۆ بەربڵاوی و ئاراستەدانی وەبیرهێنانەوەکانە کە پێک دێن و بە هیچ شێوەیەک پەیوەند ناکرێت بە تایبەتمەندی گشتگیرییان. تەنانەت لە هەندێ بواردا بۆ دەستنیشانکردنی گرووپێک کە دەبێ تێکچوونیان تیا دابنێین ڕووبەڕوویی کێشەیەکی گەورە دەبینەوە و لە خۆمان دەپرسین ئایا زیاتر لەسەر بنەمای ڕاستی نییە؟ ئەگەر ئەو تێکچوونە –بە گوێرەی هۆکاری ئاڵۆز– گرێی بدەین کاریگەری هاوکات و تێکەڵاویی چەند هۆکارە؟"

دەرخستەکانی "وۆنت" بە تەواوی مافدار و زۆر ئەزموونندار دێتە بەرچاو. بە بۆچوونی من زیاتر جەخت بکرێتە سەر ئەو خاڵەی کە ئەو تەنیا ئاماژە بەوە دەدات: هۆکارێکی پۆزەتیڤ کە یارمەتیدەرە بۆ هەڵەی زمانەوانی بەرەوپێشچوونی ئازادانەی وەبیرهێنانەوەکانە و هۆکاری نێگەتیڤ سستبوونی کاری ڕاوەستێنەری سەرنجدانە. ئەو دوو هۆکارە هاوکات پێکەوە کار دەکەن بە شێوەیەک کە دەتوانین ئەو دوانە بە ناسێنەری دوو مەرجە دەرئەنجامێکییەکە دابنێین کە هەردووکیان بە یەک ئەندازە پێویستن. لە ڕاستیدا بە دوای سستبوونی کاری ڕاوەستێنەری سەرنجدا، یان با وردتر بڵێین بەهۆی ئەو سستبوونەوەیە کە ڕەوتی ئازادانەی وەبیرهێنانەوەکان ئەنجام

دەدریت.

لە نێوان نموونەکانی هەڵەی زمانەوانیدا کە کۆم کردوونەتەوە تارادەیەک نموونەیەک نادۆزمەوە کە تیایدا تێکچوونی زمانەوانی بتوانرێت بە گشتی و بەتایبەتی بەو شتە دابنێین، کە وۆنت ناوی "کارتێکردنی تەنیشتی دەنگەکان"ی لەسەر دادەنێت، بزانرێت. من جیا لە "کارتێکردنی ئەو تەنیشتە"، "کارتێکردنێکی شڵەژێنەر" دەدۆزمەوە کە سەرچاوەکەی لە دەرەوەی ئەو وتارەی کە دەمانەوێت دەریببڕین، دانراوە و ئەو مادە شڵەژێنەرە پێکهاتووە لە:

أ- ئەندێشەیەکی یەکە و نەست سەرباری ئەوەیش لە ڕێگای هەڵەی زمانەوانییەوە دەردەکەوێت و زۆر جار تەنیا پاش شیکردنەوەی قووڵ دەگاتە ویژدانی هەست.

یان

ب-هاندەرێکی دەروونی گشتگیرترە، کە جیاوازی هەیە لەگەڵ کۆی قسەکاندا.

١- جارێکیان بینیم کچەکەم کاتێک گازی لە سێوێک دەگرت جووڵەیەکی ناشیرینی لە خۆیدا نواند، من پێکەنیم و ویستم دێڕەکانی لای خوارەوە لەبەر بخوێنمەوە.

Der Affe gar possierlich ist

Zumal wenn er vom Apfel frisst

بەلام بەم شێوەیە دەستم پێ کرد Apfel Der، وا دیارە ئەو هەڵەیە لە دەرئەنجامی دوو وشەی Apfel و Affe ـەوە بێت (تێکەڵاوبوونی ئاڵوودەبوون) یان دەکرێ وەک پێشکەوتنی وشەی Apfel کە دەبوا دوای چرکەیەک لە ڕستەکەدا دەربکەوتبا لە بەرچاو بگیرایە. بەلام

هەلومەرجی ڕێکی هەڵە وەها بوو، من جاری یەکەم بەبێ ئەوەی تووشی هەڵەیەکی زمانەوانی بم دەرمبڕی بوو و تەنیا کاتێک دیسانەوە ویستبووم ئەوانە بگێڕمەوە تووشی هەڵە بووم و خۆم ناچار بینی، کە دەربڕینی دێڕەکان سەرلەنوێ بڵێمەوە، چونکە کچەکەم کەسی بەرامبەرم بوو، دەستی بە کارێکی تر کردبوو و قسەکەی منی نەبیستبوو. ئەو دووپاتبوونەوەیە و هەروەها هەستی تەحەمولنەکردنم بۆ کۆتایی هێنان بە دێڕەکان بە دڵنیاییەوە دەبێ لە ڕیزی هۆکارەکانی هەڵەی زمانەوانی دابنرێت و ئەو هەڵەیەش لە ئاکامدا بە هەڵەیەک دەژمێردرێت کە بەهۆی تێکەڵبوونەوە دروست دەبێت.

٢- کچەکەم وتی: "دەمەوێ نامەیەک بۆ ماڵی "شریزینگێر" Schresinger بنووسم (schreibe der Frau ich) schresinger)، بەڵام ژنی مەبەست ناوی "شلێزینگێر "Schlesinger" بوو. بە دڵنیاییەوە ئەو هەڵە زمانەوانییە لەو ئاراستەبوونەی کە ئێمە بۆ ئاسانترکردنی وتنی وشەکان هەمان سەرچاوە دەگرێت. بۆ ئەو بوارە تایبەتە پیتی L لە ناوی Schlesingerڕەنگە دوای پیتی R و هەموو وشەکانی پێشوو (schreibe der Frau)) بۆ هێنانە سەر زار سەخت بووە. بەڵام دەبێ زیادی بکەم کە کچەکەم ڕێک چەند چرکە دوای ئەوەی کە من لە بری Affe وشەی Apfe م بەکار هێنا تووشی ئەو هەڵەیە بووم. چونکە هەڵە زمانەوانییەکان وەک لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکان لەوپەڕی پلەی درمبووندان، مرینگێر و مایێر جەختیان لەسەر ئەو تایبەتمەندییە کردووەتەوە. هەڵبەت من لە بارەی ئەو درمە دەروونییەوە ناتوانم هیچ شرۆڤەیەک بدەم.

٣- لە سەرەتای دەسپێکی یەکجار چارەسەری، یەکێک لە

نەخۆشەکانم دەیویست بڵێت: من وەک چەقۆیەکی کۆنترۆڵدار دەچمە ناخی خۆمەوە wie ein Taschenmesser بەڵام لەبری Taschenmesserوشەی Tassenmescher م -بە جێگۆڕکێی فۆنێتیکەکان- دەربڕی، چونکە ڕاڤەیەکی ڕازیکەرم بۆ ئەو هەڵەیە نەدۆزییەوە، بە ناچاری سەرچاوەکەیم بە سەختبوونی وتنی وشەکە دانا و بەو شێوەیە سەرنجی نەخۆشەکەم بۆ لای ئەوە ڕاکێشا. ئەو ژنەیش خێرا وەڵامی دایەوە: "ئاخر تۆیش لە بری وشەی Ernst وشەی Ernscht ت بەکار هێنا". لە ڕاستیدا چونکە ئەو ڕۆژە دوایین ڕۆژی چارەسەرکردنی ژنە نەخۆشەکە بوو لە پێشی پێشەوە بوو، من کاتێک ئەو هاتبووە ناوەوە وتبووم: "ئەمڕۆ چارەسەرەکەمان جدی (Ernst) دەبێت. هەڵبەت بە گاڵتەوە وشەی Ernschtم لە بری وشەی Ernst هێنابووە سەر زار. لە کاتی چارەسەریدا نەخۆشەکەیش تووشی هەڵەی زمانەوانیی تر بوو. من دەرئەنجام تێگەیشتم ئەو تەنیا مەبەستی لاساییکردنەوەی منی نییە، بەڵکوو لە ویژدانی نەستیدا بە چەند هۆیەکی تایبەت نە لەسەر وشەکە، بەڵکوو لە سەر ناوە تایبەتییەکە Ernst یان Ernscht ئەرنیست جەختی لەسەر دەکاتەوە.

٤- هەر ئەو نەخۆشە دەیویست بڵێت: "من ئەوەندە هەڵامەتمە کە ناتوانم لە لووتەوە هەناسە هەڵمژم"، بەڵام لەبری شێوەی دروستی ڕستەکە: durch die Nase atmen هەناسەدان لە ڕێگای لووتەوە تووشی هەڵەی زمانەوانی بوو و وتی: durch die Ase natmen ئینجا خۆی خێرا دەستی کرد بە ڕاڤەکردنی ئەو هەڵەیە و وتی: من هەموو ڕۆژێک لە شەقامی هاسین ئەرستراس Hasenauerstrasseسواری تراموا دەبم و ئەمڕۆ سەرلەبەیانی کاتێک چاوەڕێی تراموا بووم بە خۆمم وت "ئەگەر من کەسێکی فەرەنسی بوایەم ناوی شەقامەکەم بەبێ پیتی (H) دەخوێندەوە،

واتە Asenauerstrasse، چونکە فەرەنسییەکان هەرگیز پیتی H ناهێننە سەر زار". پاشان باسی هەموو ئەو فەرەنسیانەی کرد کە دەیانیناسی و پاشان لە قسە و باسی زۆر بە بیری هاتەوە کە لە تەمەنی ١٤ سالیدا لە نمایشنامەی کورمارکێر و پیکاردا ڕۆڵی "پیکارد"ی لە ئەستۆدا هەبووە و بەهۆی ئەوەی ڕۆڵەکەی بە هەڵەی زمانی ئەڵمانی هێناوەتە سەر زار. ئەو شتەی بووە هۆی دەرکەوتنی ئەو زنجیرە بیرەوەرییان نیشتەجێبوونی زۆر بە ڕێکەوتی فەرەنسییەک بوو لە ماڵی ئەودا. لەو ڕووەوە جێگۆڕکێی دەنگەکان وەک دەرئەنجامی تێکچوونێک دەهاتە پێش چاو، کە ئەندێشەی ئەست هۆکاری ئەوە بوو و ئەو ئەندێشەیەیش بە هیچ شێوەیەک هیچ پەیوەندییەکی بە ناوەڕۆکی بابەتەکەوە نەبوو.

٥- میکانیزمی هەڵەی زمانەوانی نەخۆشێکی تر کە دەیویست بیرەوەرییەکی زۆر دوور لە منداڵیی بگێڕێتەوە هاوشێوەی هەمان میکانیزمە. ئەو لە پڕێکدا تووشی بۆشایی بوو و نەیتوانی ناوی بەشێک لە جەستە بە تەواوی بهێنێتە سەر زار. دوای ماوەیەک لەگەڵ ڕەفیقێکیدا لە بارەی هاوینەهەواردا قسەی دەکرد و کاتێک ڕەفیقەکەی پرسی: "ماڵی کاک م. لە کوێیە؟ ئەو لە بری ئەوەی بڵێت: لە لێژایی شاخدایە (Berglehne) وەڵامی دایەوە: لە لای شاخەکە (Berglende).

٦- یەکێکی تر لە نەخۆشەکانم لە کۆتایی چارەسەرکردنی دەروونشیکاریدا کاتێک پرسیم: "دۆخی مامت چۆنە؟" وەڵامی دایەوە: "نازانم، چونکە من تەنیا ئەو لە کاتی تووشبوون بە تاواندا in flagranti دەبینم. ئنجا سبەی شەو پێی وتم: "بە ڕاستی شەرمەزارم لەو وەڵامە ناعاقڵانەیەی بە تۆم دا. بە دڵنیاییەوە واتزانی من کەسێکی نەخوێندەوارم کە بەردەوام وشە بیانییەکان لەگەڵ یەکدا بە هەڵە

دەلێمەوە. دەمویست بڵێم بە ڕێکەوت. لەو کاتەدا هێشتا نەماندەزانی بۆچی ئەو دەستەواژەی "لە کاتی تووشبوون بە هەڵە" لە بری "بە ڕێکەوت"ی بەکار هێناوە، بەڵام لە درێژایی هەمان چارەسەرکردندا بە دوای وتووێژی پێشوودا نەخۆشەکە بیرەوەرییەکی بە بیر هاتەوە کە مەسەلە سەرەکییەکەی پەیوەند بوو بە کەسێکەوە کە لە کاتی تووشبوون بە تاواندا دەستبەسەر کرابوو. لەو ڕووەوە هەڵەی زمانەوانی شەوی پێشوو بەهۆی کارلێکەری زوو هاتنی ئەو بیرەوەرییەوە کە هێشتا لە دۆخی نەستدا بوو، پێکهاتبوو.

٧- شیکردنەوەی نەخۆشێکی تر: ڕۆژێکیان ناچار بووم بە نەخۆشێک بڵێم، کە زانیارییەکانی شیکردنەوە یارمەتیمان دەدات وەها بیر بکەینەوە ڕەنگە ئەو لە کاتی هەڵسەنگاندنی ئێمەدا شەرمی لە بنەماڵەی خۆی هەبووە و بەهۆی چەند مەسەلەیەکەوە کە ناوەڕۆکەکەیان هێشتا دەرنەکەوتووە لۆمەی باوکی کردووە. ئەو وەڵامی دایەوە لە هەمووو ئەو مەسەلانەدا هیچ شتێک بە بیر ناهێنێتەوە، بەڵام بیرکردنەوەی من بە هەڵە دادەنێت. هەرچەند ئەوەندەی نەخایاند کە لە کاتی قسەکردندا هەندێ شتی لە خێزانەکەی گێرایەوە و وتی: "دەبێ بە یەکسانییەوە لە بارەیانەوە دادوەری بکەین، هەندێ کەس هەن کە بەدەگمەن وەک ئەوانە دەبینرێت، هەموویان بەخیلن) sie haben alle Geiz وشە بە وشە: هەموو ئەوانە بەخیلیان تیایە): مەبەستم ئەوە بوو هەموو ئەوانە ناسکییەکی ناخیان هەیە .(Geist) لە ڕاستیدا نەخۆشەکەی من لۆمەی بەخیلیی باوک و دایکی دەکرد، بەڵام ئەوانەی لە زەینی خۆیدا سەرکوت کردبوو. هەرچەند زۆر جار ئەو ئەندیشەیەی کە دەمانەوێ سەرکوتی بکەین لە هەڵەیەکی زمانەوانیدا دەردەبڕێت (سەردانی نموونەکەی میرینگەر بکەن zom Vorschwein gekommen ) تەنها نموونەیەک لە نێوان من و نموونەی مرینگەردا هەیە ئەوەیە کە لە نموونەی

مرینگەردا کەسێک دەیویست ئەو مەسەلەیەی لێی ئاگادار بوو سەرکوتی بکات لە حاڵێکدا نەخۆشەکەی من هیچ ئاگاداری ئەو سەرکوتبوونە نەبوو یان بە واتایەکی تر ئەو لە مەسەلەی سەرکوتکراو و هەروەها لە سەرکوتبوونی ئەو مەسەلەیە ئاگادار نەبوو.

٨- هەڵەی زمانەوانی لای خوارەوە دەکرێ بە سەرنجدان بە سەرکوتبوونێکی بە ئەنقەست ڕاڤە بکرێت. ڕۆژێکیان لە "دولۆمیت" لەگەڵ دوو ژندا یەکترمان ناسی، کە جلی گەشتیارییان لەبەردا بوو. بۆ ماوەیەک پێکەوە هاوسەفەر بووین و بە خۆشحاڵی و دژوارییەکانی ژیانی گەشتیاری قسەمان دەکرد. یەکێک لە ژنەکان ئەوەی بە لاوە پەسەند بوو، کە گەشتیارێک لە ڕۆژدا دوور نییە لە نیگەرانییەکان و وتی: "ئەرێ بەڕاست، کاتێک مرۆڤ بە ڕۆژدا لەژێر قرچەی هەتاودا پیاسە دەکات هەرگیز خۆش نییە کە جل و بلووزەکەی لە ئارەقدا بخووسێت" ئەو لە کاتی وتنی دوایین وشەکانی ئەو ڕستەیەدا نەختێ شکی کرد. پاشان درێژەی پێ دا: "بەڵام کاتێک دوایی بۆ noch Hose لە بری nach Hause ماڵی خۆمان دەگەڕێینەوە و بەهەرحاڵ، جلەکانمان دەگۆڕین". بە بۆچوونی من بۆ دۆزینەوەی شرۆڤەکردنی ئەم هەڵە زمانەوانییە شیکردنەوەیەکی درێژخایەنی ناوێت. ئەو ژنە بە دڵنیاییەوە لە ڕستەی یەکەمی خۆیدا دەیویست لە سووچێکی جل و کراس و چاکەت و پانتۆڵەکەی (Hode)ناوی لێ بەرێت، بەڵام بۆ ڕێزگرتن لە ناوهێنانی دوایین وشە نەیویست بە ڕاشکاوی بیڵێت و دەرئەنجام لە ڕستەی دواییدا کە ناوەڕۆکێکی تەواو سەربەخۆی هەبوو، وشەی Hose پانتۆڵ کە لە کاتی دڵخوازیدا نەوترابوو بە گۆڕینی وشەی Hause ماڵ دەرکەوت.

٩- ژنێک پێی وتم: "ئەگەر دەتەوێ فەرش بکرێت بڕۆرە شەقامی

متهۆسگاس لای "کۆفمان" ڕەنگە بتوانم تۆی پێ بناسێنم. من دووپاتم کـردەوە: "کەواتە لای متهـۆس... ببـوورە بـڕۆمە لای کۆفمـان". وا دیاربوو بەهـۆی نەبوونی تەرکیز لەبری وشـەیەک وشـەیەکی تـرم بەکـار هێنـا، بەڵام لـە ڕاسـتیدا قسـەکانی ئەو ژنە سـەرنجی منـی لە مەسـەلەی فەرش پەراوێـز خسـتبوو و باسـی لە مەسـەلەی گرنگتـر کردبـوو. لـە ڕاسـتیدا خـانووی هاوسـەرەکەم، کە لەو کـاتەدا دەسگیراندار بووم لە شەقامی متهۆسگاسدا بوو. دەرگای سـەرەکی خانووەکە دەکرایەوە بۆ سەر شەقامێکی تر و من وامزانی ئەو ناوەم لە بیر کردووە و ناچار بووم بۆ دۆزینەوەی ئەوە پەنا بەرمە بەر پاڵپشتێک. لەو ڕووەوە ناوی "متهۆس"، کە بیرم لێ کردەوە بە لای منەوە ڕۆڵی ناوی جێگری دەگێڕا. ناوی متهۆس باشتر لە کۆفمان دەیتوانی ئەو ڕۆڵە لە ئەستۆ بگرێت، چونکە متهۆس تەنها ناوی تایبەتە لە حاڵێکدا کە کۆفمان هەم ناوی تایبەتە و هەم ناوی گشتییە فرۆشیار= Kaufmann لە ڕاستیدا ئەو شەقامەی مەبەستم بوو تەنها ناوێکی زۆر تایبەت بوو.(Radetzky)

١٠- دەتوانین پاشـان نموونەی لای خـوارەوە لە بەشـی "هەڵەکـان"دا باسی لێوە بکەین، بەڵام لێرەدا باسی لێوە دەکەین، چونکە پەیوەندی دەنگـی کە بـووەتە هـۆی جێگربـوونی وشـەکان لەم نمـوونەیەدا بە تەواوی دیارە. نەخۆشێک یەکێک لە خەونەکانی خۆی بۆ دەگێڕامەوە و دەیـوت: "منـداڵێک دەیویسـت بە ژەهـری مـار خـۆی بکوژێـت و بڕیارەکەیشـی جێبەجـێ کـرد". نەخۆشـەکەم بینیبـووی کە منداڵەکە بەهـۆی تەشـەنوجەوە بە خۆیـدا دەئاڵێـت و... هتـد. پاشـان لەنێـو ڕووداوەکـانی ڕۆژی پێشـوودا بە دوای ڕاسـتییەکدا گەڕا تـا بتوانێـت پەیوەنـد بـێ بەو خەونەوە، لە ناکـاو بە بیـری هـاتەوە کە شـەوی ڕابـردوو چووەتە کونفرانسـێکی گشتی. مەسـەلەی کۆنفرانسـەکەیش یـارمەتییە سـەرەتاییەکان بـوو پـاش ژەهرپێـوەدانەکە. وتەبێـژەکە

وتبووی: "کاتێک مار له هەمان کاتدا بە کەسێکی پێگەیشتوو یان منداڵێکەوە دەدات دەبێ سەرەتا برینی منداڵەکە چارەسەر بکرێت." نەخۆشەکەم بە باشی پێشنیارەکانی وتەبێژەکەی لە بیر بوو. ئەو وتبووی: "هەموو شتێک بەندە بە جۆری مارەکەوە". لێرەدا من قسەم بە نەخۆشەکەم بڕی و پرسیم: "ئایا ئەو نەیوت لە کام ناوچە لە وڵاتدا ماری ژەهراوی زۆر دەگەمەنی لێیە و لە چ ناوچەیەکیشدا جۆری مەترسیداری لێیە؟ ئەو وەڵامی دایەوە: بەڵێ، ئەو لە بارەی ماری زەنگی (KLAPPERschlange) قسەی کرد." من پێکەنینێکم کرد. کاتێک نەخۆشەکە هەستی کرد قسەیەکی هەڵەی کردووە بەبێ ئەوەی بە ناوی مەبەستدا بچێتەوە بە پێچەوانەی وتەی پێشووی خۆی درێژەی پێ دا: "ڕاستە، ئەو مارە لە ناوچەی ئێمەدا نییە، وتەبێژەکە دەیویست سەبارەت بە ماری حەفی قسە بکات من نازانم بۆچی باسم لەسەر ماری زەنگی کرد".

بە بۆچوونی من ئەو کارە بەدوای دەستێوەردانی ئەو ئەندێشانەی کە لە خەونەکاندا شاردرابووەوە ڕووی دابوو. خۆکوژی بە ژەهری مار تەنها دەتوانێت ئاماژەیەک بێت بۆ مەرگی کیلیوپاترا Kleopatra .هاوشێوەبوونی لە بواری وتنی زۆر لەو دوو وشەیە Klapperschlangeو Kleopatra، دووپاتبوونەوەی پیتی Kl .... P ... Rبە دیسیپلینی یەکسان و بە پاڵدان بە دەنگی A یەوە لە هەر دوو وشەکەدا ئەو تایبەتمەندییانەن کە خێرا دەبینرێن. ئەو تایبەتمەندییە هاوبەشە بووە هۆی بۆشایی هەستی دادوەری نەخۆشەکەی من و لەو ڕووەوە ئەو وای بۆ چوو بە تەواوی سروشتییە کە وتەبێژێک لەگەڵ خەڵکی دانیشتووی ڤیەننا لە بارەی ژەهری مارە زەنگییەکانەوە قسە بکات. لە حاڵێکدا بە باشی دەیزانی ئەو مارە لە جۆری مارەکانی ناوچەی ئێمە نییە. بەهەرحاڵ، ئێمە نابێ لۆمە بکەین کە بۆچی ژنە نەخۆشەکە بە هەمان کەمتەرخەمی ماری

زەنگییەکەی بە هی وڵاتی میسر دادەنا. ئێمەی نەمساییەکان خوومان وایە هەموو ئەو شتانەی کە بێگانە یان نائەورووپین پۆلێنی بکەین و لە گرووپێکدا دایبنین تەنانەت خودی من ناچار بووم چەند چرکەیەک بیری لێ بکەمەوە و پاشان بە نەخۆشەکەم بڵێم کە ماری زەنگی تەنها لە ئەمریکادا هەیە.

درێژەدان بە شیکردنەوەی هەمان دەرەئەنجام کە بیرم لێ دەکردەوە جەختی لەسەر کردەوە. ئەو ژنە دوێنێ شەو پێش بینینی خەونەکەی بۆ یەکەمین جار لە بەرامبەر گرووپی "ستراتەر"دا کە بە تەواوی نزیک لە خانووەکەی ئەو ڕاوەستابوو کە ئامێر و بەزمی خۆی بڵاو کردبوونەوە و ڕۆڵی نمایشی ئەنتوانیان دەگێڕا. ئنجا ئەوەیش دووهەمین هاندەری خەونەک بوو (کونفرانس لە بارەی ژەهری مارەوە یەکەمین هاندەری دابین کردبوو). ئەو ژنە لە قۆناغی دوایی خەونەکەیدا بینیبووی منداڵێکی لە ئامێز گرتووە و دەیخەوێنێت و بیرەوەریی ئەو لەقتەیە ئەوی خستە یادی "گریتشێن"ـەوە. لەنێو ئەو ئەندێشانەی تردا کە بە مێشکیدا هات بیرەوەریی سەبارەت بە ئاریا و مسالین Arria et Messaline دێتە بەرچاو. وەبیرهێنانەوەی ئەو هەموو ناوە سەبارەت بە نمایشنامەکان لە ئەندێشەکانی خەوندا یارمەتیمان دەدات وا بیر بکەینەوە، کە ڕەنگە کەسی خەوبینەر لە دڵیدا پێی خۆش بووە خۆی بۆ شانۆ تەرخان بکات. دەسپێکی خەونی "ئەو منداڵەی کە بڕیار دەدات بۆ خۆکوشتن و بڕیارەکەی جێبەجێ دەکات" تەنها دەتوانێ ئەو واتایە لە خۆ بگرێت: ماوەیەک پێش ئەو خەونە هەندێ ڕووداو ڕووی دابوو و ئەو نەخۆشەیش دەترسا کە تاکە براکەی لەگەڵ نەژادێکی نائارياییدا هاوسەرگیری بکات و هاوسەرگیرییەکی نەگونجاو (Mesalliance) لە بنەماڵەدا ڕوو

بدات.

١١- ئێستا نموونەیەک باس دەکەین کە گرنگییەکەی کەمتر بێت کە تیایــدا نەمتــوانی پــاڵنەری هەڵەی زمــانەوانییەکە بە تەواوی ڕوون بکەمەوە، بەڵام ئەو نمــوونەیە بــۆیە دەهێنمەوە ئەو میکــانیزمەی کە بــووەتە هــۆی پێکهــاتەی هەڵەکە لێــرەدا زۆر ڕاشــکاو و بەرچــاوە: کەسێکی ئەڵمانیایی کە گەشتی کردبوو بۆ ئیتالیا پێویستی بە قایشێک بــوو تــا دەوری جانتــای گەشــتەکەی کە نەختــێ کــۆن و داوەشــیبوو ببەستێت. ئەو سەردانی فەرهەنگی وشــەی کرد و وشە ئیتالیاییەکەی بەرامبەر بە قایش دۆزییەوە، واتە"Coreggia" ، لەبەر خۆیەوە وتی: (کورجیــویCorreggio )، هــۆنراوەبێژم بیــر دەکەوێــتەوە و ئەو وشەیەیش بە ئاسانی بە بیری دێنمەوە. پاشان چووە ناو ژوورەکەوە و داوای "ڕیبیرا"یەکی کرد. بێگومــان ئەو نەیتوانیبوو وشە ئیتاڵیایەکە بکــاتە جێگــری وشــە ئەڵمــانییەکە، بەڵام هەوڵدانەکانیشــی بە تەواوی بێســوود نەبــوو. ئەو دەیزانــی بــۆ وەبیرهێنــانەوەی وشــەی مەبەســت دەبێ ناوی نیگارکێشێکی بیر بکەوێتەوە، بەڵام لەبری ڕاسپاردنی بە مێشــکیدا نــاوی کورجیــوی هێنــایە ســەر زاری کە زۆر هاوشــێوەی وشــەی قایش Coreggia بــوو، نــاوی ڕیبرای هێنــایە ســەر زار کە نزیکتر بوو لە وشــەی ئەڵمــانی Riemen قایشــەوە. پێویست ناکات بڵێم کە مــن دەمتــوانی ئەو نمــوونەیە بگــوازمەوە بــۆ ڕیــزی نمــوونە لەبیرکراوە سادەکانی ناوە تایبەتییەکان.

بۆ نووسینی یەکەمین چاپی ئەم کتێبە من هەموو هەڵە زمانەوانییەکان کــــۆ دەکەمەوە و هەمـــوو بـــوارە بینراوەکـــان و تەنـــانەت کەم واتاترینەکانیشـــیان شــی دەکــەمەوە. بەڵام لەو کــاتەوە تــا ئێســتا کەسانێکی تریش دەستیان کردووە بە ئەنجامدانی ئەو کارە سەیر و ورووژێنەرە، واتە کۆکردنەوە و شیکردنەوەی هەڵە زمانەوانییەکان، بە

شێوەیەک کە ئەمڕۆکە نموونەی زۆر فراوانترم لە بەردەستدایە.

١٢- پیاوێکی گەنج بە خوشکەکەیی وت: "من لەگەڵ بنەماڵەی د. بە تەواوی دابڕام تەنانەت چاکی و چۆنیشیان لەگەڵ ناکەم". خوشکەکەی وەڵامی دایەوە: "پەیوەندییەکی خۆشەویشتانەی سەیر بوو." لە حاڵێکدا دەیویست بڵێت: "پەیوەندیی کۆن و هاوڕێیانەی Sippschaft سەیر بوو". لەم هەڵە زمانەوانییەدا ئەو لە بری وشەی Libchaftوشەی Lippschaft ی بەکار هێنابوو. لە ڕاستیدا ئەو بە کەڵکوەرگرتن لە دەستەواژەی "پەیوەندی خۆشەویستانە" بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێت ئاماژەی بە پەیوەندی براکەی لەگەڵ یەکێک لە کچەکانی بنەماڵە و هەروەها هەندێ دەنگۆی ناخۆش دەکرد کە لە ماوەیەک لەوەوپێش لە بارەی ئەو کچە و یەکێک لە پەیوەندییە خۆشەویستانەکانی ئەو لەسەر زاری خەڵکدا بوو.

١٣- پیاوێکی گەنج لەسەر شەقام بە ژنێک گەیشت و بەم وشانە دەستی بە قسەکردن کرد:

„Wenn Sie gestatten, fraulein , mochte ich sie gerne begleit digen“.

ئەو دەیویست بڵێت: "خاتوو ئازەب ئەگەر یارمەتی بفەرموویت بە گیان و دڵ هاوڕاییت دەکەم." بەڵام بە پەیوەندکردنی وشەی begletenهاوڕاییکردن، وشەی beleidigen ئیهانەکردن و بێڕێزی نواندنەوە وای کرد بە تێکەڵاوکردنی ئەو دوو وشەیە تووشی هەڵەیەکی زمانەوانی ببێت و وشەیbegleitdigen ی دروست کرد. هەڵبەت پیاوە گەنجەکە دەیویست کچەکە هاوڕایی بکات، بەڵام دەترسا نەکا پێشنیارەکەی ئیهانەئاسا بێت. ئەو مەسەلەیە کە دوو ئاراستەی دژەبەیەکی نواندبوو لە شێوەی وشەیەکی تاک و ڕێک بە شێوەی هەڵەیەکی زمانەوانی هاتبووە ئارا و پیشانی دەدا کە مەبەست

و ئامانجی ئەو گەنجە بۆ خۆشی ڕوون نەبوو و ڕەنگە مەبەست و ئامانجی بەرامبەر بەو کچە گەنجە، کە بە بۆچوونی خۆی بە بێڕێزی دەهاتە بەرچاوی، بەڵام چونکە هەوڵی دەدا چۆنیەتی دادوەرییەکەی لە بارەی پێشنیارەکەیەوە بشارێتەوە ڕێک لەبەر ئەو هۆیە بوو کە ویژدانی نەستی ئەوی تەمیە کرد و مەبەستە ڕاستەقینەکەی ئاشکرا کرد. ئەو کارە بووە هۆی ئەوەی کە خاتوونە تازەبەکە وەڵامی بداتەوە: "پێتوایە لەگەڵ کێدا ڕووبەڕوویت کە بەو شێوەیە ئیهانە (beleidigen)م پێ دەکەیت؟

١٤- ئێستا چەند نموونە لە بابەتی شتێک بە ناوی "دانپیادانانەکانی ویژدانی نەست"م تێهەڵکێش کردووە.

ئەم نموونەیەی لای خوارەوەیش پیشاندەری لایەنە ناخۆشەکانی ئەندێشەی ویژدانی نەستییە. هەر لە ئێستاوە دەبێ بڵێم کە من وەک پزیشکێک هەرگیز بیر لە سوودی ماڵی ناکەمەوە، بەڵکوو بە دۆخی سروشتی گرنگی بە باشتربوونی دۆخی نەخۆشەکە دەدەم.

جارێکیان لە ماڵی یەکێک لە نەخۆشەکانمدا بووم تا بتوانم ئەو لە نەخۆشییەکی زۆر دژوار کە تازەیش لێی ڕزگاری ببوو بە تەواوی ڕزگار بکەم. شەو و ڕۆژانێکی زۆر دژوار و گیانبەخشم لە پاڵ قەرەوێڵەکەیدا تێپەڕاندبوو و ئێستا کە دەمبینی دۆخی باشتر بووە خۆشحاڵ بووم. قەرار وابوو نەخۆشەکەم گەشتێک بۆ "ئەبازیا" بکات، من جوانییەکان و دیتەنییەکانی ئەوێم بۆ دەگێڕایەوە و درێژەم پێ دا: "هەڵبەت ئەگەر بەو شێوەیە ئومێدەوارم تۆ لەناو جێگاکەت هەستیت..." بە وتنی ئەو ڕستەیە من بە ڕاشکاوی ئاڕاستەی ویژدانی نەستم لەسەر بنەمای ئەو شتەی کە ماوەیەکی زۆرم بۆ چارەسەرکردنی تەرخان کردووە دەربڕی بوو. ئەو ئاڕاستەیە لەگەڵ ویژدانی هەست و وریای مندا بە تەواوی بێگانەیە و ئەگەر بگاتە ویژدانی هەستم بە

سەختی و بە هەستی خۆبەکەمزانین وەها ئاراستەیەک سەرکوت دەکەم.

١٥- نموونەیەکی تر لە هەمان نووسەر: هاوسەرەکەم دەیویست بۆ دوای نیوەڕوان کچێکی فەرەنسی دابمەزرێنێت. کاتێک هەردووکیان لە بارەی هەلومەرجەکانەوە پێکەوە ڕێککەوتن، هاوسەرەکەم ویستی ڕاسپاردەی نامەکانی ئەو لە لای خۆی ڕابگرێت، بەڵام کچە فەرەنسییەکە دەیویست ئەوانە وەربگرێتەوە و بیانوویەکی وەهای دەهێنایەوە: "من هێشتا بۆ دوای نیوەڕوان، ببوورە، بۆ پێش نیوەڕوان بە دوای کاردا دەگەڕێم". دیارە مەبەستی بوو سەردانی شوێنێکی تر بکات، لەوانەیە بە هەلومەرجێکی باشتر دابمەزرێت و جیا لەوەیش هەر ئەو کارەشی کرد.

١٦- دکتۆر شتێکلا دەیگێڕایەوە ئەو سەردەمانێک دوو نەخۆشی خەڵکی تریستی هەبوو و بەردەوام لە کاتی سڵاو و ئەحواڵپرسیدا هەر کامەیانی بە ناوێکی ترەوە بانگ دەکرد. بە ناوی کاک سکۆلی "ئینجا بە پلۆنیشی دەوت: "سڵاو کاک سکۆلی!" سەرەتا ئەو هەڵەیەی دەدایە پاڵ پاڵنەرێکی قووڵ و وای بیر دەکردەوە ئەو کارە دەرەئەنجامی هەندێ هاوشێوەیی لە نێوان ئەو دوو کەسەدایە، بەڵام پاشان بە ئاسانی ڕازی بوو ئەو هەڵەیە هێمای جۆرێک خۆپەرەستی و فشەکردنە. ئەو دەیویست بە هەر یەک لەو نەخۆشانە پیشان بدات کە ئەو تەنها نەخۆشی ئیتالیایی نییە کە سەختییەکانی گەشتەکەی لە تریست تا ڤیەننا دەخاتە سەر شانی خۆی تا لەژێر چاودێریی دەرمانی ئەودا، واتە شتێکلادا بێت.

١٧- لە کۆڕێکی گشتیدا کە وتوویژی چڕوپڕ هەبوو، دکتۆر شتێکلا پێشنیاری کرد: "ئێستا باس لە چوارەمین مەسەلەی پەیڕەوی کۆڕی ئەمڕۆمان بکەین" هەڵبەت ئەو دەیویست باس لەو مەسەلەیە

بکات، بەڵام کەوتبووە ژێر کاریگەری شوێنەواری پڕفشاری کۆڕەدا و لە بری وشـەی "Schreiten" وشـەی "پەلامار بدەین Streiten"ـی بەکار برد.

١٨- مامۆستایەک لە یەکەمین کۆڕی وانەکەیدا وتـی: "من ئامادە نیم شایستەیی هاوکاری زانای پێشوو کە پێشتر وانەی پێتان وتووە بە باشی دابنێم". ئەو لە ڕاستیدا دەیویست بڵێت: "من بچووکتر لەوەم بتوانم شایستەییەکانی..." بەڵام لە بری وشـەی geneigt وشـەی geeignet بەکار هێنا.

١٩- دکتـۆر شـتێکلا دەیگێـڕایەوە: "کەسـێک باسـی نێـوان دوو هـاوڕێی دەگێڕایەوە دەیویست تێمان بگەیەنێت کە یەکێک لەو دوانە جـوولەکەیە. ئەو وتـی: "ئەوانە وەک کاسـتۆر و پـولاک (لە بـری پولێکس، پولاک ناوێکی زۆر باوە بۆ جوولەکەکان) پێکەوە دەژین. بێژەری ئەو وشانە مەبەستی یاریکردن بە وشە نەبوو و تەنها کاتێک لە هەڵە زمانەوانییەکەی تێگەیشت کە بەرامبەرەکانی ئەوەیان پێ وت.

٢٠- دکتۆر شتێکلا بە نەخۆشەکەی خۆی کە پێی وابوو تووشی گـواتەر ئەگزۆتاسـمیکە بـووە، وت: "تـۆ یەک گـواتەر لە خوشـکەکەت بەرزتری(Kropf) ". لە حاڵێکدا دەیویست بڵێت: "تۆ یەک سەر(Kopf) و ملێک لە خوشکەکەت بەرزتریت."

٢١- هەندێ جار هەڵەی زمانەوانی دەبێتە جێگر بۆ شرۆڤەیەکی تێروتەسـەل. ژنە گەنـجەکە زۆر بە گـڕوتین و بە هێـزەوە لە بـارەی مێـردە نەخۆشـەکەیەوە لەگـەڵ منـدا دەدوا و دەیـوت مێـردەکەی بـۆ ڕاوێژکردن لە بارەی ڕجێمی خۆراکییەوە ڕۆیشتووە بۆ لای پزیشک. پاشـان درێـژەی پـێ دا: "پزیشـک پێـی وت نـابێ لە ڕجیمێکـی تـایبەت پەیـڕەوەی بکـات و دەتوانێـت ئەو شـتانەی مـن دەمەوێ بیخـوات و بیخواتەوە". (لە بری هەر شتێک پێی خۆشە).

٢٢- دوو نموونەی لای خوارەوە کە دکتۆر ت. ڕیک تێهەڵکێشی کردووە سەبارەت بە باروودۆخێکە کە هەڵەی زمانەوانی ئاسان دەکاتەوە، چونکە لەو هەلومەرجەدا کەسەکە دەیەوێت مەسەلەی زیاتر لەو شتەی دەیەوێت دەریببڕێت، بیشارێتەوە.

٢٣- هەر ئەو پیاوە و هەر ئەو ژنەیش لە میوانییەکی شەوانەدا لە ماڵی هاوڕێیەکیاندا پێکەوە قسەیان دەکرد. مەسەلەی باسەکەیان لە بارەی بەرەوپیری ڕۆیشتنی جەژنی پاک لە شاری ڤیەننا بوو. پیاوەکە پرسی: "ئایا تۆ پیشانگای ژووری بازرگانی "ڤریتم"ت بینیوە؟ بە ڕاستی زۆر (دکولتە)یە." ئەو لە سەرەتای میوانییەکەوە چاوی بڕیبووە دکولتەی ژنە جوانەکە، بەڵام زاتی نەکردبوو وشەی زۆر جوانە یان لەو بابەتانە بەکار بهێنێت. بەهەرحاڵ، ئەو ئەندێشە سەرکوتکراوە خۆی دەرخستەوە و ئەوی هەڵخڕاندووە تا سەبارەت بە پیشانگای کاڵای بازرگانی وشەی دکولتە لە بری وشەی دێکورە (Decore)بەکار بهێنێت. دیارە وشەی پیشانگا بەو هەڵە زمانەوانییەوە واتایەکی دوو جۆرە لەخۆ دەگرێت.

هەر ئەو باروودۆخەیش لەو تاقیکردنەوانەدا کە هانس ساکس هەوڵی داوە شرۆڤەیەکی تەواویان لێی بخاتە ڕوو، پشتڕاست دەکاتەوە.

١٥- ژنێک لە بارەی پیاوێکەوە دەیگێڕایەوە کە یەکێک لە هاوڕێکانمان بوو و دەیوت دواهەمین جارێک کە ئەوی بینیوە ئەو پیاوە وەک هەمیشە تەڕپۆش و کەشخە بووە و بەتایبەتی سەرنجی بۆ لای پێڵاوە (Hallbschuhe) زەرد و زۆر کەشخەکەی ڕاکێشاوە. من پرسیم: "لە کوێدا لەگەڵیدا چاوت پێ کەوتووە؟" ئەو ژنە وەڵامی دایەوە: "ئەو زەنگی دەرگای ماڵەکەی منی لێ دا منیش لە پشت پەردەکەوە ئەوم بینی، بەڵام دەرگاکەم نەکردەوە و خۆمم پیشان نەدا، چونکە نەمدەویست تێبگات من لە هاوینەهەوار گەڕاومەتەوە." من لە

حالێکدا گوێم لە قسەکانی ئەو دەگرت لەبەر خۆمەوە دەمووت ئەو مەسەلەیەک لە من دەشارێتەوە (رەنگە لەو ساتەدا ئەو لەوێ نەبووە) و جلێکی گونجاوی بۆ پێشوازیکردن لە میوانەکەی لەبەردا نەبووە). بۆیە بە زارێکی گاڵتەجارییەوە پرسیارم لێ کرد: "کەواتە تۆ لە پشت پەردەکەوە توانیت نەعلەکانی(Hausschuhe) بووره پێڵاوەکانی (Halbschuhe)ببینیت؟" لە راستیدا پێموابوو کاتێک کاکی فلان کەس زەنگی دەرگای ماڵەکەی ئەوی لێداوە، جلی ماڵەوە (ئیسراحەت)ی لەبەردا بووە، کەواتە وشەی(Hausschuhe)م بەکار هێنا، ئەندیشەی سەرکوتکراو لە بارەی جلی ماڵەوە Hauskleid، لەو رووەوە خۆی دەرخستبوو. جیا لەوەیش من وشەیHausschuheم لە بری Halbschuhe وتبوو، چونکە وشەی Halb نیو، نیوە دەبێ، لە وەلامێکدا کە مەبەستم بوو پێی بڵێم لە ئارادا بوو، بەلام من پێش بە زمانی خۆمم گرت تا وەلامێکی وەها نەدەمەوە. ئەو وەلامەی دەمویست بیدەمەوە ئەمە بوو: "تۆ تەنها نیوەیەک لە راستییەکەت پێ وتم، تۆ لەو کاتەدا نیوە رووت بوویت". لە لایەکی ترەوە ئەو هەڵە سەر زارەکییە هۆکارێکی زیادەشی هەبوو، ئیمە چەند خولەک پێش وتوویژکردن لە بارەی ژیانی هاوسەرداری و بەختەوەری خێزانی Hauslichesلە Haus ئەو پیاوە قسەمان کرد و هەر ئەو کارەیش بووە هۆی ئەوەی تا لە بارەی کەسیی خۆیەوە باسی لەسەر بکەین. بەهەرحاڵ، دەبێ دانی پیادا بنێم کە ئەگەر ئەو پیاوە کەشخەیە بە نەعلەوە لە شەقامدا وێنام بکردایە تاڕادەیەک بەهۆی بەخیلی من بەرامبەر بەوەوە بوو، چونکە هەرچەند لەم دواییانەدا پێڵاوی (Halbschuhe) زەردیشم کڕیبوو، بەڵام پێڵاوەکان قەد کەشخە نەبوون.

شەڕ دەبێتە هۆی دەرکەوتنی هەڵەیەکی زمانەوانی زۆر کە لێتێکەیشتنیان بە ئاسانی ئەنجام دەدرێت.

أ- له ژنێکیان پرسی: "کوڕەکەت له کام سوپادا خزمەت دەکات؟" ئەو دەیویست وەڵام بداتەوە: "له چلودووهەمین سەنگەری خومپارەفڕێدەر" (Mörser)، بەڵام تووشی هەڵەی زمانەوانی هات و له بری وشەی Mörser وشەی Mörder بکوژەکانی بەکار هێنا.

ب- ملازم هنریک هایمەن له نامەیەکدا که له بەرەی شەڕەوە ناردی وەهای نووسی بوو: "من ناچار بووم خوێندنەوەی کتێبی زۆر سەرقاڵکەر بەلاوە بنێم، تا بتوانم بۆ چەند چرکەیەک جێگای تەلەفۆنچی پێشەنگەکە بگرم. له کاتی تاقیکردنەوەی وتووێژدا که گەیشتینه گۆڕەپانی گوللەهاویشتن وەڵامم دایەوە: "کۆنترۆڵی دروست. ئازاد" له بواری ڕێسای سەربازییەوە دەبوایه بمتوتبا: "کۆنترۆڵی دروست. ڕاوەستان". هەڵەکەم دەگەڕایەوە بۆ نیگەرانی و بێتاقەتیم. من لەوە نیگەران بووم که له کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا ئێزعاجیان کردم".

ت- ملازم کەسانی ژێر دەستی ڕادەسپارد که به وردی ناونیشانی خۆیان بدەنه بنەماڵەکانیان تا پاکەته پۆستکراوەکانیان ون نەبێت، بەڵام له بری وشەی "پاکەت" Gerpäckstücke وشەی Gespeckstückeی بەکار هێنا کە وەرگیراوە له وشەی (Speck)ەوە به واتای چەوری سکی بەراز بەکار دێت.

پ- نموونەی لای خوارەوە بەهۆی هەلومەرجی خەفەتبارییەوە که هەبوو و هۆکاری دەرکەوتنیشی بوو زۆر جوان و پڕ واتایە. ئەو نموونەیە به قەرزداری نامەی خۆشەویست ئاسای دکتۆر (ل. چس سس)م که خۆی شایەتحاڵی ڕووداوەکه بووە و به قووڵی شیی کردووەتەوە. ئەو له کاتی شەڕ له سویسرادا که وڵاتێکی بێلایەن بوو ژیانی بەسەر دەبرد. لێرەدا ئەو شتانەی بینیویەتی به نەختێ وردەکارییەوە باسی دەکەین.



CS CamScanner

داوای لـی دەکەم هەڵەی زمـانەوانی کە پروفیسـور ن. لە درێژایی یەکێک لە قسەکردنەکانیدا لە بارەی دەروونناسیی هەستەکانەوە لە کۆتایی ساڵدا لە شاری ئۆ. تووشی بوو بۆتانی بکێڕمەوە، سەرەتا با بۆتانی بگێڕمەوە کە قسەکردن لە هۆڵی (ئۆلای)ـی زانکۆدا ئەنجام دەدرا و ئامادەبوانی بێ ئەژمار تیایدا وەک زیندانییەکانی شەڕی فەرەنسە کە لە زیندانی شاردا بوون و ئەو خوێندکارانەی کە زۆر جار خەڵکی نۆرماندیای سویسرا و خوازیاری پەیمانی ڕێکەوتنی ئاشتی بوون. هەروەها کە لە زمانی فەرەنسیدا باوە وشەی 'بۆش' لە شاری ئۆدا زۆر جار و بە نوێنەرایەتی بۆ ناولێنانی ئەڵمانییەکان بەکار دێت. بەڵام لە خۆپێشاندانە گشتییەکان و قسەکردنەکان و... هتد، کارمەندە پلە بەرزەکان و مامۆستایان و بەرپرسانی تر بەهۆی بێلایەنی سویسراوە هەوڵ دەدەن لەم وشە شوومە دووری بکرن.

هەرچەند دکتۆر ن. لە کاتی قسەکردندا بوو سەبارەت بە گرنگی پراکتیکی هەستەکان و دەیویست نموونەیەک بهێنێتەوە تا پیشان بدات چۆن هەست دەکات دەتوانێت بە شێوەیەک کەڵکی لی وەربگیرێت تا کاریگی ماسوولکەیی، کە خۆی لە خۆرا هیچ سوودێکی نییە لە بەرچاو بە باش پیشان بدات و بەو شێوەیە خێراییەکەی زیاد بکاتەوە. لەو ڕووەوە سروشتییە کە بە زمانی فەرەنسی چیرۆکێک بگێڕێتەوە کە ڕۆژنامە ناوچەییەکان ئەوەیان لە زاری ڕۆژنامەیەکی ئەڵمانییەوە بڵاو کردبووەوە.

چیرۆکەکە لە بارەی مامۆستایەکی خوێندنگە لە ئەڵمانیادا بوو. ئەو خوێندکارەکانی لە باخێکدا ڕادەگرت و لەبەر ئەوەی گروتینێک لە کارەکەدا دروست بکات دەیوت خوێندکاران هەر کلۆ خۆڵێک ورد دەکەن کەللەی کەسێکی فەرەنسی وێنا بکەن. بە ڕووی سروشتی کاک ن. بۆ گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە هەر جارەو ناچار دەبوو وشەی

ئەڵمانی بەکار بهێنێت، لە زاراوەی "بۆش" دووری دەگرد. بەڵام کاتێک کۆتایی بە چیرۆکەکە هێنا، قسەی مامۆستا ئەڵمانییەکەی بەم شێوەیە گێڕایەوە. وێنا بکەن کە بە وردکردنی هەر moche لە بری motte بە واتای "کڵۆی خاک"دێت، مێشکی کەسێکی فەرەنسی بتلێنن.

ئایا لەم نموونەیەدا بە ئاشکرا نابینرێت کە زانای خاوەن ئەدەبیات لە سەرەتای شرۆڤەکردنی چیرۆکەکەوە ئاگادار بوو تا خووی پێوە نەگرێت و ڕەنگە ڕاراییش نەبێت و لەسەر کورسیی خوێندکارییەوە جنێوێک بە ئەڵمانییەکان نەدات کە یاسای فیدراڵی قەدەغەی کردبوو، بەڵام بە تەواوی لە چرکەیەکدا کە بۆ دوایین جار بە وتنی وشەی "مامۆستای ئەڵمانی" لە مەترسی ڕایدەکرد لە هەمان کاتدا کە هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵدەمژی و نزیکە و کۆتایی تاقیکردنەوەکان دەبووەوە ڕێک لە هەمان کاتدا ئەو وشەیەی کە بە زەحمەت سەرکوتی کردبوو بەهۆی هاوشێوەبوونی سەرزارەکی لەگەڵ وشەی motte دا لکا بەم وشەیەوە و ئەوی تووش کرد. ترس لە تووشبوون بە تاوانێکی سیاسی و ڕەنگە نائومێدی بەهۆی نەرەخسانی دەرفەتی وتنی وشەی باو، کە هەموو چاوەڕێی بیستنی بوون و هەروەها ناخۆشی کەسێکی کۆماریخواز کە بڕوای بە دیموکراسی هەبوو لە بەرامبەر هەر لەمپەرێکدا کە ئازادی ڕادەربڕین سنووردار بکات هەموو ئەو هۆکارانە کۆ بوونەوە تا مەبەستە سەرەکییەکەی کە گێڕانەوەی نموونە لە چوارچێوەی ڕێسادا بوو تێکی بدەن. نووسەری ئەو دێڕانە بەهۆی فشاری دەروونی شڵەژێنەر ئاگادارە و ڕەنگە ڕێک پێش ئەو هەڵە زمانەوانییەوە بیری لەو مەسەلەیە کربێتەوە.

پروفیسۆر ن. ئاگای لە هەڵە زمانەوانییەکەی خۆی نەبوو، بە هەر پیا نەچووەوە لە حاڵێکدا کە پیاچوونەوەی ئەو جۆرە هەڵانە زۆر جار لە

خۆرِا ئەنجام دەدرا، بەلاّم زۆربەی ئامادەبوان کە فەرەنسی بوون لەو هەڵە زمانەوانییە، کە وەک یارییەکی بە ئەنقەست لەگەڵ وشەکاندا بوو نـوقمی خوشـحاڵی بـوون. بە پێچەوانەشـەوە مـن بە وروژانـدنێکی قووڵەوە بەدواداچوونی ئەو کارە بە ڕواڵەت بێ مەترسییەم دەکرد، چونکە هەرچەند بەو هۆکارانەی تێگەیشتنیان ئاسـانە لە هەر جۆرە خوێنـدنەوەیەکی دەروونشـیکاریانەی هەڵە دووریـم گـرت، بەلاّم بەهــەرحاڵ ئەوەم بە بەڵگەیەکـی شـیاوی سـەرنج لە دروسـتی بیرۆکەکـــەت لە بـــارەی هۆکـــاری هەڵە ڕەفتارییەکانـــەوە و هاوشـــێوەبوونی قووڵیـــان لەگـــەڵ هەڵە زمانەوانییەکانـــدا و ئەو گاڵتەجاڕی وتنانە دادەنێم.

ج- نموونەی لای خوارەوەیش مـلازم ت. ئەفسـەرێکی نەمساوی کە گەڕابـووەوە بـۆ نیشـتمان بـۆی گێڕامەوە، ڕووداوەکە لە هەسـتە دڵتەزین و خەفەتاوییەکانی سەردەمانی شەڕ سەرچاوەی دەگرت.

"کاتێک وەک دیلێکی جەنگی لە ئیتالیـادا بەنـد کرابـووم ڕێژەی ئـێمە ئەفسـەرەکان نـزیکەی دووسـەد کەس بـوو. هەموومانیـان لەنـاو خانوویەکی زۆر بچووکدا بۆ چەند مانگێک دانـابوو. لەو مـاوەیەدا لەو خـانووە یەکێـک لە هاوڕێیـانم بـەهۆی تووشـبوون بە پەتـاوە گیـانی لەدەست دا. ئەو کارەساتە بەهۆی سروشتی کاری کردە سەر ئەوانی تـریش، چـونکە بارودۆخمـان، نەبـوونی هەر جـۆرە یـارمەتییەکی پزیشکی و بێبەری بوون و خۆڕاگرینەکردنی جەستەیی لە بەرامبەر نەخۆشـیدا ئەگەری بڵاوبـوونەوەی نەخۆشـییەکەی زیـاد دەکـرد. مەیتەکەمان نایە ناو تابووتەکە و لە سووچێک لە ئەمبارەکەدا دامانـا. هەر ئەو شەوە کاتێک من و یەکێک لە هاوڕێیانم سـووڕێکی دەوری خانووەکەمـان لـێ دەدا بیرمـان لەوە کـردەوە، کە دیسـانەوە سـەیری مەیتەکە بکەین. من کە لە پێشـەوە دەڕۆیشتم لەگەڵ ئەوەی چوومە

ناو ئەمبارەکەوە ڕووبەڕووی لەقتەیەک بوومەوە کە زۆر ترساندمی، چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە مەیتەکە ئەوەندە نزیک دەرگای ئەمبارەکە بێت، دەموچاوی مەیتەکەیش لەژێر ڕووناکی لەزۆکی مۆمەکاندا گوایە گیانی بەبەر کەوتبوو دەمبینی. چیمەن و سەوزەڵانییەکە وەک ڕۆژ ڕووناک دەهاتە بەر چاو و لە دووریشەوە هەورە پەرشوبڵاو و کەم چڕەکان دیار بوو. وێنەیەک کە هەموو ئەو شوێنە بە زەینمدا دەیهێنا بە شێوەی پەیکەری گرووپی خوا جۆراوجۆرەکان بە ڕەقسەوە لە کەناری دارستانی سەروەکان لە نزیکی زەوی سەوزەڵانییەکەدا دەرکەوت.

سبەی دوای نیوەڕوەکەی هاوڕێ چارەڕەشەکەمان برد بۆ شوێنی هەتاهەتایی. ئەو شوێنەی کە زیندانی لە قەبرستانی گوندی بچووکی دراوسێمان جیای دەکردەوە، بە لای ئێمەی ئەفسەرانەوە ئازاراوی و خەفەتاوی و سووکایەتی ئاسا بوو. گەنجە هاروهاجەکان و مرۆڤە بێئەدەبەکان و ئاژاوەچییەکان و هەندێ خەڵک بە قسەی گاڵتەجاڕی و تانە و تەشەر لە هەلومەرجەکە کەڵکیان وەرگرت تا هەستە ڕقدارەکان تێکەڵاو بە وردبینییان بەرامبەر بە ئێمە پیشان بدەن. من کە لە هەموو هەلومەرجێکی تردا لە بەرامبەر ئەو هەموو سووکایەتی و بەرپەرچدانەوەیەدا پیشانمیان دەدا هەستم دەکرد بێتوانام لە ئەنجامدانی بچووکترین بەپەرچدانەوەیش. بێئەدەبی و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی خەڵکەکە بە ڕادەیەک ڕقاوی بوو و تانە و تەشەرەکان ئەوەندە زۆر بوو کە هەستێکی تاڵ سەراپای گرتم و خەمۆکی تەنیبوومەوە کە تا شەو درێژەی خایاند. کاتی شەو دیسانەوە لە هەمان کاتژمێردا لەگەڵ هاوڕێکەمدا کە شەوی ڕابردوو هاوڕایی کردبووم، ڕێگای پڕ بەرد و کولۆی دەوری خانووەکەمان پێوا. کاتێک لە بەرامبەر محاجەرەکانی ئەمبارەوە هەمان شوێن کە دوێنێ شەو تەرمی هاوڕێکەمانی لێ بوو تێپەڕ بووین، هەستێکم بیر کەوتەوە کە

بەهۆی بینینی ڕووخساری مەیتەکەوە لەژێر ڕووناکی مۆمەکاندا تەنیبووەمەوە. پاشان ڕێک هەر لەو شوێنەی کە بەربڵاوی لەوەرگە لەژێر ڕووناکی مانگەشەودا دەبینرا ڕاوەستام و بە هاوڕێکەمم وت: "دەتوانم لێرە لە سەر چیمەنەکان (Gras) دابنیشم و بۆ ڕێزگرتن لە هاوڕێیانم سروودێک بخوێنم."(Singen) بەڵام لە کاتی وتنی ئەو ڕستەیەدا تووشی دوو هەڵەی زمانەوانی بووم. لەبری چیمەن (Gras)وشەی قەبر (Grab) و لە بری خوێندن (Singen) وشەی بردنەخوارەوە یان چوونەخوارەوە Sinken م بە کار هێنا. بۆیە ڕستەکە وەها واتایەکی هەبوو: "ئێمە دەتوانین لێرە لە قەبرەکەدا دابنیشین و سروودێک ببەینە خوارەوە". تەنها پاش دووەمین هەڵە لە واتای ڕستەکە تێگەیشتم لە حاڵێکدا بەبێ ئەوەی ئاگادا بم یەکەم دانەم چاک کردبووەوە. بۆ چرکەیەک بیرم لێ کردەوە و پاشان بە پێکەوەلکانی دوو هەڵەی زمانەوانی ئەو ڕستەیەم دروست کرد: "لە قەبرەکەدا ڕۆیشتنەخوارەوە (ins Grab Sinken)" و لەناکاو هەندێ وێنەی سەرسووڕهێنەر لە پێش چاومەوە تێپەڕ بوو، جۆرەکانی خوا کە ڕەقسیان دەکرد و بە فڕینەوە لە ڕووناکی مانگەشەودا، هاوڕێکەشمان لە تابووتەکەدا، بیرەوەرییەکی تر و لەقتە جۆراوجۆرەکان لە مەراسیمی ناشتن و هەست بە نەفرین و خەمکردن و بیرەوەریی هەندێ وتوویژ لەبارەی ئەگەری دەرکەوتنی نەخۆشی، ترسی بەرجەستەی هەندێ لە ئەفسەران. دوایی بە بیرم هاتەوە کە ئەو ڕۆژە ساڵڕۆژی مردنی باوکم بوو، ئەو بیرەوەرییە بووە هۆی سەرسوڕمانم، چونکە زۆر جار یادگەم باش نییە بۆ لەبەرکردنی بەروارەکان.

پاش ماوەیەک بیرکردنەوە هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوە: تەنانەت کاتژمێر و دۆخی ڕووناکی و شوێنی کارەسات و هەموو هەلومەرجێکی دەرەکی ئەو دوو شەوە. سەرەتا هەست بە

نیگەرانیکردنم لە کاتی قسەکردن لە بارەی ئەگەری دەرکەوتنی پەتا بە بیرم هاتەوە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە بیرم هاتەوە کە لە ناخی دڵەوە نەمدەهێشت ترسم بە سەردا زاڵ بێت. واتای (لە پاڵ یەک دانانی وشەکان 'Wir könnten ins Grab Sinken' دەتوانین بچینە ناو قەبر) بۆم دەرکەوت. لە هەمان کاتدا دڵنیا بوومەوە کە تەنها پاش چاککردنەوەی هەڵەی زمانەوانی یەکەم (Grab تابووت) لە بری وشەی (Grab چیمەن= ڕووەک)، ئەو چاککردنەوەیەی کە خۆم هیچ گرنگییەکم پێ نەدەدا تووشی دووهەمین هەڵەی زمانەوانی (Sinken چوونەخوارەوە)، لەبری (Singen سروودی خوێندنەوە) ببووم، تا گرێیەکی سەرکوتکراو بتوانێت دەربکەوێت.

دەبێ بڵێم لەو دەورانەدا خەوی زۆر ترسناکم دەبینی، یەکێک لە خزمە زۆر نزیکەکانم هاتە خەوم و من چەند جار دیم کە زۆر نەخۆشە و تەنانەت مردووە. ماوەیەک پێش ئەوەی بە دیل بکرێم بیستبووم لەو شوێنەی ئەو لێی ژیاوە پەتا لەوێ زۆر باو بووە و لە ترس و نیگەرانیدا لەگەڵ ئەو خزمەدا قسەم کردبوو. چەند مانگ پاش ئەو ڕووداوەی گیربوومەوە خەبەرم پێ گەیشت کە ئەو پانزە ڕۆژ پێش ئەو ڕووداوە بەهۆی پەتاوە گیانی لەدەست داوە.

٢٤- هەڵەی زمانەوانی لای خوارەوە بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا و ڕوون یەکێک لە کێشمەکێشە ناوخۆییە زۆر باوەکان لە بەین پزیشکەکاندا پیشان دەدات. ئەو پیاوەی بە ئەگەری زۆر تووشی نەخۆشی بێچارەسەری بوو، بەڵام هێشتا بە گشتی نەخۆشییەکەیان دیاری نەکردبوو، هاتە ڤیەننا تا ئاگاداری نەخۆشییەکەی بێت. پاشان لە یەکێک لە هاوڕێیانی سەردەمی منداڵی کە ببووە پزیشکێکی بەناوبانگ تکای لێ کرد تا چارەسەریی لە ئەستۆ بگرێت. پزیشک بە پێچەوانەی حەزی خۆی دەرئەنجام پێشنیارەکەی پەسەند کرد و پێی

وت بڕوات بۆ شوێنی حەسانەوە و پێشنیاری بنکەی دەرمانکردنی (ساناتۆریم)ـی پێ کرد. نەخۆشەکە بە نارەزایەتییەوە وتی: ئەو نووستنگەیە تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە (کلینیکێکی زاوزێکردنە). دکتۆر خێرا وەڵامی دایەوە: "ئۆ، نا، لەو نووستنگەیەدا تێدەچێت هەر نەخۆشێک بە کوشتن بدرێت... (un brigen) ببوورە دەمویست بڵێم لەخۆی گرت (unter bringen). پاشان هەوڵی دا تا لە کارتێکەری هەڵەی زمانەوانیی کەم بکاتەوە و زیادی کرد: "هیوادارم پێت وانەبێ مەبەستێکی خراپم هەیە." بەڵام دوای چارەکێک بە پەرەستارێک کە تا بەردەمی دەرگاکە ڕەوانە کرد وتم: "من شتێکم نەدۆزییەوە و پێم وا نییە ئەو تووشی ئەو نەخۆشییە هاتبێت کە دەڵێن، بەڵام ئەگەر تووش بووبێت بە ڕای من تەنها ڕێگای چارەسەری ئەوەیە کە ڕادەیەکی گونجاوی مۆرفینی پێ بدەم و ئنجا کار تەواوە." هەروەها با بڵێم ئەو نەخۆشە بە گوێرەی پەیوەندیی هاوڕێیانەی لەگەڵ پزیشکەکەدا لەگەڵیدا مەرجی کردبوو، ئەگەر دڵنیا بێت کار لە کار ترازاوە، بە دەرمان لە ئازار و دەرد ڕزگاری بکات. لەو ڕووەوە دکتۆر بە ڕاستی کوشتنی هاوڕێکەی هەڵبەت لە بارودۆخی تایبەتدا لە ئەستۆ گرتبوو.

٢٥- ئێستا زۆر ڕاڕا بووم، نموونەی هەڵەیەکی زمانەوانی زۆر پڕ واتا بگێڕمەوە هەرچەند ئەو کەسەی وتەکانی گێڕاوەتەوە ڕووداوەکە دەگەڕێتەوە بۆ بیست ساڵ لەوەوپێش. "ڕۆژێکیان ژنێک لە میوانییەکدا وتی (شێوەی قسەکردنی جۆری وروژان و کاریگەری هەندێ لە ئاراستە شاراوەکانی پیشان دەدا)، بەڵێ، ژن دەبێ جوان بێت تا پیاوان حەزی لێ بکەن، بەڵام مەسەلەی پیاوەکان ساکارترە. هەر ئەوەندە بەسە پێنج ئەندامی تەندروستیان هەبێت." ئەو نموونەیە میکانیزمی نهێنی هەڵەیەک بەهۆی تێکەڵبوون یان ئاڵوودەبوونەوە

پیشان دەدات. سەرەتا وا دێتە بەر چاو ئەو ڕستەیە لە تێکەڵبوونی دوو ڕستەی لای خوارەوە پێک هاتبن:

ئەوەندەی بەسە چوار ئەندامی تەندروستی هەبێت.

ئەوەندەی بەسە پێنج هەستی تەندروستی هەبوو بێت.

یان دەکرێ پەسەند بکرێت کە مادەی "تەندروست" بەهۆی دوو مەبەستی وتاری ڕستەکانی لای خوارەوە هاوشێوە بێت:

ئەوەندە بەسە ئەندامی تەندروستی هەبوو بێت.

هەروەها هەر پێنج ئەندامەکە ڕابگرێت.

کەواتە بەبێ بچووکترین لەمپەڕ دەکرێ قبوول بکرێت ئەو دوو ڕستەیە بوونە هۆی ئەوەی لە ڕستەی ئەو ژنەدا سەرەتا ژمارەیەک بە گشتی و پاشان ژمارەی نهێنیی پێنج لە بری ژمارەی بەڕواڵەت سروشتیتر چوار بێتە ئارا. ئەگەر ژمارەی پێنج لە ڕستەدا وەک هەڵەی زمانەوانی واتای تایبەتی خۆی نەدەبوو ئەو تێکەڵبوونە دروست نەدەبوو. واتای ژمارەی پێنج لێرەدا ڕاستییەکی ناشیرینە کە نابێ لە زاری ژنێکەوە ببیسترێت ئەو ڕاستییەی کە لەژێر ڕواڵەتێکی ڕازاوەوە حەشاردراوە. سەرنجی خوێنەر بۆ لای ئەم خاڵەی لای خوارەوە ڕادەکێشم، ئەو هەڵە زمانەوانییە گاڵتەجاڕییە بە شێوەیەک کە باس کرا لە هەمان کاتدا بە جۆرێک لە گاڵتەجاڕی دەژمێردرا. ئەگەر مەبەستی بێژەر لە وتنی ئەو ڕستەیە بە ئاگاوە بوو بێت، مەسەلەکە گاڵتەجاڕییە، بەڵام ئەگەر مەبەست بە نائاگاییەوە بوو بێت کەواتە ڕووبەڕووی هەڵەیەکی زمانەوانین، بەڵام ڕەفتاری ئەو ژنە پیشانی دەدات کە مەبەستی بە ئاگاییەوە نەبووە و مەبەستی گاڵتەجاڕی نەبووە. هاوشێوەبوون لە نێوان هەڵەی زمانەوانی و گاڵتەجاڕیدا دەتوانێت زۆر زیاتر بێت. بۆ نموونە سەبارەت بەو شتەی

ئۆ. رانک گێڕاویەتیەوە ئەو کەسەی تووشی هەڵەی زمانەوانی بووە دەرئەنجام وەها پێی پێدەکەنێت کە گوایە جۆرێک گاڵتەجاڕی لە خۆی نواندووە: "پیاوێک تازە ببووە زاوا، بەڵام هاوسەرەکەی کە زۆر نیگەرانی پاراستنی ڕواڵەت و جوانی و ڕووخساری سەردەمی عازەببوونی خۆی بوو، ئەوەندە خۆی لە قەرەی نەدەدا. ئەو پیاوەیش چیرۆکی لای خوارەوەی بۆ گێڕامەوە کە بووە هۆی پێکەنینی خۆی و هاوسەرەکەی:

شەوێکیان ئێمە دوورمان گرت لەو ڕێجیمە سەختەی کە هاوسەرەکەم بەسەرمدا سەپاندبووی. سبەی بەیانییەکەی هێشتا ژنەکەم لەناو قەرەوێڵەکەدا بوو، منیش لە ژووری نوستنەکەدا ڕیشم دەتاشی و پێشتریش ئەو کارەم کردبوو و کەڵکم لە ئیسفەنجی بۆدرەی دەموچاوی ژنەکەم وەرگرت کە لەسەر مێزەکە لە لای تەختەکەوە دانرابوو. ژنەکەم کە زۆر گرنگی بە ڕەنگی پێستی دەدا پێشتر قەدەغەی لێ کردم کەڵک لە ئیسفەنجەکەی وەرنەگرم. بۆیە کاتێک لە مەسەلەکە تێگەیشت بە نیگەرانییەوە وتی: "دیسانەوە خەریکی بە ئیسفەنجی بۆدرەکەت بۆدرەم پیادەکەیت؟" بەڵام کاتێک بینی قاقای پێکەنینم کردووە تێگەیشت تووشی هەڵەی زمانەوانی بووە، ئەو دەیویست بڵێت: "دیسانەوە خەریکی بە ئیسفەنجی بۆدرەکەم بۆدرە لە خۆت دەدەیت" ئەوەش بەشبەحاڵی خۆی دەستی بە پێکەنین کرد. (لە زاراوەی ناو خەڵکی ڤیەننادا Pudern– بۆدرەلێدان – بە واتای نزیکیکردنی سێکسی دێت و houppe– ئیسفەنجی بۆدرەلێدان– لێرەدا بە دڵنیاییەوە واتای سومبولێکی هەیە).

هاوشێوەبوون لە نێوان هەڵەی زمانەوانی و گاڵتەجاڕی لەوانەیە کە هەڵەی زمانەوانیش زۆر جار شتێک جگە لە جۆرێک کورتکردنەوە نییە.

٢٦- کچێکی گەنج کە خوێندنی ئامادەیی تەواو کردبوو وەک چاولێکەری کە ببووە مودێلی سەردەمی خۆی لە زانکۆی پزیشکیدا ناوی تۆمار کرد. پاش ساڵ و نیوێک خوێندن دەستی لە خوێندنی پزیشکی بەردا و دەستی کرد بە خوێندنی کیمیا. پاش چەند ساڵێکی تر بەو ڕستەیە لە گۆڕینی بەشەکەی قسەی دەکرد: "زۆر جار لە شیکردنەوەی جەستە نەدەترسام، بەڵکوو ڕۆژێکیان کە ناچار بووم نینۆکەکانی مردوویەک دەربێنم ڕقم لە بەشی کیمیا هەستا".

٢٧- ئێستا نموونەیەکی تر دێنمەوە کە شیکردنەوەی زۆر ئاسانە "مامۆستایەکی ئەناتۆمی (شیکردنەوەی جەستە) هەوڵی دا تا ئەو ڕادەیەی بۆی دەلوێت وەسفێکی زۆر ڕوون لە بەشی شیدارکردنەوەی لووتی بخاتە ڕوو کە دەمانزانی لە باسە زۆر دژوارەکانی شیکردنەوەی کەللەسەرە. کاتێک لە خوێندکارەکانی پرسی کە ئایا لە شرۆڤەکردنەکانی بە باشی تێگەیشتووە یان نا هەموویان، پێکەوە وەڵامیان دایەوە: بەڵێ مامۆستا. کە هەموو ئەویان بە کەسێکی لەخۆبایی و خودپەرست دەناسی بەشبەحاڵی خۆی وەڵامی دایەوە: "پێم وا نییە باش لێی تێگەیشتبن، چونکە ڕێژەی ئەو کەسانەی پێکهاتەی بەشی شیدارکەرەوەی لووت بە وردی بناسن لە ڕێژەی یەک پەنجە... ببوورن دەمویست بڵێم لە ڕێژەی پەنجەکانی یەک دەست زیاتر نییە".

٢٨- نموونەی لای خوارەوە قەرزاری دکتۆر أ. ربیتچەکم. ئەو ئەم نموونەیەی لە نووسەرێکی کۆنی فەرەنسییەوە بە ناوی (برانتۆم)ـەوە گێڕاوەتەوە. برانتۆم لە کتێبێکدا بە ناوی "ژیانی ژنان بنەمای ئەخلاق" دەنووسێت:

"یەکێک لەو ژنانەی کە دەمناسی لە کاتی قسەکردن لەگەڵ ژنێکی تردا کە لە ئەو جوانتر بوو باسی لە جوانی ئەو کردبوو و پیایدا

هەڵیدابوو، پاشان پێی وت: "نا، خاتوو، ئەو شتەی پێی دەڵێم بۆ هەڵخەڵەتاندن (adulterer)ـی تۆ نییە". هەڵبەت دەیویست بڵێت بۆ زمانلووسی (adulatrer) نییە و ڕستەکەیشی هەر بەو شێوەیە کرا، بە پاشی دەتوانی وێنای بکەیت کە ئەو دەیویست بەرامبەرەکەی هەڵبخەڵەتێنێت".

لە شێوازی چارەسەرکردنی دەروونی (سایکۆتراپی)دا کە من کەڵکم لێ وەردەگرت بۆ کۆمکردنەوە یان بەلاوەنانی هێماکانی ئازاری دەروونی، زۆر باوە کە لە قسەکردن و بیرکردنەوەکانی نەخۆشەکە بە دوای ناوەڕۆکێکدا بگەڕێم، هەرچەند نەخۆشەکە زۆر جار هەوڵ دەدات ناوەڕۆکی بیرکردنەوەی بگۆڕێت و تەنها بەهۆی ڕێکەوتێکەوە دەریببڕێت. لەو بوارەوە هەڵە زمانەوانییەکان زۆر کات سوودێکی زۆریان هەیە و من بە گوێرەی نموونەی زۆر بەئەزموون و لە هەندێ بوارەوە زۆر سەیر بڕوام بەو کارە کردووە. بۆ نموونە فلان نەخۆش لە بارەی پووریەوە قسە دەکات و بەبێ گرنگیدان بە هەڵە زمانەوانییەکەی، شێوەزاری "دایک"ـی بەکار دێنێت. یان ژنێکی تری نەخۆش سەبارەت بە مێردەکەی قسە دەکات و پێی دەڵێت "براکەم". لە مێشکی ئەو نەخۆشانەدا دایک و پوور، مێرد و برا "یەکسان" نین، یەک وەبیرهێنانەوە ئەوانە پێکەوە دەلکێنێت و لەو ڕووەوە هەر کامەیان ئەویتر بەبیر دێنێتەوە بەو واتایەی کە نەخۆشەکە ئەو دوو نەفەرە بە ناسێنەری یەکەیەکی هاوشێوە دادەنێت. یان پیاوێکی گەنجی تەمەن بیست سالان کە بۆ چارەسەر هاتبوو بۆ لام دەڵێت: "من باوکی کاک ن.م کە تۆ پزیشکی چارەسەرکردنەکەی بوویت... ببوورە دەمویست بڵێم برای ئەوم. ئەو چوار ساڵ لە من گەورەترە". من لەو هەڵە زمانەوانییە تێدەگەم، کە مەبەستی پیاوە گەنجەکە ئەوەیە "منیش وەک براکەم نەخۆشم و تاوانی ئێمە هەردووکمان لەسەر باوکمانە، جیا لەوە منیش بۆ چارەسەری هاتووم، بەڵام

چارەسەرکردنی باوکمان پێویستترە". هەندێ جار تێکەڵاوکردنی وشە نەشیاوەکان یان دەستەواژەیەکی بە ڕواڵەت ناچار بۆ دەرخستنی کاریگەری ئەندێشەی سەرکوتکراو لە قسەکانی نەخۆشەکەدا بەسە. قسەکانی نەخۆشەکە دەتوانێت مەبەستی جۆراوجۆری هەبوو بێت.

لەو ڕووەوە من تێکچوونە وتارییەکان کە دەتوانن لە ڕیزی "هەڵە زمانەوانییەکان"دا پۆلێن بکرێن نایگەڕێنمەوە بۆ تقارب، دەنگێکی تر. ئەو تێکچوونانە چ گرنگ و چ کەمبایەخ بن لەژێر کارلێکەری ئەو ئەندێشانەی لە دەرەوەی وتاردا پێک دێن، دۆزینەوەی ئەو ئەندێشانە بۆ ڕاڤەی هەڵەکان بەسە. هەڵبەت من حاشای لێ ناکەم کە دەنگەکان دەتوانن کاریگەری لەسەر یەک دابنێنن و ئاڵوگۆڕ بەسەر یەکتردا بهێنن، بەڵام ئەو یاسایانەی کە ئەو کاریگەرییانە دیاری دەکەن بە بۆچوونی من و لەخۆڕا بۆ تێکچوون و دەبڕینی باشی ڕستە و وشەکان بەس نییە. لەو بوارانەی توانیومە خوێندنەوە و بە قووڵی شیکردنەوە بکەم ئەو یاسایانە تەنها بوونی میکانیزمێکی پێشوتر پیشان دەدەن. هاندەرێکی دەروونی لە دەرەوەی ئەو قسانە لەو میکانیزمە سوود وەردەگرێت، بەڵام پەیوەندی لە نێوان هاندان و وتاردا بە هیچ شێوەیەک بەند نییە بەو میکانیزمەوە. لە زۆر بواری جێگۆڕکێدا هەڵەی زمانەوانی گوێ بە یاسای پەیوەندییەکانی شێوەی وتن نادات. لەو بارەوە بە تەواوی لەگەڵ بیرۆکەی وۆنتدا هاوڕام، بە بۆچوونی ئەویش هەلومەرجی هەڵەی زمانەوانی زۆر ئاڵۆزە و تەنها سەرچاوە لە کاریگەر سادەی تقارب دەنگەکان وەرناگرێت. هەڵبەت من "کاریگەری دەروونی لە دەرەوەی قسەکردن" بە تەواوی دادەنێم و لە بەرچاوی دەگرم، بەڵام دەبێ وەک وۆنت بڵێم بە بۆچوونی من هیچ کێشەیەک نییە قبوڵی بکەم، کە هەلومەرجی هەڵەی زمانەوانی بەو شێوەیەی کە مرینگەر و مایەر ڕوونیان کردووەتەوە، کاتێک بە خێرایی قسە دەکەین و لەگەڵ ئەوەشدا تووشی بێتەرکیزی دەبین، بە

ئاسانی ئەوە پێک دێت. سەرباری ئەوەیش لە هەندێ نموونەدا کە لەو دوو نووسەرە گێڕامەوە وا دیارە کە بارودۆخ ئاڵۆزترن. ئێستا ئەو نموونەیەی کە پێشتر هێنامەوە، دیسانەوە هەڵی دەسەنگێنم.

Es war mir auf der Schwest ...

Brust so schwer.

پەسەند دەکەم لەو ڕستەیەدا هونجی Schwe لە بری هونجیی Bru دانیشتووە، بەڵام ئایا مەسەلەکە تەنها هەر ئەوەیە؟ پێویست ناکات پێداگری لەسەر ئەو خاڵە بکەین کە هاندان و پەیوەندییەکی تر دەیانتوانی هەر ئەو جێگربوونە دابین بکەن. بە تایبەتی سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشم بۆ لای وەبیرهێنانەوەی نێوان ( Bruder – Schwester خوشک، برا)، یان بە وەبیرهێنانەوەی ( Brust der Schwester سنگی خوشک)، کە سەرنجمان بۆ لای ئەندێشەکانی تر ڕادەکێشێت. ئەو هاندەرە یارمەتیدەرە بە نهێنی کار دەکات و ئەو توانایە دەبەخشێتە ئەو نیوە وشەیە Schwe کە وەک هەڵەیەکی زمانەوانی خۆی دەربخات.

بۆ هەڵە زمانەوانییەکانی تر دەکرێ قبووڵ بکرێت، کە هاوشێوەبوونی زارەکی لەگەڵ وشەکان و واتا زەقەکاندا، بنەمای دابینکەری ئەوانەیە. بە ئەنقەست گۆڕینی وشە و ڕستەکان، کە کەسانی بێئەدەب زۆر چێژی لێ وەر دەگرن لە ڕاستیدا مەبەستێکی نییە جگە لە خۆهەڵواسینێکی سادە بۆ ئاماژەپێدان بە مەسەلە قەدەغەکراوەکان و ئەو یارییەش بە ڕادەیەک باوە کە سەیر نییە ئەگەر ئەو جۆرە گۆڕانە دەرئەنجام بەبێ مەبەست و ئاگادارکردنەوەی کەسەکان ئەنجام بدرێت.

لەم نموونەیەدا:

"Ich fordere Sie auf, auf das wohl unseres Chefs aufzustossen"

(داواتان لێ دەکەم بەختەوەری بەرپەرسەکەمان کاول بکەین).

لە بری:

Auf das Wohl unseres Chefs anzustossen

(بە سەلامەتی، بەختەوەری بەرپرسەکەمان بخۆینەوە).

زیادەڕەویمان نەکردووە ئەگەر هەڵەی زمانەوانی بە گاڵتەپێکردن و گاڵتەیەکی خۆنەویست، کە سەرچاوەکەی لە گاڵتە و گاڵتەیەکی خۆویستەوەیە دابنێین. ئەگەر من لە بری بەرپرسێک بوایەم، کە کارمەندەکەی ئەو ڕستەیەی لەگەڵ هەڵەی زمانەوانیدا پێ وت لەگەڵ خۆم بموتبا کە ڕۆمییەکان حەقیان بوو ئیجازە بە سەربازەکانی ئیمپراتۆریای براوە بدەن بە خوێندنی هۆنراوەی گاڵتەجاڕ ڕقی خۆیان بەرامبەر بەو دەربڕن.

مرینگەر دەیوت ڕۆژێکیان بەرامبەر بە کەسێک، کە بەتەمەنترین کەسی کۆمپانیا بوو و ناوی فەخری و بە حساب ناوی خۆمانەی (پیری ڕێزدار "senexl" یان "altes senexl")ی هەبوو وتویەتی " senex altest,prost" و کاتێک ئاگاداری هەڵە زمانەوانییەکەی بووەتەوە زۆر ترساوە. ئەگەر ئاگادار بووبین کە وشەی "Altesl" چەندە هاوشێوەیە لەگەڵ جنێوی "Esel Alter"دا (پیری تێنەگەیشتوو)، لە هۆکاری نیگەرانبوونی (مرینگەر) بە تەواوی تێدەگەیشتین، بێڕێزیکردن بەرامبەر بە بەتەمەنترین کەسی کۆمەڵگە (بۆ نموونە بێڕێزیکردنی باوکان بە منداڵەکانیان)، سزایەکی سەختی بەدواوەیە.

ئومێدەوارم خوێنەران ئەو جیاوازییانەی کە لە لێکدانەوەی هەڵە

زمانەوانییەکانـدا دامنـاوە، هەرچەنـد ئەو جیاوازیـانە ناکرێـت بە هۆکارهێنانەوەی دابڕاو بسەلمێنرێت بە تەواوی بە بێبایەخی دانەنێین. هەروەها ئومێدەوارم هەندێ نموونەم کۆ کردووەتەوە بیخەمە بەر تێبینی. ئەگەر پێ داگرم کە هەڵە زمانەوانییەکان تەنانەت سادەترینیان لە ڕواڵەتدا دەتـوانن ڕۆژێک بگەڕێنەوە بۆ هەندێ تێکچوون کە لە ئەندێشەیەکی نیوە سەرکوتکراو لە دەرەوەی ڕستە یان ئەو وتارەی کە دەیڵێین سەرچاوە دەگرێت، بەو هۆیەی ئەو تێبینییە زۆر سەیرەیە کە مرینگەر داویەتی. ئەو دەنووسێت: "سەیرە هیچ کەسێک نایەوێت هەڵە زمانەوانییەکەی قبووڵ بکات. کەسانی زۆر تێگەیشتوو و ڕێزدار هەن کاتێک پیان دەڵێن تووشی وەها هەڵەیەک بوون دەڕەنجێن". بە ڕای مـن نـاتوانین ئەو مەسـەلەیە تـا ئەو ڕادەیەی کە مـرینگەر بە نووسـینی وشـەی "هـیچ کەسـێک" پێیەوەی لکانـدووە بە ڕاشـکاوی هاوشـێوەی هێماکانی شـەرمنین و لە بواری چۆنیەتی لەگـەڵ هەندێ هێمـادا یەکسـانن کە لە کـاتی بێزاریـدا لە وەبیرهێنـانەوەی نـاوێکی لەبیرکراو یان سەرسوورمان لە بەردەوامی بیرەوەرییەکی بە ڕواڵەت بێبایەخمـان دەردەکەون، وەک ڕاسـتی دێـتە بەرچـاو کە لە هەمـوو بوارەکاندا هاندانی نەست دەستوەردەدات.

ئاڵوگۆڕی شـێوەی ئیرادی نـاوە تایبەتەکـان دەربڕی سـووکایەتی و بێـزارییە و لە زۆر بـواردا بە شـێوەی هەڵەی زمـانەوانی چاوەڕواننەکراو دەردەکەوێت، دەکرێت هەر ئەو واتایە پەیوەند بدرێت بەوەوە. "مـایەر" دەیگێـڕێتەوە کە کەسـێک بـۆ جـاری یەکەم لە بـری "فرۆید" منی بە "فریدۆر" بانگ کرد، چونکە چەند چرکە پێشتر ناوی "بروێر"ی هێنا بووە سەر زار و جارێکی تر کاتێک لە شێوەی ئێمە قسەی دەکرد ئەوەی ناو نا شێوەی "فروێر- برید" لە بری "فرۆید- بروێـر". ئەو کەسـە لەو هاوکـارانە بـوو کە شـێوازی منـی پەسـەند نەدەکـرد. مـن دوایـی لە بـارەی هەڵە نووسـینەکانەوە بـوارێکی تـر لە

ئالۆگۆڕی ناوەکان دێنمە سەر زار کە دەتوانێت هەر بەو شێوەیە پاساو بدرێتەوە.

لەو جۆر بوارە ڕەخنەییانەدا وەک هۆکارێکی شڵەژێنەر دەستێوەرە، کە دەتوانین لە بەرچاوی نەگرین، چونکە ئەو ڕەخنەیە پەیوەند نییە بە مەبەستەکانی کەسەکەوە لە کاتی قسەکردندا. بە پێچەوانەوە بەکارهێنانی ناوێک لە بری ناوێکی تر، تایبەتکردنی ناوی کەسێک، دیاریکردنی ناوێکی کەسایەتی کەسێک لەگەڵ هەڵەی زمانەوانی بە دڵنیاییەوە بە واتای ڕووشانی ناوبانگ و ئابڕووی ئەوە، بەڵام بە هەر هۆکارێک کاتێک تووشی وەها کارێک دەبین لە مەبەست و ئامانجمان بێئاگاین. کاک "فرنزی" ڕووداوێکی لەو جۆرە شرۆڤە دەکات کە سەبارەت بە سەردەمی خوێندنیەتی.

"کاتێک من خوێندکاری پۆلی یەکەمی ناوەندی بووم ناچار بووم، بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا لە کۆڕدا واتە لە بەردەمی هەموو هاوپۆلەکانمدا هۆنراوەیەک لەبەر بخوێنمەوە و کاتێک بینیم هاوپۆلەکانم خێرا پاش یەکەمین وشەکان کە هێنامە سەر زار دەستیان بە پێکەنین کرد و منیش بە واقوڕمانەوە لە شوێنی خۆم وشک مامەوە. مامۆستاکەشمان خێرا هۆکاری ئەو پێشوازییە چاوەڕواننەکراوەی پێ وتم. من ناونیشانی هۆنراوەکەم بە باشی خوێندبووەوە، بەڵام لە بری ناوی هۆنراوەبێژ ناوی خۆم هێنایە سەر زار. هەروەها ناوی شاعیر ئەلەکساندەر پتۆفی بوو. لەوانەیە هاوشێوەبوونی ناوەکان (چونکە ناوم ساندرۆ بوو) ببووە هۆی تێکەڵابوون، بەڵام هۆکاری سەرەکیی هەڵەکە بە دڵنیاییەوە ئەوە بوو کە من لەو دەورانەدا لە خەون و ئارەزووە شاراوەکانمدا خۆمم بە قارەمانی ڕووداوی ئەو هۆنراوەیە دادەنا. تەنانەت بە هوشیارییەوە بەرامبەر بەو کەسایەتیە خۆشەویستیم دەردەبڕی و ڕێزم لێ دەنا و

تاڕادەیەک ئەوم دەپەرست، سروشتییە ئەو گرێ شوومە سەرچاوەی گرتبوو لە بەرزەفڕییەکانی خەونی من، کە بەرپرسی ئەو هەڵ ڕەفتارییە بوو".

دووەمین بوار "داگیرکردنی ناوی ئەو کەسە" پزیشکێکی گەنج بۆی گێڕامەوە. ئەو کە پیاوێکی شەرمن و زۆر بە ئەدەب بوو کاتێک دەیویست خۆی بە پرۆفیسۆرێکی بەناوبانگ بە ناوی "ویرشۆ" بناسێنێت، وتی: "من دکتۆر ویرشۆ"، پرۆفیسۆر ویرشۆ ڕووی لێ کرد و پرسی: "سەیرە، ناوی تۆش ویرشۆ"یە؟ من نازانم ئەو گەنجە بەرزەفڕە بە چ شێوەیەک هەڵە زمانەوانییەکەی پاساو دا، ئایا وتی کە لە بەردەم کەسێکی بەناوبانگ و پلە بەرزدا ئەوەندە هەستی بە بچووکی کردووە کە ناوی خۆشی لەبیر کردووە، یان ئەوەندە ئازا بووە دان بەوەدا بنێت ئومێدەوارە ڕۆژێک وەک دکتۆر ویرشۆ ببێتە کەسایەتییەکی بەناوبانگ و هەروەها بەو شێوەیەیش داوا لە کاک ویرشۆ وەزیری ڕاوێژ دەکات ڕەفتارێکی سووکایەتی ئاسای لەگەڵدا نەکات. بەهەرحاڵ، بە دڵنیاییەوە یەکێک لەو دوو هۆکارە (ڕەنگە هەردووکیان، هاوکات) بووە هۆی ئەوەی کە ئەو لە کاتی ناساندنی خۆیدا تووشی هەڵە ببێت. من بە چەند هۆکارێکی شەخسی ناچارم لەبارەی لێکدانەوەی نموونەی لای خوارەوە بە شێلکاری بۆچوونم دەرببڕم.

لە کۆنگرەی نێونەتەوەیی ساڵی ١٩٠٧ی زایینیدا لە شاری ئەمێستەردامدا ئەو هەڵسەنگاندنەی کە من لە نەخۆشی هیستریا خستمە ڕوو باسێکی زۆری هێنایە ئاراوە. یەکێک لە ڕکابەرەکانم وەها گروتینێکی لە ڕەخنەکانیدا دەردەبڕی کە بووە جێگری من و چەند جار لە بری من قسەی کرد بۆ نموونە دەیوت: "دەزانی من و برویر پیشانمان داوە..." لە حاڵێکدا دەیویست بڵێت: "فرۆید و برۆید

پیشـانیان داوە..." لە نێـوان نـاوی مـن و ئەو کەسـەدا هـیچ جۆرە هاوشێوەییەک لە ئارادا نییە. ئەو نموونەیە و چەند نموونەیەکی تر لەو بوارەدا، واتە هەڵەی زمانەوانی لەگەڵ جێگۆڕکێی ناوەکاندا پیشان دەدات کە پێکهاتنی هەڵەی زمانەوانی هیچ پێویستییەکی بە ئاسانکاری بەهـۆی هاوشـێوەیی سـەرزارەکیدا نیـیە و دەتوانێـت بەهـۆی ئەو پەیوەندییە نهێنیانەی کە جۆریەتی دەروونیان هەیە پێک بێت.

لە بوارەکـانی تـر و پڕواتـاتردا ڕەخنـەگرتن بەرامـبەر بە خـود یـان خۆڕاگری دەروونی لە بەرامبەر ئەو شتەی دەمانەوێ بیڵێین دەبێتە هـۆی ئەوەی ڕسـتەیەک بە واتـای دژبەر ببێـتە جێگـری ڕسـتەیەکی گونجـاو. لەو بـوارەدا بە سەرسـووڕمانەوە تێـدەگەم ئـەمە ڕسـتەی دڵنیاکەرەوەیە، جەختلەسەرکەر یان ڕەخنەئامێز دژە لەگەڵ مەبەستی ڕاسـتەقینەی بێـژەردا و ئەو هەڵە زمـانەوانییەی کە ڕاسـتگۆیی و یەکرەنگی نییە دەریدەخات. لێرەدا هەڵەی زمـانەوانی وەک پانتۆمیم (جووڵەی بە بێدەنگ لە شانۆدا) کار دەکات. جیا لەوەیش زۆر جار ئەو هەڵە زمـانەوانییە نهێنییەکانمـان دەردەخـات و دەکەوێتە خزمەتی دەربڕینی بابەتێک، کە ئارەزوومان بۆ دەربڕینیان نییە. نموونەی لای خوارەوە لەو شێوەیەیە:

"مامێکمان هەبوو لە دەستمان نیگەران بوو، چونکە چەند مانگ دەبوو نەچبـووین سـەردانی بکەیـن. کاتێـک بیسـتمان چـووەتە خـانووە نـوێیەکەی و کەلـوپەلەکەی گواسـتووەتەوە لەو دۆخە کەڵکمـان وەرگرتـوو ڕۆیشـتینە مـاڵی. ئەو لە بینینمـان زۆر خۆشـحاڵ دەهاتە بەرچـاو و کاتێـک دەمانویسـت ماڵئـاوایی بکەیـن بە زارێکـی پـڕ لە خۆشەویستی پێی وتین: "ئومێدەوارم لەمە بەدواوە کەمتر بتانبینم".

لە بـارودۆخی گونجـاودا زۆر جار وشـەکان دەبنە هـۆی دەرکەوتـی هەڵە زمانەوانییەکـان، کە وەک دەربڕینـی لەناکـاوی نهێنیـیەک

دەمانتەنیتەوە یان وەک گاڵتەجارێی خۆش و گونجاو دەبێتە هۆی پێکەنین. بۆ نموونە ئەو بوارەی کە دکتۆر ڕیتلەر بینی و وتی، لەو جۆرەیە:

ژنێک بە زارێکی ستایش کردنەوە بە ژنێکی تری وت: "بەڕاستی کڵاوە نوێیەکەت زۆر جوانە، ئایا خۆت بەو هەموو خۆپەسەندییەوە ئەوەت ڕازاندووەتەوە؟ (aufgepatzt لە بری aufgeputzt ڕازاوەتەوە). ئەو وەسفکردنەی ئەو دەیویست لە هاوڕێیەکەی بیکات هەر لێرەدا دابڕا، چونکە ئەو ڕەخنەیەی کە لە ناخی دڵیەوە گرتبووی بۆ ڕازاندنەوەی کڵاوەکە (Hutaufputz) کە بە بۆچوونی خۆپەسەندانە(eine patzerei ) دەهاتە پێش چاو بە هەڵەیەکی زمانەوانی نەگونجاو بە تەواوی ئاشکرا بوو و ڕستە وەسفکەرەکانی تری ڕواڵەتی نەیدەتوانی ڕاستگۆیانە بێتە بەرچاو. لە نموونەی لای خوارەوەدا مەبەستی ڕەخنەگرانە هەرچەند توند نییە، بەڵام زۆر ڕوون دیارە:

"ژنێک چوو بۆ سەردانی هاوڕێیەکی. ژنی خاوەن ماڵ بە زۆربڵێیەکی تەحەموولنەکراو و بێ ڕاوەستان ئەوی بە تەواوی هیلاک کرد. بەهەرحاڵ، میوانەکە توانی قسە بە هاوڕێیەکەی ببڕێت و داوای ڕۆیشتنی لێ بکات. بەڵام ژنە خاوەن ماڵەکە کە ئەوی تا ڕاڕەوی دەرگەی سەرەکی ڕەوانە کرد، بۆ ماوەیەک میوانەکەی لەسەر پێ ڕاگرت و لە بەرامبەر دەرگەی سەرەکیدا ڕایگرت و بە شەپۆلێک لە قسەی بێزارکەر سەری هێنایە ژان. لە ئاکامدا خانمی میوان توانی بە پرسینی پرسیارێک قسە بە هاوڕێیەکەی ببڕێت، پاشان پرسی: "ئایا لە ڕاڕەوی سەرەکی (Vorzimmer) ماڵەوەن؟" هاوڕێیەکەی بە سەرسووڕمانەوە سەیری کرد و خانمی میوان لە هەڵەکەی خۆی تێگەیشت. لە ڕاستیدا کە میوانەکە لە ڕاوەستان لە ڕاڕەوەکەدا هیلاک

ببوو، دەیویست بپرسێت: "ئایا بەیانیان (Vormittag) لە ماڵەوەیە؟" ئنجا بەو شێوەیە لە زۆربڵێیی هاوڕێیەکەی ڕزگاری بوو. بەلام هەڵەی زمانەوانی بە ڕاشکاوی پیشانی دا دیسان درەنگکەوتن زۆر بێتاقەتی کردووە.

نموونەی لای خوارەوە کە دکتۆر "ماکس گراف" پێی وتم، هێمای نەبوونی لەسەرخۆبوون و زاڵبوون بەسەر خۆیدایە: "لە کۆبوونەوەی گشتی لیژنەی پەیامنێرانی "کنکۆردیا"، یەکێک لە ئەندامە گەنجەکان کە چالاک بوو قسەیەکی توندی بۆ دژایەتی بەرامبەر بە بۆچوونی خەڵک دەربڕی و چونکە تووڕە بوو ئەو وشانەی هێنایە سەر زار: "برادەرانی ئەندامی مزاییدە... (Vorschussmitglieder) یان کومێتەی (Aussschussmitglieder) لە ڕاستیدا ئەندامانی کومیتە و نووسنگە حەقیان بوو لەگەڵ مزاییدەکاندا ڕێ بکەن و وتەبێژەکە چەند چرکە پێش ئەوان داوای سلفەی کردبوو".

بەو شێوەیەی لە نموونەیVorschwein دا دیمان کاتێک دەمانەوێت جنێوێک نەهێنینە سەر زار هەڵەی زمانەوانی بە ئاسانی پێک دێت. لەو ڕووەوە هەڵەی زمانەوانی جۆرێکە لە جیابوونەوە:

نموونە: پیاوێکی وێنەگر سوێندی خواردبوو بۆ ئەو کارمەندە ناشی و بێ کارامانەی خۆی دوورەپەرێز بێت لە بەکارهێنانی ناوی ئاژەڵەکان. ئەو ڕۆژێکیان بە یەکێک لە خوێندکارەکانی کە خەریکی بەتاڵکردنی سەتڵێکی پڕ بوو و نیوەی لە سەتڵەی بەسەر زەوییەکەدا دەڕژاند وتی: "کاکە گیان تۆ دەبێ سەرەتا نەختێ لەو شلەمەنییانە بکەیتە ناو دەبەیەکی تر." مەسەلەکە تەنها ئەوە بوو کە ئەو لە بری وشەی ( Sehöpfenلە قاپێک بۆ ناو قاپێکی تر) وشەی(Schäfsen لە وشەی Schaf بە واتای پەز) بەکار بهێنێت و خێرا بە یەکێک لە کارمەندەکانی کە بە هەڵە یەک دوو دەرزەن کاغەزی بەنرخی خراب

کردبوو وتی: "وادیارە شاخەکانتان سووتاوە Horn verbrannt" ئەو دەیویست بڵێت "دەستتان سووتاوە.(Hand verbrannt)"

نمـوونەی لای خـوارەوە نمـوونەیەکی زۆر سـەیرە لە دانپیادانـانی نائەنقەسـت بەهـۆی هەڵەیەکـی زمانەوانییـەوە. هەنـدێ لە بـارودۆخی رووداوەکە پاساو دەهێننەوە، کە بۆچی "ئێ. ئێ. بریل" لە بابەتەکەی خۆیدا ئەو هەڵەیەی بە تەواوی گێڕاوەتەوە.

"شـەوێکیان مـن و دکتـۆر (فرینـک) پیاسـەمان دەکـرد و لە بـارەی مەسەلەی کۆمەڵگەی دەروونشیکاری کارکردن لە نیۆیۆرکدا قسەمان دەکرد. یەکێک لە هاوڕێکانی دکتۆر ر.م بینی، کە چەند ساڵ لەوەوبەر نەمبینیبوو و لە ژیانی تایبەتی هیچ ئاگادار نەبووم. هەردووکمان لە چـاوپێکەوتنی یەک خۆشـحاڵ بـووین، بە پێشـنیاری مـن ڕۆیشـتینە کافتریایەک و دوو کاتژمێری تەواو وتـووێژێکی تێروتەسـەلمان کرد. وا دیـارە دکتـۆر ر. لە ژیـانی تـایبەتی مـن ئاگـادارە، چـونکە لە کـاتی چـاکی چۆنیـدا ئەحـواڵی منـداڵەکەمی پرسـی و وتـی زۆر جـار لە هـاوڕێیەکی هاوبەشـمان ئەحـواڵم دەپرسـێت و لەوەتەی گۆڤارەکـان بـابەتە پزیشـکییەکانم چـاپ دەکەن حەزی لە کارەکـانمە. کاتێـک لێـم پرسی هاوسەرگیری کردووە یان نا، وەڵامـی نەرێنی دایەوە و وتی: "پیاوێکی وەک من بۆچی دەبێ هاوسەرگیری بکات؟" لە کاتی چوونە دەرەوە لە کافتریا لەپڕ ڕووی تێ کردم و وتی: "زۆر پێم خۆش بوو بزانم ئێوە لە دۆخێکی وەهادا چیتان دەکرد؟ من پەرستیارێک دەناسم کە وەک شەریکی تاوان لە دادگایەکی تەڵاقدا ئامادە بوو. ژنێک دژی مێردەکەی شـکاتی کـردووە و تـاوتوێی پەیوەنـدی ئەو پەرستیارەی لەگەڵیدا کردبوو، پاشان مێردەکەی توانی تەڵاق وەربگرێت." من لێرەدا قسەم بە دکتۆر ر. بری و وتم: "دەتەوێ بڵێت کە ژنەکە توانی تەڵاق وەربگرێت." هاوکارەکەم خێرا قسـەکەی گـۆڕی و وتـی: "هەڵبەت ئەو

ژنە توانی تەڵاق وەربگرێت." پاشان شرۆڤەی بۆ کردم کە دادگایی و هەرا و دەنگەدەنگ بەهۆی ئەو کارە بە ڕادەیەک کاریگەری لەسەر ئەو ژنە پەرستیارە دانا کە پەنای بۆ مەشرووباتی کهولی برد، عەسەبی بە تەواوی تێک چوو و... هتد. دەرئەنجام دەمویست پێی بڵێم بە چ شێوەیەک دەکرێ ئەو ژنە چارەسەر بکرێت. لەگەڵ ئەوەی کە باسم لەسەر هەڵەکەی کرد و تکام کرد هۆکارەکەیم بۆ بڵێت ڕووبەڕووی هەمان وەڵامی سەیر و ئاسایی بوومەوە: "ئایا جیا لەوە کە هەموومان تووشی هەڵە دەبین؟ بەهەرحاڵ، ڕووداوێک بوو کە ڕووی دا و بە دواداچوونی واتاکەیشی کارێکی بێهوودەیە و هتد." وەڵامم دایەوە کە هەموو هەڵەیەکی زمانەوانی چەند هۆکار و مەبەستی هەیە و ئەگەر ئەو پێشتر پێی نەوتبووم هاوسەرگیری نەکردووە من دەموت قارەمانی ئەم چیرۆکەی کە ئێستا شرۆڤەی بۆ کردووم هەر خودی ئەو بێت، چونکە هەڵەی زمانەوانی ئەو ئارەزووەی دەربڕی کە دەیویست دادگا بە سوودی ئەو نەک بە سوودی هاوسەرەکەی کۆتایی پێ بێت تاکو ئەو بتوانێت لە نیۆرکدا هاوسەرگیری بکات و ئیتر نەفەقەی هاوسەرەکەی لە ئەستۆ نەگرێت و بیدات. هاوکارەکەم بە ئینکارییەوە حاشای لە قسەکانم کرد، بەڵام لە هەمان کاتدا بەرپەرچدانەوەیەکی زێدڕۆیی پیشان دا و هێما بەرجەستەکانی وروژاندن تیایدا دەرکەوت. بەهەرحاڵ، قاقای پێکەنینی لێدا و کاتێک تکام لێ کرد بەهۆی ڕاڤەکردنی زانستی مەسەلەکەوە ڕاستییەکە بڵێت، بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "ئەگەر ناتانەوێ درۆیەک لە زمانی من ببیستن دەبێ بڕوا بکەن، کە سەڵتم و دڵنیا بە شرۆڤە دەروونییەکەتان بە تەواوی هەڵەیە". پاشان وتی: "کەسانێکی وەک تۆ کە گرنگی بە وردەکارییە بێواتاکان نادەن، کەسانێکی مەترسیدارن." ئنجا چاوپێکەوتنێکی تری بیر هاتەوە و لەگەڵ ئێمەدا ماڵئاوایی کرد و ڕۆیشتت.

"سەرباری ئەوەیش من و دکتۆر فرینک لە دروستی شرۆڤەکان دڵنیا بووین. لەو ڕووەوە بڕیارمان دا لە شوێنێکی تر هەندێ زانیاری بەدەست بهێنین تا بەڵگەیەک بۆ پەسەندکردن یان ڕەتکردنەوەی شرۆڤەکانم بەدەست بهێنم. پاش چەند ڕۆژێک ڕۆیشتم بۆ بینینی یەکێک لە دراوسێکانم، کە ئەویش هاوڕێی کۆنی دکتۆر ر. بوو. تەنانەت جەختی لەسەر وردەکارییەکانی بۆچوونی کردەوە: دادگاییەکە چەند هەفتەیەک لەوەوبەر پێک هاتووە و دەڵێن پەرەستیارەکەیش هاودەستی دکتۆر ر. بووە. ئێستا دکتۆر ر. بە تەواوی دڵنیایە لە دروستی میکانیزمەکانی فرۆید.

لە بارەی ئەم مەسەلەیەی لای خوارەوە کاک ئۆ. ڕانک وتوویەتی بێگومان دانپیادانانی خۆنەویست بە ڕاشکاوی دیارە.

"باوکێک کە هەستی نەتەوەپەرستانەی نەبوو دەیویست منداڵەکانی بەبێ پەرەپێدان بەو جۆرە هەستانە کە بە بێهوودەی دادەنا بەخێو بکات. ئەوە کوڕەکانی کە لە خۆپێشاندانی نەتەوەپەرستانەدا بەشدارییان نەکردبوو، لۆمە دەکرد. ئەوان وەک سومبولی نەتەوەپەرەستی ناوی مامیان هێنایە سەر زار. باوکی هاواری کرد: "ئێوە نابێ بە هیچ شێوەیەک مامتان بکەن بە سومبول. ئەو کەسێکی گەمژەیە"(idiot) ، بەڵام کاتێک بینی منداڵەکانی لە بیستنی ئەو ڕستەیە مات و سەریان سوڕما تێگەیشت تووشی هەڵەیەکی زمانەوانی بووە، داوای لێبوردنی کرد و وتی: "هەڵبەت مەبەستم ئەوەیە ئەو کەسێکی نەتەوەپەرەستە.(Patriote)"

کاک (ئەشتەر) بوارێکی گێڕایەوە، کە تیایدا کەسێک دانی پێدا ناوە بە تووشبوونی هەڵەی زمانەوانی نارەزایەتییەکی نائەنقەستی ئەنجام داوە. کاک ئەشتەر کاتێک بەدوای ڕووداوێکی وەهادا خاڵێکی زۆر بەبایەخی پیشان داوە، کە هەڵبەت لە سنووری لێکدانەوەیەکی ساکار

زیاتر ڕۆیشتووە.

"ژنێک کە پزیشکی ددان بوو، بەڵێنی بە خوشکەکەی دا ڕۆژێک تاقیکردنەوەی بۆ بکات تاکو بزانێت ئاستی کەناری دوو ددانی کاکیلە گەورە بەرکەوتنیان ئاساییە یان نا (واتە ئایا ماوەیەک لە نێوانیاندا هەیە کە پاشماوەی خواردنەکانی تیا بمێنێتەوە). بەڵام چونکە ماوەیەک درێژەی خایاند و بەڵێنەکەی جێبەجێ نەکرد، خوشکەکەی بە گاڵتەوە وتی: "ئێستا خوشکەکەی چارەسەر دەکات، بەڵام خوشکەکەی دەبێ چاوەڕێ بکات". دەرئەنجام خوشکی پزیشکی ددانەکە ئەو تاقیکردنەوە پزیشکییەی بەڵێنی دابوو جێبەجێی کرد و کونی بچووکی لە یەکێک لە ددانەکانیدا بینی. وتی: "پێم وا نەبوو ددانت ئەوەندە خراپ بێت. پێم وا بوو تەنها نەقد (Kontant) نییە... دەمویست بڵێم بەر (Kontakt) ددانەکانی تر ناکەوێت." خوشکەکەی بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: "سەیر دەکەیت. تەنها ڕەزیلییە بووە هۆی ئەوەی من لەو نەخۆشانەی کە پارەی نەقد دەدەن زیاتر چاوەڕێم بهێڵیتەوە." وا دیارە من مافی ئەوەم نییە ئەندێشەکانم بەمە پاڵ خانمە پزیشکەکە، یان دەرئەنجامێکیان لێ وەربگرم، بەڵام کاتێک ڕووداوی ئەو هەڵە زمانەوانییەم بیست لەبەر خۆمەوە بیرم لێ کردەوە کە ئەو دوو خوشکە جوان و زیرەکە سەڵتن و گەنجێکی زۆر کەم دەناسن و لە خۆمم پرسی ئایا ئەگەر پارەیەکی نەقدی زۆریان هەبوایە ڕێژەی پەیوەندییەکانیان بۆ هاوسەرگیری زیاد نەدەبوو؟

ئەم نموونەیەی لای خوارەوە لە ت. ڕیک تێهەڵکێش دەکەم: ئەو هەڵە زمانەوانییەیش دەتوانێت واتای دانپیادانانی خۆنەویست لەخۆ بگرێت:

"کچێکی گەنج دەبوا لەگەڵ پیاوێکدا، کە حەزی لێی نەبوو دەسگیرانداری بکردایە. باوک و دایکی هەردووکیان بۆ دابینکردنی

پەیوەندییەکی نزیکتر چاوپێکەوتنێکیان لە نێوان ئەو دوو گەنجەدا ڕێک خست. کچەکە بە ڕادەی پێویست لەسەرخۆ و کارامە بوو و دەیتوانی زۆر بە ئەدەبەوە وەڵامی ئەو خوازبێنیکەرە کە بە ئەدەبەوە ڕەفتاری دەکرد پیشان بدات کە ئارەزوویەکی بەرامبەر بەو نییە. سەرباری ئەوەیش کاتێک دایکی پرسی کە بۆچوونی لە بارەی ئەو پیاوەوە چییە بە ئەدەبەوە وەڵامی دایەوە: "ئەو بە ڕاستی بێزارکەر (Liebenswidrig)لە بری خۆشەویست(Liebenswürdig)ە بەکار هێنا.

کاک و. تۆسک لە بارەی دانپیادانی نائەنقەستی زۆر سەیر لەگەڵ ڕێگاچارەی بێ زیان لە بابەتێکدا بە ناوی "باوەڕی باوکان"دا بڵاو کردووەتەوە.

"چونکە دەسگیرانەکەم مەسیحی بوو و نەیدەویست ببێتە جوولەکە، من ناچار بووم بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا دەست هەڵبگرم لە ئاینی جوولەکە و ڕوو بکەمە مەسیحیەت. هەرچەند لە ناخی دڵەوە ئارەزووم بۆ گۆڕینی ئاین نەبوو، بەڵام وام بیر دەکردەوە ئەو ئامانجەی هەمە پاساوی مەسیحیبوونم دەکات، بەتایبەت کە بیروباوەڕی ئاینییەکی زۆرم نەبوو و تەنها بەهۆی پەیوەندی خێزانییەوە جوولە بووم. بەهۆی هاتن بۆ ناو ئاینی جوولەکە هەرگیز حاشام لە ئاینی جوولە نەکرد و لە نێوان ناسراوان و هاوڕێیاندا زۆر کەم کەس دەیانزانی بوومەتە مەسیحی. دەسکەوتی هاوسەرگیریمان دوو کوڕ بوو، کە هەردووکیان بە گوێرەی ئاینی مەسیحی غەسلی تەعمید بوون، کاتێک تەمەنیان گەیشتە ڕادەی پێویست باسم لە باب و باپیرانی جوولەکەیان کرد تا پروپاگەندەی دژە جوولەکەی باو و بڵاوکراوە لە خوێندنگە بیانوویەکیان بەدەستەوە نەدات کە بەبێ هیچ هۆکار و هۆیەکی پاساوهێنەر ڕوو لە باوکیان وەربگێڕن.

چەند ساڵ لەوەوبەر پشووەکانم لەگەڵ کوڕەکانم، کە لەو کاتەدا خوێندکار بوون لە شاری د. لە لای خێزانێکدا تێپەڕ دەکرد. باوکی خێزانەکە مامۆستا بوو. ڕۆژێکیان ژنی خاوەن ماڵەکە (ئەو و مێردەکەی هەردووکیان موحیبەتیان پێ کردین) کە ئاگای لە ڕیشەی جوولەکەبوونمان نەبوو چەند قسەیەکی توندوتیژی بەرامبەر بە جوولەکەکان کرد. من دەبوایە بەرامبەر بە توندوتیژبوونی ئەو وەڵامێکی توندم بە قسەکردن بدایاتەوە تا کوڕەکانم فێر بکەم، کە دەبێ بە ئازایەتییەوە بەرگری لە خۆیان بکەن، بەڵام چونکە بە پێویستم زانی ڕاڤەیەکی ناخۆش بە دوای ئەو دانپێدانانە بدەم پاشگەز بوومەوە و شتێکم نەوت. جیا لەوەیش ترسام وەڵامەکەم ببێتە هۆی ئەوەی ئەو نشینگەیە بەجێ بهێڵم و پشووە کورت ماوەکانمان لەدەست بڕوات. هەرچەند ئەگەر بەرگریم لە جوولەکەکان بکردایە ڕەنگە خانەخوێکە بیزانیبا ئێمە جوولەکەین و ڕەفتارێکی دژمنانەی لەخۆ بگرتبا. سەرباری ئەوەیش بەهۆی ئەو ترسەی نەکا کوڕەکانم کە وەک من هیچ هۆکارێکیان بۆ دوورەپەرێزی لە باسکردن نەبێت لە ئاکامدا ڕاستگۆیانە و ساویلکانە قسەیەک بکەن و ڕاستییەکی شووم بدرکێنن، بڕیارم دا دووریان بخەمەوە و ئەوانە بنێرمەوە بۆ باخ تا زیاتر لەوە وتووێژەکەمان نەبینن. وتم: "جوولەکەکان، بڕۆن بۆ باخەکە." ئنجا خێرا پیاچوومەوە "کوڕەکان..." (تێکچوونی وشەی Jadenجوولەکە) بە وشەی (Jungen کوڕەکان). لەو ڕووەوە ناچار بووم تووشی هەڵەیەکی زمانەوانی بم تاکو پیشان بدەم کە "ئازایەتی بەرگری لە بیروباوەڕم" تیایە. لەوانەیە خانەخوێکە لە واتای هەڵەی زمانەوانی تێنەگەیشتبێت و هیچ دەرئەنجامێکی لێ وەرنەگرتبێت، بەڵام ئەو ڕووداوە بۆ من وانەیەکی بەئەزموونی باش بوو: کاتێک ئێمە پیاوین و چەند کوڕێکمان هەیە ناتوانین حاشا لە باوەڕی باپیرانمان بکەین و چاوەڕێی هیچ جۆرە سزا و قەرەبوویەک

نەکەین:

ئێستا بواریکی پر مەترسیدار دەخەینە روو. هەڵبەت ئەگەر لە کاتی قسەکردندا بەرپرسی دادگا ئەو نموونەیە بۆ کلیکشینی هەڵەکانی ئەم کتیبەی ئیستا لە بەردەستدایە پیشنیار نەدەکرد، لە گواستنەوەی دووریمان دەگرت:

"سەربازیک کە تاوانبار کرابوو بە دزی لەگەڵ لیدان و کوتەکدا، وەها وەلامی پرسیاریکی دایەوە لە بارەی دۆخی لەخۆگرتنی سەربازییەوە: "من ئیستا بەشیکم لە سوپای پاشکەوت. چونکە هیشتا کوتاییم بە خزمەتەکەم نەهیناوە." لانی کەم ئەو دەیویست ئەو بابەتە دەرببرێت، بەلام لە بری کەلکوەرگرتن لە وشەی دروستی Dienststellung تووشی هەڵەی زمانەوانی بوو و وتی:(Diebsstellung وشەی Diebبە واتای دزە).

کاتیک پزیشک هەوڵ دەدات مەسەلەیەک بسەلمینیت، بەلام نەخۆشەکە ئینکاری لەسەر دەکات بۆ رەتکردنەوەی و هەڵە زمانەوانییەی لە کاتی دەروونشیکاریدا جەخت لەسەر بۆچوونی پزیشک دەکاتەوە، ئەو هەڵەیە زور سەیر دیتە بەرچاو. "رۆژێکیان سەرقالی لیکدانەوەی خەونیک بووم کە ناوی یۆنەر Jaunerـی تیدابوو. ئەو نەخۆشەی خەونەکەی بینیبوو کەسیکی بەو ناوە دەناسی، بەلام ئیمە بە هیچ شیوەیەک نەماندەتوانی تیبگەین کە بۆچی ئەو کەسە لە خەوندا دەرکەوتووە. من لەسەر ئەو مەرجە دامنا کە بوونی ناوی یۆنەر Jaunerبەهۆی هاوشیوەبوونی لەگەڵ وشەی جنیوی (فیلباز، ساختەچی"Gauner") دەتوانیت پاساو بدریتەوە. نەخۆشەکە بە تووڕەیی و توندییەوە بۆچوونی رەتکردمەوە، بەلام لە حالیکدا بۆ رەتکردنەوەی ئەوە هەوڵی دەدا تووشی هەڵەیەکی زمانەوانی بوو کە تیایدا پیتی G ببووە جیگری پیتی J. ئەو پیی وتم تیۆرییەکەت بیینەما

و بێ بنەڕەتە. بەڵام لە بری وشەی دروستی gewagt وشەی jewagtی بەکار هێنا کە لە زمانی ئەڵمانیدا نییە. من سەرنجم خستە سەر هەڵەکەی و هەر ئەو کارەیش بووە هۆی ئەوەی جەخت لە سەر لێکدانەوەکەم بکەم.

کاتێک کە لە باسێکی جدیدا یەکێک لەو دوو کەسەی تووشی هەڵەیەکی لەم شێوەیە دەبنەوە، واتە لە بری وشەی مەبەست وشەیەک بە مانای دژ بە یەک بەکار دێنێت بە گوێرەی بەرامبەرەکەی خۆی لە بارودۆخێکی خراپتردا دادەنرێت و بە دەگمەن ڕوو دەدات کە بەرامبەرەکەی لە بارودۆخی باشتری خۆی کەڵک وەرنەگرێت.

چەندین هۆکار بە ئاشکرا پیشانی دەدەن کە خەڵک بە شێوەیەکی گشتی هەمان واتا دەبەخشنە هەڵە زمانەوانی و هەڵە ڕەفتارییەکان، کە ئێمە لەم کتێبەدا تێبینیمان خستەر سەر. ئەوانە لە حاڵێکدا لە بواری تیۆرییەوە ڕێکەوت نین لەگەڵ ڕوانگەکانماندا لە پراکتیکدا ئامادە نابن دەست لە هەندێ ئیمتیاز بەر بدەن کە بەشبەحاڵی خۆیان نەبوونی سەرنجی کەسانی تر و هەڵە ڕەفتارییەکانیان بۆ دابین دەکات. پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی، کە هەڵەزمانەوانییەکان لە ساتە هەستیارەکاندا بە دوایدا یەت پیشان دەدات بە پێچەوانەی ئەو شتەی ڕای گشتی پروپاگەندە دەکات ئەو هەڵە زمانەوانیانە تەنها پەلەپیتکەی سادە و بێواتایە و بچووکترین بایەخی دەروونناسیانەی نییە. کەسێکی خاوەن کەسایەتی و خاوەن پلەوپایەی وەک وەزیری گەورە "بولۆ" کە لە نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٠٧ـی زاینی دەیویست لە کەسی ئەمپراتۆر بەرگری بکات و بارودۆخی ئەو ڕزگار بکات، لە قسەکردنەکەیدا تووشی هەڵەیەکی زمانەوانی بوو و ئەو کارەیش دەیتوانی ڕکابەرەکانی ڕازی بێت کە حەق بە ئەوانە و وتی:

"لە بارەی دۆخی ئێستا و نرخی نوێ کە گیۆ لۆم دیاری کردووە،

دەبێ هەمان بابەت کە پار وتوومە دووپاتی دەکەمەوە. بەو واتایە کە دروست و یەکسان نییە سەبارەت بە گرووپێکی ڕاوێژکاری بەرپرس قسە بکەین، کە ئیلهامبەخشی ئیمپراتۆرن. (خەڵکەکە هاواریان کرد: نا لێپرسراو). بەڵی، دەمویست بڵێم ڕاوێژکارانی نا لێپرسراو. لە هەڵە زمانەوانییەکەم دەبوورن؟

واتای ڕستەی شازادە بولۆ بەهۆی یەکەمین ڕستەی نەرێنی بە بۆچوونی هەندێ کەس شارابووەوە. جیا لەوەیش خۆشەویستی قسەکەر و دژواربوونی ئەنجامدانی ئەرکەکەی واتا ئەو کێشەیە کە هەموو کەسێک ئاگایان لێ بوو بووە هۆی ئەوەی هیچ کەسێک بیر لەوە نەکاتەوە کە لە هەڵەی زمانەوانی کەڵک وەربگرێت، بەڵام لە بارەی هەڵەیەکی زمانەوانی تر کە پاش چەند ساڵێکی تر لە هەمان شوێنی "ڕایشتاگ"دا لە لایەن یەکێک لە نوێنەرانی پەرلەمانەوە ئەنجام درا دۆخەکەیش هەر بەو شێوەیە تێپەڕ نەبوو. ئەو دەیویست بڵێت بەبێ هیچ جۆرە ڕووگیربوونێک(rückkhaltlos) بە ئیمپراتۆری بڵێت، بەڵام بە پێچەوانەی حەزی خۆی هەستی ڕاستەقینەی درکاند. وتی:

(بە پێی ڕۆژنامەی نەتەوەیی ئەڵمانیا) "ئێمە دەبێ مەسەلەی دە برینامەکە لە بواری فەرمانی کارە ڕۆژانەییەکانمان دابنێین. بۆیە ڕایشتاگ حەقی بوو دەربرنامەیەکی لەو جۆرە بۆ ئەمپراتۆر بنێرێت. بە ڕای ئێمە یەکگرتنی ئارەزووەکان و دەنگی نەتەوەی ئەڵمانیا وا بە پێویست دادەنێت کە ڕێک بکەوین دەمانەوێ چ ڕاستییەک بیگەیەنینە ئەمپراتۆر. هەرچەند دەبێ ئەو کارە بە گوێرەی هەستە داواکارەکەمان ئەنجام بدەین، بەڵام مافی ئەوەمان هەیە ئەو کارە بە دانەواندنی سەر (rückgratlos)، (پێکەنینی پڕ ژاوەژاوی خەڵکەکە چەند خولەکێکی خایاند)، برادەران من دەمویست بڵێم بەبێ ڕووگیربوون

(rückhaltlos)نەک بە دانەواندنی سەر (rückgratlos) ئەنجام بدەین و هیوادارم لە دەورانی دژواری ئیستادا ئەمپراتور خۆشەویستی بۆ دەبڕینە ڕاستگۆیی و ڕاشکاوەکانی نەتەوەکەی هەبوو بێت".

ڕۆژنامەی "فوروورتێس" لە ژمارە ١٢ـی نۆڤەمبەری ١٩٠٦ بۆ ئاشکراکردنی واتای ئەو هەڵە زمانەوانییە کۆتایی نەهات و نووسی: "دانەواندنی سەر لە بەرامبەر تەختی ئیمپراتۆردا: هیچ کام لە نوێنەرانی پەرلەمان باشتر لە کاک لاتمەنی دژەجوولەکە شێوەی ڕەفتاری خۆی و زۆرینەی لیژنەی ئەمپراتۆری لە بەرامبەر پاشا بە دانپیادانانێک دەرنەبڕیوە. ئەو لە دووەمین ڕۆژی وەدەرهاتنی لە قەیرانی وتەبێژییەکی پڕ ئاڵۆز دەربڕی، کە ئەو و هاوڕێیانی دەیانەوێت بە دانەواندنی سەر ڕاستییەکان بە ئیمپراتۆر بڵێن. قاقای پێکەنین کە لە ئەنجامی دەربڕینی ئەم قسانەوە بوو، درێژەپێدان بە قسەی ئەو پیاوە چارەڕەشەی تێک دا، ئەو بۆ داوای لێبووردنکردن کەوتە پتەپت و بە پێداگرییەوە جەختی لەسەر دەکردەوە و مەبەستی هەبووە بڵێت: "بەبێ ڕووگیربوون (rückhaltlos)".

لە پەردەی یەکەمدا، لەقتەی پێنجەم، لە نمایشنامەی ولێن ئەشتاین پیکولیمینی لەگەڵ کچی ولێن ئەشتاین ڕۆیشتووەتە ئوردۆگا و لە سوودەکانی ئاشتی ئاگادار بووەتەوە. ناردراوی دەربار و باوکی مارکس بە توندی سەریان سوڕ ماوە و نمایشنامەکە درێژەی هەیە.

"کستانبرگ: چ بەدبەختییەکی گەورەیە. دۆستان، کارەکانمان گەیشتووەتە کوێ؟ ئایا دەستی لێ بەردەدەین تا بە خەونەکانی خۆی لێرەوە بڕوات؟ بانگی لێ ناکەین و چاوەکانیان لەسەر ڕاستیەکان هەڵنایەنین؟

ئوکتاو (کە لە بیرکردنەوە قووڵەکان سەر هەڵ دێنێت): چاوەکانم

کراوەیە و ئەو شتانەی دەبینم پێم خۆشە.

کستانبێرگ: هاوڕێکەم، مەسەلەکە چییە؟

ئۆکتاو: نەفرین لەم سەفەرە.

کستانبێرگ: بۆچی؟ چی بووە؟

ئۆکتاو: وەرن. دەبێ خێرا بە دوای ئەو شوێنپێیەدا بڕۆین و بە چاوی خۆم ببینم...

وەرن.

(دەیەوێت ئەوە لەگەڵ خۆی بەرێت)

کستانبێرگ: تۆ چیت لێ دێت؟ دەتەوێ بڕۆیت بۆ کوێ؟

ئۆکتاو (بە خێرایی): بەرەو لای ئەو ژنە.

کستانبێرگ: بەرەو لای...

ئۆکتاو (بە هەڵەکەیدا دەچێتەوە)، بەرەو لای "دۆک."

ئەو هەڵە زمانەوانییە سادەیە: "بەرەو لای ئەو ژنە" لە بری "بەرەو لای ئەو پیاوە" پێمان پیشان دەدات، کە باوکەکە هۆی لاینگری کورەکەی دۆزیوەتەوە لە حاڵێکدا کە پیاوی دەربار گلەیی هەیە کە "لەو مەتەڵە هیچ تێناگات."

کاک ئۆ. ڕانک لە بازرگانی ڤێنیزیدا بەرهەمی شکسپیر نموونەیەکی تری لە بەکارهێنانی شاعیرانەی هەڵەکە دۆزیوەتەوە. من بابەتەکەی ئەو لە گۆڤاری دەروونیشکارییەوە دەگێڕمەوە.

"لە نمایشنامەی شاعیری ڤێنیزیدا (پەردەی سێیەم، لەقتەی دووەم) نموونەی هەڵەیەکی زمانەوانی لە ئارادیە کە لە بواری شاعیرانەوە مەبەستێکی زۆر ناسکی هەیە و لە بواری هونەرییەوە بە شێوەیەکی

درەوشاوە دەردەکەوێت. ئەو نموونەیە وەک ئەو نموونەیەی فرۆید لە ولێن ئەشتایندا دۆزیویەتیەوە دەیسەلمێنێت کە هونراوەبێژان بە باشی میکانیزم و چەمکی هەڵە ڕەفتارییەکان بە باشی دەناسن و مەرج لەسەر ئەوە دادەنێن کە خوێنەران لە چەمکەکەی تێبگەن.

"پۆرتیا" بە زۆری باوکی دەبێ بە یانسیب هاوسەرێک هەڵبژێریت، بەڵام بەخت پشتیوانی بووە و توانیویەتی هەموو ئەو خوازبێنیانەی بە دڵی نەبووە ڕەتیان بکاتەوە. ئەو دەرئەنجام دڵی داوەتە "باسانیۆ" و دەترسێت نەکا لە قورعەکەدا ڕووبەڕووی شکست بێتەوە و دەیەوێت بەو بڵێت تەنانەت لەو کاتەشدا دەتوانێت لە خۆشەویستی ئەو دڵنیا بێت. لە کاتی کێشمەکێشی دەروونیدا شاعیر ئەو وشانە دێنێتە سەر زار. پۆرتیا لە بارەی خوازبێنیی حەزلێکراوی دەڵێت:

"تکات لێ دەکەم، مەڕۆن." ڕۆژێک دوان پێش ئەوەی خۆتان بدەن بە دەستی چارەنووسەوە هەر لێرە بمێننەوە، چونکە ئەگەر هەڵبژاردنەکەت دروست نەبێت لە ئامۆشۆ لەگەڵتدا بێبەری دەبم. کەواتە تەحەموول بکە. ئەو هەستەی (کە خۆشەویستی نییە) پێم دەڵێت کە بە لەدەستدانت خەفەتی پێ دەخۆم... دەتوانم ڕێنوێنیتان بکەم و فێرت بکەم چۆن بیر بکەیتەوە، بەڵام نامەوێت سوێندەکەم بشکێنم، بۆیە ڕەنگە تۆ نەتوانیت لەگەڵمدا هاوسەرگیری بکەیت و پاشان تووشی ئەو خەفەتە دەبم کە بۆچی سوێندەکەمم نەشکاند، ئاخ چاوەکانت سەراپامیان خستۆتە لەرزە و ڕۆحمیان شەق کردووە. نیوەیەک لە بوونم گرێدراوی تۆیە و ئەو نیوەکەشی هەر هی تۆیە... دەمەویست بڵێم... هی منە، بەڵام ئەو نیوەیە هەرچەند گرێدراوی منە هی تۆیشە کەواتە هەموو بوونم گرێدراوی تۆیە".

پۆرتیا تەنها دەیویست ئاماژە بە خاڵێک بکات، کە لە ڕاستیدا دەبوایە بێدەنگ بمایاتەوە، ئەو تەنانەت پێش هەڵبژاردنی قورعەکە "باسانیۆ"ـی

خـۆش دەویـت و خـۆی بـە گرێـدراوی ئەو دادەنێـت. شـاعیر ئەو بـابەتەکەی لە ڕێگـای هەڵەیەکـی زەمـانەوانییەوە ئاشـکرا کـردووە. شسـکپیر بە باشـی تێـدەگات کە بەو شـێوەیە نەبـوونی دڵنیـایی تەحەمولنەکراوی دڵدارەکە لەناو دەبات و هەم بینەرانیش لە بارەی دەرئەنجامی باسانیۆوە لە نیگەرانیی زۆر ڕزگار دەکات.

بە پێی ئەوەی نووسـەران و شـاعیرانی گەورە بە هەڵسـەنگاندنمان لە هەڵە زەمانەوانییەکان ڕێکەوتێکی زۆر سەیریان هەیە، پێم وایە دەکرێ نموونەیەکی تر لەو جۆرە لە کاک ئێ. جۆنس بگێڕینەوە:

"ئوتۆرەنگ لەم دواییانە گۆڤارێکی دەرکردووە و سـەرنجمان بۆ لای نمـوونەیەکی سـەرنجڕاکێش ڕادەکێشـێت. لەم نمـوونەیەدا شکسـپیر هەڵەیەکی زەمانەوانی دەخاتە پاڵ پۆرتیا قارەمانی چیرۆکەکە و لەو ڕووەوە بیروباوەڕی شاراوەی ئەو بۆ بیسەرێکی ورد ڕوون دەکاتەوە. مـن دەمەوێ نمـوونەیەکی هاوشـێوە تێهەڵکێش بـکەم لە ڕۆمـانی "خۆپەرسـت" شـاکاری ژۆرژ مردیـت لێـرەدا بیهێـنمەوە. چیرۆکـی کتێبەکە بە شێوەیەکی زۆر کورت بەم شێوەیەیە: سرڤیلۆگبی پاترن دەوڵەمەندزادەی متمانەپێکراوی دەوڵەمەنەکان لەگەڵ خاتوو کنستانتیا دۆرهام دەبنـە دەسگیرانی یـەکتر. خـاتوو کنسـتانتیا خۆپەرسـتییەکی زۆر سـەیر لە دەسـتگیرانەکەیدا دەبینێـت، کە لە بەرچـاوی خەڵـک شـاراوەتەوە. ئەو بـۆ هەڵاتـن لە هاوسـەرگیری لەگـەڵ پیـاوێکی خۆپەرستدا، لەگەڵ کاپیتانێک بە ناوی ئۆکسفۆرد ڕادەکات. پاش چەند ساڵێک دەسگیرانی، هەمان پیاوی دەوڵەمەند لەگەڵ کلارا میدلیتۆندا ئەنجـام دەدرێـت. بەشـێکی گرنـگ لە کتێـبەکە وەسـفی هەنـدێ کێشمەکێش دەکات کە لە دڵ و ناخی خاتوو کلارادا پاش دەرکەوتنی خۆپەرستییەکی بەرجەستەی دەسگیرانەکەی پێک دێت. هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئارەزووی پاراستنی حەیا و ئابڕوو، خاتوو کلارا پابەند

دەکات بە پەیمانی وەفاداری، بەلام ئەو رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر دەستگیرانەکەی سووکوسەلیم دەکات. کلارا هەندێک جار لە لای ڤرنۆن ڤتیفۆرد (کە لە ئەنجامدا هاوسەرگیری لەگەلدا دەکات) دەردەدل دەکات. ئەو پیاوە سکرتێر و کوڕی مامی پاترینە. بەهۆی وەفاداری بۆ پاترین و بە هۆکاری جۆراوجۆر دوورەپەرێزی دەکات لە یارمەتیدان.

لە کاتی قسەکردندا کلارا باس لە خەم و خەفەتەکانی دەکات و دەلێت:

"ئۆ. دەکری دەولەمەندیک من لەم رۆژ و دۆخەدا ببینێت و یارمەتیم نەدات بۆ هەلاتن لەم زیندانە پڕ ئازار و رەنجە. من بە تەنها ناتوانم رێگایەک بۆ رزگاربوون بدۆزمەوە. من ئیرادەم سستە. پێم وایە پەلەپیتکەیەک بەسە تا بگۆڕێم. دەمتوانی پەنا بەرمە بەر دۆستی بە جەستە و گیانێکی خوێناوی، بە سووککردن و هاواری لۆمەئامێز و ئەو نەفرینەی بە دوامدا دێت. کنستانیا رووبەرووی ئەفسەرێک بووەوە. رەنگە دوعای کرد و دوعاکەیشی گیرا بوو. کارێکی باشی نەکرد. ئۆ، بەلام من ئەوەندە بەهۆی ئەو کارەوە خۆشم دەوێت. ناوی ئەو پیاوە هاری ئۆکسفۆرد بوو (...) کنستانتیا گومانی نەکرد زنجیرەکانی پچڕاند بەبێ رووگیربوون قسەی بەرامبەری کرد. کچی ئازا و دلێر تۆ لە بارەی منەوە بەم شێوەیە دادوەری دەکەیت؟ بەلام من بە تەنهام و کەسێکی وەک هاری وتیفۆرد لە لامدا نییە".

دەربڕینی ناوی ڤتیفۆرد لە بری ئۆکسفۆرد بە لای کلاراوە ئیلهامێکی لە ناکاو بوو، ئەوی گۆڕاند و خوێن هاتە ناو رووخسارییەوە.

ئاسانە ئەگەر پاشگری "فۆرد"ـی هاوبەش لە هەردوو ناوەکەدا ئەو تێکەلبوونە ئاسان بکاتەوە و زۆربەی کەسەکان تەنها بەو راڤەکردنە رازی دەبن. بەلام نووسەری هۆی راستەقینە و قوولمان پێ نیشان دەدات.

هەر ئەو هەڵە زمانەوانییە لە بەشێکی تر لە چیرۆکەکەدا ڕوو دەدات و بە دوایدا سەرلێشێوایی خێرا و ئاڵوگۆڕی لەناکاو پێک دێت. دەروونشیکاری و توێژینەوەکانی یونگ لە بارەی وەبیرهێنانەوەکانەوە دەمانناسێنێت بەو دیاردانەی کە تەنها لە کاتی دەستێوەردانی گرێیەکی نیوە نەست دەردەکەوێت. پاترێن لە کاتی قسەکردن لە بارەی ڤتیفۆرد بە زارێکی پارێزەرانەوە دەڵێت: "ئاگادارییەکی بە درۆ. ڤێرنۆنی پیر بە هیچ شێوەیەک ناتوانێت بچووکترین کارێکی سەیر ئەنجام بدات." پاشان کلارا وەڵام دەداتەوە. بەڵام ئەگەر ئوکسفۆرد... ڤیتفۆرد... ئۆ. سەیری ئەو قازانە بکە کە بەسەر دەریاچەکەدا تێپەڕ دەبن کاتێک تووڕە دەبن چەندە جوانن. ڕاستییەکەی دەمویست چیت لێ بپرسم؟ ئۆ. بەڵێ، بە بۆچوونی تۆ بە لای مرۆڤێکەوە نائومێدکەر نییە کاتێک ببینێت هەموو کەسێک هان و ستایشی کەسێک دەکەن؟" ئەو قسانە بۆ ڤیلۆگبی دۆزینەوەیەکی لەناکا بوو و ئەو پڕاوپڕ لە لەخۆباییبوون و خۆپەرستی هەستایە سەر پێ.

لە بەشێکی تر لە چیرۆکەکەدا کلارا بە هەڵەیەکی زمانەوانی لە ئارەزووی شاراوەی بۆ پەیوەندییەکی نزیکتر لەگەڵ ڤێرنۆن و تیفۆرددا دەیدرکێنێت. ئەو لە کاتی قسەکردن لەگەڵ پیاوێکی گەنجدا دەڵێت: "ئەمشەو بە ڤێرنون بڵێ... ئەمشەو بە کاک ڤتیفۆرد بڵێ... و..." ئەو شێوە توێژینەوەیەی لێرەدا بۆ هەڵە زمانەوانییەکان پێشنیاری دەکەین لە هەموو ئەزموون و تاقیکردنەوەکاندا دروستی خۆیان پیشان دەدەن و تەنانەت پڕواتاترین بوارەکان جەختکردنەوەیەکە لەسەر ئەو شێوازە. من چەندین جار توانیومە دەستنیشانی بکەم، کە هەڵە زمانەوانییەکان تەنانەت بە ڕواڵەت سروشتیترینیان چەمکێکیان هەیە و دەتوانن وەک تێبینی بوارەکان شرۆڤەیەکیان بەدواوە بێت.

یەکێک لە نەخۆشەکانم کە دەیویست بە پێچەوانەی ڕای منەوە بۆ گەشتێکی کورتخایەن بڕوات بۆ بۆداپێست و هەوڵی دەدا لە لای من پاساو بۆ کارەکەی بۆ بهێنێتەوە، دەیویست بڵێت کە تەنها بۆ سێ ڕۆژ لەوێ دەمێننەوە، بەڵام تووشی هەڵەی زمانەوانی بوو و وتی: "تەنها بۆ سێ هەفتە". ئەو بەو شێوەیە پیشانی دا سەرەڕای ئیمتیازەکانم بە باشی دەزانێت سێ هەفتە -نەک سێ ڕۆژ- بمێنێتەوە لەو کۆمەڵگەیەی کە بە ڕای من بە لایەوە گونجاو نەبوو.

شەوێکیان دەمویست داوای لێبووردن لە هاوسەرەکەم بکەم، چونکە کاتی گەڕانەوەی لە شانۆ بە دوایدا نەچووم بیهێنمەوە. وتم: "من کاتژمێر دە و دە خولەک لە بەردەمی شانۆدا بووم." ئەو قسەکەی منی ڕاست کردەوە و وتی "مەبەستت دە خولەک بۆ دەیە" هەڵبەت دەمویست ئەم دووەم ڕستەیە دەرببڕم، چونکە ئەگەر کاتژمێر دە و دە خولەک بە دوایدا بڕۆیشتبام ئیتر داوای لێبووردنەکەم پاساوێکی نەبوو، چونکە پێیان وتبووم کە نمایشەکە پێش کاتژمێر دە کۆتایی پێ دێت. کاتێک گەیشتمە بەردەمی هۆڵی شانۆکە گڵۆپی ڕاڕەوەکە کوژابووەوە و ئیتر کەسێک لەوێ نەبوو. نمایشەکە زووتر لە کاتی خۆی تەواو ببوو و هاوسەرەکەم چاوەڕێی منی نەدەکردبوو.

سەیرێکی کاتژمێرەکەم کردبوو و بینیبووم، کە میلی کاتژمێرەکە پێنج خولەک بۆ دە پیشان دەدات. بەڵام بڕیارم دابوو لە ماڵەوە وا دەربخەم، کە زووتر لەو کاتژمێرە چوومەتە شانۆکە. بەداخەوە هەڵە زمانەوانییەکە مەبەستی منی بەتاڵ کردەوە و درۆ بچووکەکەمی درکاند و ئاشکرای کرد. بۆیە بەو داوای لێبوردنەی کردم تاوانەکەمی لەو شتەی هەبوو گەورەتر پیشان دا.

ئێستا دەبێ شرۆڤە لە بارەی تێکچوونی وتاری کۆتایی بکەم و باس لە تێکچوونەکانی تر بکەم، کە ناتوانن وەک هەڵەی ساکاری



CamScanner

زمانەوانی وەسف بکرێن، چونکە وشەیەکی جیاکراو ناگۆڕن، بەڵکوو وەک ئەو کەسانەی سەرزاریان گتی هەیە (زمانگیرییان هەیە) و قسەکان دەجوون یان بێ واتایە، لە مۆسیقای قسەکردن و شێوەی وتنی هەموو ڕستەکە یان قسەکردنەکە کارلێکەری هەیە، بەڵام بوارەکانی ئەو گرووپە وەک ئەو بوارانەی تا ئێستا باسمان لێیەوە کرد هێمای کێشمەکێشێکی دەروونییە، کە بە هەڵەی وتاری دەردەکەوێت. من لە ڕاستیدا بڕوا ناکەم کەسێک بتوانێت لە کاتی ئامادەبوونی لە بەردەم ئیمپراتۆردا لە کاتی دانپیادانان بۆ خۆشەویستی تووشی هەڵەی زمانەوانی نەبێت یان کاتێک، کە دەبێت لە بەرامبەر ئەندامانی دادگادا لە شەرەف و ئابڕوو و ناوبانگی خۆی بەرگری بکات واتە بە کورتییەکەی لەو بوارانەی کە بە هەموو جەستە و ناخەوە دەیەوێت مەسەلەیەک بگێڕێتەوە تووشی هەڵەی زمانەوانی نەبێت. کاتێک دەمانەوێت لە هۆکاری هەڵەیەکی زمانەوانی جیاکراوە تێبگەین دەبێ بنەما و بنەڕەتی شرۆڤە پێویستەکان تەنانەت لە هەڵسەنگاندنی ستایلی نووسەردا دەستوەر بدەین.

شێوازی نووسینی ڕاشکاو و ڕوونی نووسەر پیشان دەدات کە خۆی لە گەڵ خۆیدا لە ئاشتیدایە و هەموو جارێک کە شێوەی پڕ ئاڵۆز و دەستکرد و ناسەقامگیر دەربکەوێت دەتوانین بەبێ هیچ ترسێک ڕووبەڕووی هەندێ ئەندێشەی ئاڵۆز و نادیار ببێتەوە کە لەگەڵ نەبوونی متمانەدا خراونەتە ڕوو، گوایە نووسەر مەبەستێکی نهێنی و ڕەخنەئاسای شاردووەتەوە.

لە کاتی بڵاوبوونەوەی یەکەمین چاپی ئەم کتێبەدا تا ئێستا هاوڕێیان و هاوکارانی دەرەکی سەرنجیان خستووەتە سەر ئەو هەڵە زمانەوانیانەی کە لە وڵاتانی باوی خۆیاندا بینیویانە. هەروەها کە چاوەڕێ دەکرێت دۆزیویانەتەوە یاساکانی ئەو دیاردەیە لە هەموو

زمانەکاندا یەکسانە. لەو ڕووەوە ئەوانە پەنایان بردووەتە بەر هەمان لێکدانەوە کە مـن لە نموونەکانمـدا باسـم کـردوون و لەو بـارەوە سەرکەوتوو بـوون. ئێسـتا لە نێوان ئەو هەزار نمـوونەیەی ئاگاریان بوومەتەوە تەنها یەک نموونە باس دەکەم. دکتۆر بریلا لە نیۆرکەوە نووسیویەتی:

A friend described to me a nervous patient and wished to know whether I could remove benefit him. I remarked , I believe that in time I could remove all his symptoms by psychoanalysis because it is a durable case wishing to say "curable."

(هـاوڕێیەک بـارودۆخی نەخۆشـێکی دەروون ئـازاری پـێ وتـم و دەیویست بزانێت ئایا دەتوانم چارەسەری بکەم. من پێشنیارم بۆ کرد گومان دەکەم بتوانم لە کاتی خۆیدا ئەو کارە بکەم و دەتوانم هەموو هێماکـانی نەخۆشـییەکە بە دەروونشـیکاری لەنـاو بەرم، چـونکە نەخۆشییەکەی بوارێکی درێژ خایەنە، هەڵبەت دەمویست بڵێم "شیاوی چارەسەرکردنە."

بەشی شەشەم

هەڵەی خوێندنەوە و نووسین

هەڵەی خوێندنەوە یان نووسینی وشەکان، وەها سەرسووڕمانێکی لەگەڵ هەڵەی زمانەوانیدا هەیە کە تێبینییەکانمان لە بارەی هەڵەی زمانەوانییەوە دەکرێ پەیوەند بێت بەو جۆرە هەڵانەوە. لەو ڕووەوە ئاماژە بە چەند نموونەیەک لەو بارەیەوە دەکەین کە بە وردی شی کراوەنەتەوە، بەڵام ئەو دیاردەیە بە گشتی ناخەینە بەر توێژینەوە.

یەکەم: هەڵەی خوێندنەوە (بە هەڵە خوێندنەوەی وشە و ڕستەکان):

١- لە کافتریادا دانیشتبووم و گۆڤارێکی وێنەداری "لایپسی گێر"م بە خواری لە پێش چاوم گرتبوو و لاپەڕەکانم هەڵدەدایەوە و لە سەرووی وێنەیەکی گەورەوە، کە هەموو لاپەڕەکەی لەخۆ گرتبوو یەکێک لە ناونیشانەکانم خوێندەوە: "هاوسەرگیری لە ئۆدیسەدا" (in der odyssee)، بە وردبینی و سەرسووڕمانەوە گۆڤارەکەم بردە پێشەوە و ڕستە ڕاستییەکەم خوێندەوە: "هاوسەرگیری لە بالیتیک. (An der ostsee)" بۆچی تووشی هەڵەیەکی وەها ببووم؟ خێرا کەوتمە یادی کتێبێک کە بەرهەمی "ڕۆت" بوو بە ناوی "بەدواگەڕانە هەستییەکان لە بارەی خەونی مۆسیقا و ئەو جۆر شتانە" کە لەم دواییانەدا زۆر سەرنجی ڕاکێشابووم، چونکە باسی لە بارەی هەندێ مەسەلەی دەروونناسییەوە دەکرد کە من توێژینەم لەسەر دەکرد. نووسەر لەو کتێبەدا بڵاوکردنەوەی کتێبێکی تری ڕاگەیاندبوو بە ناوی "شیکردنەوە و یاسای بنەڕەتی ئەو دیاردانەی بەندن بە خەونەوە". خۆ ڕوونە بە بێتاقەتییەوە چاوەڕێی ئەو کتێبەم دەکرد کە بڵاو بکرێتەوە، چونکە لەم دواییانەدا خۆم بەرهەمێکم بە ناوی "زانستی خەونەکان"ـەوە چاپ کردبوو. لە پێرستی بابەتەکانی ناو کتێبی "خەونی مۆسیقا"دا پارەگرافێکم دۆزییەوە لە بارەی بە

وردی سەلماندنی ئەو بیرۆکەیە: ئەفسانە و قارەمانەکانی یۆنانی کۆن لە خەوبینین و خەونی مۆسیقا و لەو دیاردانەی گرێدراون بە خەون و وڕینەوە، سەرچاوە دەگرن. خێرا سەیری بابەتەکەم کرد تا دڵنیا بم ئایا نووسەر ئەو لەقتەیەی کە "ئۆلیس" لە بەرامبەر "ناسیکا"دا دەردەکەوێت گرێی دەداتەوە بە خەونێکی ساکاری ڕووتەوە، یان نا. یەکێک لە هاوڕێکانم سەرنجی ڕاکێشام بۆ چیرۆکێکی زۆر جوان لە کتێبی "هانری لوور". لەو بەشەدا، "کیلێر" ئەم ڕووداوەی کتێبی ئۆدیسەی وەک "بە فەرمی ناسین" بۆ خەونی دەریاوانێکی سەرگەردان و دوور لە نیشتمانەکەی وەسف کردووە. من بەشبەحاڵی خۆم پەیوەندییەک لە نێوان ئەو لەقتەیە و خەونێک لە ناوەڕۆکی نمایشکردنی ڕووتبوونەوەدا دەبینم و ئەو لێکدانەوەیەم زیاتر کردبوو (لە چاپی پێنجەمی کتێبەکەدا)، بەڵام لە بەرهەمەکەی "ڕۆت"دا، ڕاڤەیەکی وەها بوونی نەبوو. ڕوون و بەرچاوە، کە ئەو مەسەلانە زۆر بیری سەرقاڵ دەکردم.

٢- ڕۆژێکیان لە ڕۆژنامەیەکدا لە بری ڕستەی "تێپەڕبوون لە ئەورووپا بە پێی پەتی("Zu fuss)" ئەو ڕستەیەم خوێندەوە: "تێپەڕبوون لە ئەورووپا لە بەرمیلێکدا (Im fass)" ئەو هەڵەیە چۆن ڕووی دا؟ یەکەمین بیرکردنەوە لەو بارەوە بە مێشکمدا هات ئەوە بوو: بێگومان مەسەلەی بەرمیلەکەی "دیۆژێن" لە ئارادا بوو. لەم دواییانەدا لە کتێبێکدا، سەبارەت بە مێژووی هونەر، هەندێ بابەتم لە بارەی هونەر لە سەردەمی ئەسکەندەردا خوێندبووەوە. لەو ڕووەوە زۆر ئاسایی بوو کە بیر لە ڕستە بەناوبانگەکەی ئەسکەندەر بکەمەوە: "ئەگەر ئەسکەندەر نەبوومایە، پێم خۆش بوو دیۆژێن بوومایە". لە هەمان کاتدا بە شێوەیەکی نادیار بیرم لە کەسێک بە ناوی "هرمان زتۆنگ"ـەوە دەکردەوە کە لە جانتایەکی گەورەی داخراودا گەشتی کردبوو. لەو کاتەدا نەمتوانی وەبیرهێنانەوەکان زیاتر بەرمە پێشەوە



CamScanner

و وەبیریـان بهێنمەوە و لە کتێبـی مێـژووی هـونەردا نەمتـوانی ئەو بـابەتەی لە بـارەی هـونەری سـەردەمی ئەسـکەندەرەوە شـرۆڤەی کردبوو بدۆزمەوە. لەو ڕووەوە تا پاش چەند مانگ ئیتر بیرم لەم مەسـەلەیە نەکـردەوە تـا جـارێکی تـر کە ئەو مەسـەلەیە سـەرنجی ڕاکێشام. بەڵام ئەمجارەیان ڕێگەچارەی مەتەڵەکە بە دوای مەتەڵەکەدا ئاشـکرا بـوو. بـابەتێکم بیـر هـاتەوە کە باسـی لە هەنـدێ کەرەسـەی گواسـتنەوەی سـەیر دەکـرد کە خەڵـک کەڵکیـان لـێ وەرگرتـووەوە و بەوە ڕۆیشتوون بۆ پیشانگای نێودەوڵەتی پاریس. تا ئەو ئاستەی لە بیرم بێت نووسەر بە گاڵتەوە دەیگێڕایەوە کە پیاوێک ویستوویەتی لە بەرمیلێکدا دابنیشێت تا یەکێک لە هاوڕێ و ڕەفیقە باشـەکانی ئەو تا پاریس تـل بـدات. دیـارە ئەو جـۆرە کەسـانە تەنها هەڵ دەدەن پیشـان بدەن لەگەڵ خەڵکی تردا جیاوازن. لە ڕاسـتیدا "هرمـان زتۆنگ" نـاوی کەسێک بـوو کە بـۆ یەکەمین جار لەو شـێوازە شـازە بۆ گەشـتکردن کەڵکی وەرگرتبـوو. پاشـان بە بیـرم هـاتەوە لە ڕابـردوودا نەخۆشێکم هەبوو کە بە پێچەوانەی پلەوپایەپەرستیی نەخۆشئاساوە زۆر ترسی لە ڕۆژنامەکان هەبووە، بەڵام هیوایەتی بـوو نـاوی لە ڕۆژنـامەدا بڵاو بکرێتەوە و ببێتە هۆی ناودەرکردنی. ئەسکەندەری مەکدۆنی بێگومـان مەنسەبپەرستترین پیاوی سەر زەوی بووە. ئەو خەفەتی دەخوارد کە بـۆچی هۆنراوەبێژێـک وەک هـۆمێر بـوونی نییـە تـا سـەبارەت بە سەرکەوتن و دەسکەوتەکانی هۆنراوەی بەسەرا بڵێت.

بەڵام چون لە بیرم نەبوو ئەسکەندەرێکی تر، کە زۆر لە منەوە نزیکتر بـوو بە بیـری بهێنمەوە، چونکە بـرا بچـووکەکەم نـاوی ئەسـکەندەر Alexandreبوو. ناوی براکەم خێرا بیرکردنەوەیەکی ئازاربەخشی بە بیر هێنامەوە کە هەوڵم دەدا لە زەینم دووری بخەمەوە و هاوکات لەگەڵ ئەوەشـدا بیرکـردنەوەی بیرەوەریی کـاتی دروسـتبوونی ئەوەم بە بیر هاتەوە.



CS CamScanner

براکەم کارناسی گواستنەوە و نرخدانان بوو. تەنانە سەردەمانێک دەبوا پۆستی مامۆستایی قوتابخانەیەکی خوێندنی باڵای بازرگانییان پێ بدایە. هەروەها چەند ساڵ لەوەوبەر هەمان پێشنیاریش بۆ من کرابوو، بەڵام نەمتوانی بوو بەدەستی بهێنم. لەو ڕووەوە دایکم نیگەرانیی خۆی دەربڕی بوو بۆ ئەوەی نەکا کورە بچکۆلەکەی زووتر لە کورە گەورەکەی بگاتە ئاستی مامۆستایی. لەو کاتەدا کە نەمتوانیبوو هۆکارێک بۆ خوێندنەوەی خۆم بدۆزمەوە، بارودۆخ بەو شێوەیە بوو. پاشان شانسی براکەم بۆ بەدەستهێنانی پلەی مامۆستایی کەم ببووەوە و تەنانەت ئەگەری وەرگرتنی پۆستی بەرزتری لە هی منیش کەمتر ببووەوە. بۆیە واتای هەڵەکەم لەناکاو دەرکەوت: دەتوت کەمکردنەوەی ئەگەری بوون بە مامۆستایی براکەم، بەربەستی تێنەگەیشتن لەو هەڵەیەی چارەسەر کردبوو. من بە شێوەیەک ڕەفتارم کردبوو کە گوایە لە ڕۆژنامەی هەواڵدا وەرگرتنی پۆستی بەرزی براکەمم خوێندووەتەوە و بە خۆمم وتبوو: "سەیرە! ڕۆژنامە بابەتێک دەنووسێت کە بابەتەکەی (واتە پسپۆڕییەک وەک پسپۆڕی براکەی من) گاڵتەجاڕییە." ئنجا بە ئاسانی توانیم لە کتێبی "مێژووی هونەر"دا بەشێک بدۆزمەوە لە بارەی هونەری سەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە بێت و بە سەرسوڕمانێکی سەیر تێگەیشتم کە کاتی بەدواداگەڕانەکانی پێشوتر چەند جار ئەو لاپەڕەیەم خوێندەوە کە ئەو بابەتەی تیا بوو، بەڵام هەر جارە و دەتوت لەژێر کاریگەرییەکی خەیاڵی نێگەتیڤدا ئەو بەشەم نەخوێندبووەوە. جیا لەوەیش ئەو بەشە هیچ خاڵێکی لەخۆ نەگرتبوو کە بتوانێت شرۆڤەیەکم بداتێ یان هۆکارێک بۆ لەبیرچوونەوە هەبوو بێت. بە بۆچوونی من نەبوونی توانا لە دۆزینەوەی ئەو بەشەدا (کە زۆر جار لە بەرچاومدا تێپەڕ ببوو) دەبێ بە هێمایەک بزانرێت، ئەو هێمایەی کە دەبوایە تەنها منی لابدایە. وەبیرهێنانەوە،

بیرکردنەوەکانمی بەرەو ئاراستەیەکی تر دەبرد، تا هەوڵەکانم رووبەڕووی بەربەستێک ببنەوە، بە کورتییەکەی ئەو نەبوونی توانایەهانی دەدام بۆ بیرکردنەوە لە بارەی ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە تا بە باشترین شێوە سەرنجی براکەم نەدەم کە ناوی ئەسکەندەر بوو و بیرکردنەوەکانیشم لەگەڵ ئەودا جیاواز بوو. لە ڕاستیشدا هەر وابوو، من هەموو هەوڵێکی خۆمم تەنها لەو بارەوە دەخستە گەڕ کە بەشی ناوبراو لە کتێبی مێژووی هونەردا بدۆزمەوە.

دوو جۆربوونی واتای وشەی Beförderung لەو بارە تایبەتەوە وەک پردێکی وەبیرهێنانەوە لە نێوان دوو بیروبۆچووندا خۆی دەنواند، گرێی (عوقدە)، کەمبایەختر بە ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکە بزوێنرابوو و گرێی گرنگتر، بەڵام ئازاربەخشتر و ناخۆشتر ببووە هۆی هەڵەکردنم لە خوێندنەوەدا. ئەو نموونەیە پیشانی دەدات کە ڕاڤەکردنی ڕووداوێکی لەو شێوەیە ئاسان نییە. ئێمە زۆر جار ناچارین شیکارکردنی مەتەڵێک دوا بخەین بۆ کاتێکی گونجاوتر، بەڵام هەرچەند ڕێگاچارە سەختر بێت بە دڵنیاییەکی زیاترەوە دەبێ چاوەڕێ بین کە بیرکردنەوەی هەستمان ئەندێشەی شڵەژاو بدۆزێتەوە و ئەو ئەندێشەیەیش کاتێک دەدۆزرێتەوە، سەیر دەبێت و دژی ناوەڕۆکی ئاسایی ئاراستەی ئاسایی بیری هەستمان بێت.

٣- ڕۆژێکیان لە نزیکی شاری ڤیەننا نامەیەکم بەدەست گەیشت و هەواڵێکی خەفەتاوی تێدا بوو. خێرا بانگم لە هاوسەرەکەم کرد و پێم وت خاتوو "گیۆم"م. داماوە زۆر نەخۆشە و پزیشکەکان جوابیان کردووە و وتوویانە چارەسەر نابێت، بەڵام ڕەنگە لەو قسانەی بۆ دەربڕینی خەم و پەژارەم دەرم دەبڕی هەڵەیەک بوو بێت، چونکە هاوسەرەکەم گومانی لە قسەکەم کرد و تکای کرد تا نامەکەی پیپیشان بدەم. ئەو وتی:

دڵنیام بە هەڵەدا چووی، چونکە هیچ کەسێک ناوی ژنێک بە ناوی یەکەمی مێردەکەی بانگ ناکات و بەتایبەتی لەو بارودۆخەدا ڕەفتارێکی وەها ناکرێت، چونکە نووسەری نامەکە ناوی یەکەمی هاوسەرەکەی کاک "گیۆم"م بە باشی دەزانێت." سەرباری ئەوەیش پێم داگرت و بە دڵنیاییەوە جەختم لە سەری کردەوە کە مەسەلەکە لە بارەی خاتوو گیۆم م.ەوەیە، هەوڵم دا ناڕەزایەتیی هاوسەرەکەم ڕەد بکەمەوە و وەبیری بهێنمەوە زۆربەی ژنان ناوی یەکەمی هاوسەرەکانیان لەسەر کارتی ڤیزیتەکانیانەوە دەنووسن. سەرەڕای ئەوەیش ناچار بووم دیسانەوە نامەکە بخوێنمەوە و تێگەیشتم هەق بە هاوسەرەکەم بووە و مەسەلەکە هەم پەیوەندە بە کاک گیۆم م.ی داماو و تەنانەت پەیوەندە بە دکتۆر گیۆم م.ی داماویشەوە، ئەو مەسەلەیەی کە لە بەرچاوی من ون ببوو. لەو ڕووەوە لابردنی وشەی دکتۆر هەوڵدانێکی بەڕواڵەت لە ڕووی نەستەوە بوو تا هەواڵی خەفەتاوی لە مێردەکەیەوە بگوازێتەوە بۆ هاوسەرەکەی. وشەی (Dr) کە لە نێوان وشەی وەسفکردن و وەسفدا بوو لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە ناوەکە هەبوو "Le Pauvre Dr. G. M" بە ڕادەی پێویست دیاری دەکرد کە مەسەلەکە پەیوەند نییە بە ژن و لەو ڕووەوە من لە کاتی خوێندنەوەیدا ئەو ناونیشانەم نەبینیبوو. سەرباری ئەوەیش نابێ هەڵەکەم بەو کارەوە پەیوەند بدرێت کە دکتۆر م. بەلامەوە خۆشەویستتر و میهرەبانترە تا ژنەکەی، بەڵکوو تەنها بارودۆخی کاک گ.م هەندێ سەرقاڵی تری لە مێشکمدا دروست کردبوو، کە پەیوەند بوو بە کەسی سێیەمەوە، ئەو کەسە یەکێک بوو لە کەسە نزیکەکانم و بە دەست نەخۆشییەوە ئازاری دەچێشت. نەخۆشییەکەی لە زۆر بوارەوە هاوشێوەی نەخۆشییەکەی کاک گ.م بوو.

٤- کاتێک بۆ تێپەڕبوونی پشوو بۆ شارێک گەشتم دەکرد و لە

شەقامە نەناسراوەکانی ئەو شارەدا پیاسەم دەکرد، زۆر جار لە خوێندنەوەی ڕیکلام و تابلۆی دوکانەکاندا تووشی هەڵە دەبووم کە نیگەرانکەر و لە هەمان کاتیشدا پێکەنیناوییە. من لەسەر هەموو دوکانەکان ئەو نووسینەم دەخوێندەوە "زەرەنگەری"، ئەو هەڵەی هەستییە هیوایەتی منی بۆ کۆکردنەوەی ئاڵتوون و شتی بەنرخ پیشان دەدا.

٥- "بلۆلێر" لە کتێبە زۆر باشەکەیدا بە ناوی "لەژێر کاریگەری سۆزداری، تێگەیاندن و پارانۆیا"دا دەنووسێت:

"ڕۆژێکیان لە کاتی کتێبخوێندنەوەدا ئەو هەستە زەینییەم هەست پێ کرد، کە ناوی خۆم لە دوو دێڕ خوارتر لەو دێڕەی دەمخوێندەوە، بینیوە. کاتێک گەیشتمە دێڕی باسکراو تەنها وشەی "Blutkörperchen" (خڕۆکەی خوێنی)م دۆزییەوە و زۆر سەیرم لێ هات. لە نێوان هەزاران نموونەی هەڵەی خوێندنەوەی بەرچاو و ناوەندی و پەراوێز کە شیم کردبووەوە ئەمەیان قۆرترین هەڵە بوو. لە بوارەکانی پێشوودا کاتێک وام دەزانی ناوی خۆمم بینیوە ئەو وشەیەی بیانوویەک بوو بۆ هەڵەکردن، هاوشێوەی ناوەکەم بوو کە تارادەیەک دەیتوانی پاساوەری هەڵەکەم بێت و زۆر جار دەبوایە هەموو پیتی ناوەکەم لە بەرچاوی من بوایە تا هەڵە ڕوو بدات. بەڵام لەم بوارەدا ئەوەی شتەی دەیتوانی ببێتە شرۆڤەیەک بۆ پەیوەندیی درۆیین و هەڵە ئەوە بوو لە کاتی خوێندنەوەی هەندێ تێبینی لە بارەی شێوازی خراپ و ناهاوسەنگی نووسەرانی بابەتە زانستییکانەوە بووم و هەروەها خۆشم لە ڕیزی ئەو جۆرە نووسەرانە دادەنا.

٦- دکتۆر "مارسێلا ئایبێن شووتس" نموونەیەک شرۆڤە دەکات لە هەڵەیەکی خوێندنەوە لە کاتی توێژینەوەی سەرووی وتنەوە:

"سەرقاڵی پێداچوونەوەی ڕەخنەگرانەی بەرهەمێک بووم بە ناوی "کتێبی شەهیدان"، کە کۆمەڵە ئەفسانەکانی ئەڵمانیای گەورە و ناوەڕاستە و دەبوایە لە کۆلێکشینی "بابەتەکانی ئەڵمانیای سەدەکانی ناوەڕاست"ـەوە لە لایەن یانەی کولتووری زانستی پرۆس بڵاو بکرایەوە.

ئەو بەرهەمە تا ئەو کاتە بە چاپ نەگەیشتبوو و بەرهەمێکی نەناسراو بوو و لەو بارەوە تەنها نامەیەک لە جەنابی ژ. هۆپتەوە بە ناوی "لە بارەی کتێبی شەهیدان بە زمانی ئەڵمانی ناوەڕاست"ـەوە هاتبوو. هۆپت لە کاتی نووسینی نامەکەیدا هیچ دەستنووسێکی (مسۆدە)ی لە بەردەستدا نەبوو، بەڵکوو یەک دانە کۆپی (سەبارەت بە سەدەی نۆزدەیەم)ی بە دەستخەتی س. (خەڵکی کلۆستێرنۆبێرگ" دۆزیبووەوە کە لە کتێبخانەی پاشایەتی ڕادەگیرا. ئەو کۆپییە بەم ڕستەیە کۆتایی پێ دەهات:

"Anno Domini MDCCCL in vigilia exaltacionis sancta crucis ceptus est iste liber et in vigilia pasce anni subsequeentis finites cum adjutorio omnipotentis par me hartmanum de krasna tunc temporis ecelesio niwenburgensis custodem."

هەرچەند ئەگەر هۆپت لە نووسینەکەیدا ئەو ڕستەیەی ڕێک (بە بەرواری ۱۸۵۰ بە ژمارەی ڕۆما) نووسیبوو، بەڵام چەندین جار پیشانی دەدا بە بڕوای ئەو، ئەو ڕستە لاتینییە هی دەستنووسەکەی "س."ـە و ئەو ڕستەیەیش وەک هەموو دەستنووسەکانی تر هی بەرواری ۱۳۵۰یە.

نامەکەی هۆپت بووە هۆی شڵەژاوی و سەرسوڕمانم. من کە لە زانستێکی قووڵی وەهادا گەنجێکی تازەکار بووم، سەرەتا کەوتمە ژێر

کاریگەریی هۆپتەوە و بۆ ماوەیەک لەو ڕستەیەدا، کە بە ڕوونی چاپ کرابــوو وەک هۆپــت لە بــری بەرواری ١٨٥٠ بەرواری ١٣٥٠م خوێنـــدەوە. کاتێــک دەرفەتەم بــۆ ڕەخســـاوە و دەستنووســـە سەرەکییەکەم دۆزییەوە تێگەیشتم کە هیچ کاریگەرییەک لەو ڕستە لاتینییە لە بابەتی سەرەکیدا نییە و توانیم دڵنیا بم، کە لە سەدەی چواردەدا قەشـەیەک بە نـاوی "هارتمەن"ـەوە لە کلۆسـتێرنۆبۆرگدا نەژیاوە. کاتێک ئەو مەسەلەیە بەلامەوە بە تەواوی ڕوون و ئاشکرا بوو، خێرا هەموو ڕێگاچارەکەم دۆزییەوە و توێژینەوەکانی دوایی جەختی لەسەر بۆچوونەکانم کردەوە: ئەو ڕستە بەناوبانگە بە زمانی لاتینی تەنها لە دەستنووسەکەدا هۆپت کەڵکی لێ وەرگرتووە و هی کەسێک بووە کە ئەوەی نووسیوە، واتە باوکی هـارتمەن سـاییش لەدایکبـــوونی "کرازنـــا" کە کەوتـــۆتە "مـــۆراڤی" و لە شـــاری کلۆستێرنۆبۆرگ بەرپرسی کەنیسەی ئاگۆستیەن بووە. ئەو لە پۆستی ژمێریاریی کەنیسەدا یەک دانەی لە دەستنووسەکەی "س." هەڵگرتووە و پاش تەواوبـوونی کـار بە پێـی دابـونەریتی کـۆن ڕسـتەیەکی بـۆ بـابەتەکە زیـاد کـردووە تـا خـۆی بە باشـە بناسـێتێت. بە دڵنیـاییەوە شێوازی سەدەی ناوەڕاست و نووسنی کۆنی ڕستەکە ئەو حەزەی لە هۆپتا بزواندووە کە لە بارەی ئەو بەرهەمەی لێی دەکۆڵێتەوە زیاترین زانـاریی پێویسـت بخـاتە ڕوو و لە ئەنجامـدا بـۆ دەستنووسـی "س." بەروارێک دەستنیشان بکات، لەو ڕووەوە ئەو بە بەردەوامـی لە بری بەرواری ١٨٥٠ بەرواری ١٣٥٠ــی خوێنـدبووەوە (هانـدانی ئەو هەڵە ڕەفتارییە هەر ئەو حەزە بوو.)

٧- ە. سـاکس دەیگێـڕێتەوە: مـن ئەو ڕسـتەیەم خوێنـدەوە: "لە بەرامبەر ئەو شتەی دەبێتە هۆی سەرسووڕمانی کەسانی تر، ئەو بە نەبوونی کاریگەرییەکی تایبەت هەڵسوکەوت دەکات". وشەی "نەبوونی کاریگەری" بووە هۆی سەرسووڕمانم و کاتێک لە نزیکترەوە سەیرم

کرد، بینیم وشەی نەبوونی کاریگەری Steifleinenheit بوونی نییە، بەڵکوو وشەی نووسراوی Stielfeinheit (بە واتای ناسکی و هەستی شێوازناسی)یە. ئەو ڕستەیە بەشێک بوو لە قسەکردنی بەهێز و جێی ڕێز و لە ڕادەبەدەر وروژاوە کە یەکێک لەو نووسەرانەی هیوایەتمە لە بارەی مێژوونووسێکەوە نووسیبووی، من ئەو مێژوونووسەم بە لاوە باش نەبوو، چونکە ئەو بە ڕاشکاوی تایبەتمەندی تایبەتی یەک "مامۆستای ئەڵمانی" هەبوو.

٨- لە کتێبی "ئەندیشەی پڕ گاڵتەجاڕی و هەجوو"دا بەرهەمی لیستانبێرگ، ڕووبەڕووی تێبینییەک دەبینەوە، کە لە سەرنجدان بۆ مەسەلەیەکی سەیر سەرچاوە دەگرێت و بەهەرحاڵ هەموو بیرۆکەکانی هەڵەی خوێندنەوە بە کورتی دەخاتە ڕوو. لیشتانبێرگ دەنووسێت: "ئەوەندە بەرهەمەکانی هۆمێرم خوێندبووەوە کاتێک هەر جارە و چاوم بە وشەی (Angenmmen پەسەندکراو، قبوڵکراو) دەکەوت، ئەوەم بە ئاگامێنۆن دەخوێندەوە Agamemnon دەخوێندەوە.

لە ڕاستیدا زۆر جار ئەو شتەی دەبێتە هۆی گۆڕینی بابەتەکە ئارەزووی شاراوەی خوێنەرەکەیە. ئەو ئارەزووە هەر مەسەلەیە کە بیری ئەوی سەرقاڵ کردووە دەیخاتە ناو بابەتەکەوە. لەو ڕووەوە تەنها ئەوەندە بەسە لە نێوان ئەو وشەیەی لە بەردەستدایە تا خوێنەر بتوانێ بابەتەکە بە حەزی خۆی بگۆڕێت. لەو ڕووەوە هەڵەی خوێندنەوە پێک دێت. خوێندنەوەی خێرا بەتایبەتی بەو چاوانەی کە تووشی تێکچوونی هاوسەنگییەکی پیانەچوونەوەیە، بێگومان ئەو هەڵەیە ئاسان دەکاتەوە، بەڵام مەرجی پێویست ئەو جۆرە هەڵانە نییە.

٩- بە بڕوای من شەڕ هەندێ بیروبۆچوونی سەقامگیر و سەرقاڵیی زەینی دەکاتە باو و بە شێوەیەکی تایبەت دەرکەوتنی

هەڵەی خوێندنەوە دەرەخسێنێت. چەندین جار لەو کارە دڵنیا بووم، بەلام بەداخەوە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە بینین و تێبینییەکانم بە زەینم سپاردووە. ڕۆژێکیان یەکێک لە ڕۆژنامەکانی دوای نیوەڕۆ یان شەوم کردەوە و ئەو ناونیشانەم بینی کە بە پیتی گەورە چاپ ببوو: "ئاشتی لە گـوورز"دا، بەلام بە هەڵەدا دەچـووم، ناونیشـانەکە وەهـا بـوو: "دوژمنەکان لە بارمبەر گورزدا."

ئەمە ڕستەکە بوو Die Feinde نەک der Friede von Görz

vor Görzئەو پیـاوەی کە دوو کـوڕەکەی لە بەرەی شـەڕدا دەجەنگان، هەڵبەت هەقی بوو تووشی هەڵەیەکی وەها بێت.

- پیاوێک ئەم وشانەی لە ڕستەیەکدا خوێندەوە: "کوبنی (بایعی) کۆنی نان Alte Brotkarte"، بەلام خێرا لە هەڵەکەی تێگەیشت لە ڕاستیدا مەسـەلەکە سـەبارەت بە "Alter Brokate دروانـدنی کـۆن" بـوو. شـایانی باسـە خـووی ئەو پیـاوە وا بـوو کـوبنی نـانەکەی پێشکەشی ژنێک بکات کە وەک هاوڕێیەک لە ماڵەکەیدا بوو.

- ئەنـدازیارێک بـۆ بەرگریکـردن لە شـێداربوونی تونێلێـک کە بەرپرسیارێتی دروستکردنی لە ئەستۆ گرتبوو ڕووبەڕووی نەبوونی ئامێر و کەرەسە بوویەوە. ڕۆژێکیان بە سەرسووڕمانەوە ئاگاداری فرۆشـتنێکی لە ڕۆژنـامەدا خوێندەوە، کە ئامـاژەی بە هەنـدێ کـاڵا لە ڕەگەزی "چەرمـی نابـاو" Schundleder، بەلام بازرگانەکـان بە دەگـمەن ئەو ڕاسـتگۆییانەیان هەیە کە خراپـی کاڵاکانیـان بـدرکێنن. کاڵای ئامادەکراو لە ڕاستیدا لە "پێستی شـەویلکە Seehundleder" دروست کرابوو.

کـات و دۆخـی خـوێنەر زۆر جـار نـاوەڕۆکی هەڵەکەی دەستنیشـان دەکات. پسپۆڕێکی وشە و زمانەوانی پاش دوایین لێکۆڵینەوەی زۆر گرنگـی لەگـەڵ هاوکارەکانیـدا لەسـەر جـۆریەتی نووسـینی ئەو

دۆزینەوانەی موناقشەی هەبوو، ڕۆژێکیان لە بری وشەکان، "لەشکەرکێشی لەسەر شەترەنج (Schanchstratrategie)"، بەم شێوەیە خوێندیەوە: "لەشکەرکێشی زمانناسی (Sprachsstrategie)".

نەخۆشێک لە شارێکی غەریبدا دەسوڕایەوە، لە هەمان کاتدا کە بەهۆی چارەسەرکردن و دەرمانکردنەوە ڕیخۆڵەکانی نەرم ببوو و ڕەوان ببوو، لەسەر تابلۆی دوکانێکی گەورە بەو شێوەیە خوێندیەوە: "تەوالیتی گشتی (Klosethaus)"، خوشحاڵییەکەی لەگەڵ هەست بە سەرسووڕماندا بوو: بۆچی شوێنێکی گشتییان لەم شوێنە سەیرەدا دروست کردووە؟ بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو کە خوشحاڵییەکەی لەناو چوو، چونکە ئاگادار بووەوە لە ڕاستیدا نووسینی سەر تابلۆکە بەم شێوەیەیە: دوکانی جلی ژێرەوە (Korsethaus).

-١٠ لە زۆر بواری تردا ناوەڕۆک کاریگەرییەکی گرنگتر دابین دەکات لە هەڵەکاندا. ناوەڕۆکی بابەتەکە بێتاقەتی خوێنەر هەڵدەخڕێنێت، چونکە کارتێکەری یان بابەتێکی بێزارکەری تیایە. لەو ڕووەوە خوێنەر بە پشتبەستن بە هەڵە بابەتەکە لە ئاراستەی بەلاوەنان یان لە ئاراستەی گەیشتن بە هیوایەتێک پێیدا دەچێتەوە. بە دڵنیاییەوە دەکرێ قبوڵ بکرێت لەو جۆرە بوارانەدا سەرەتا ناوەڕۆکەکە بەو شێوەیەی کە نووسراوە دەخرێتە بەر دادوەری و ڕوانگە و پاشان پیادەچنەوە لە حاڵێکدا لەو خوێندنەوەیەدا هیچ زانیارییەک نەگەیشتووەتە ویژدانی نەست. نموونەی ژمارە ٣ کە پێشتر باسمان لێیەوە کرد لەم جۆرەیە. من نموونەیەکی تر کە ئێستا باسی ڕۆژ لە زاری دکتۆر "ئیتینگۆن"ـەوە دەگێرمەوە. ئەو لە کاتی چارەسەرکردندا لە نەخۆشخانەی سەربازیی "ئیلگۆ"ـی لەم بوارەدا کۆڵیوەتەوە.

١١- "ملازم X له نەخۆشخانەی ئێمەدا بەهۆی تووشبوون بە ئازاری دەروونییەوە، کە سەرچاوەکەی دەگەڕایەوە بۆ زیالێکەوتنی لە کاتی جەنگدا لەژێر چارەسەردا بوو. ئەو ڕۆژێکیان دوایین دێڕی لە هۆنراوەیەکی والتەر هەیمەن، هۆنراوەبێژی گەنجی بۆ خوێندمەوە و بە ورووژاوییەکی زۆرەوە بەم شێوەیە خوێندیەوە:

Wo aber Stehts geschrieben , fragich dass von allen

Ich übrig bleiben soll, ein ander für mich fallen?

Wer immer von euch fällt, der stirbt gewiss für mich,

Und soll übrig bleiben? Warum denn nicht?

(بەلام پێم بڵێن لە کوێدا نووسراوە کە دەبێ من بە تەنها بمێنمەوە و کەسێکی تر بەهۆی منەوە گیانی لەدەست بدات؟ لەم نێوانەدا ئەوانەی بەسەر زەویدا بە خۆیاندا دەئاڵێن بە دڵنیاییەوە لەبەر من دەمرن. ئنجا من دەبێ بمێنمەوە؟ بۆچی وانەبێ؟)

کاتێک ملازمەکە لە سەرسووڕمانی من تێگەیشت، بە نەختێ شڵەژاوییەوە دیسانەوە هۆنراوەکەی خوێندەوە، ئەمجارەیان بەبێ هەڵە:

Und ich soll ubrig bleiben? Warum denn ich?

هۆنراوەبێژەکە لە دێڕی کۆتاییدا نووسیبووی: "ئنجا من، من دەبێ بمێنمەوە؟ بۆچی من؟"

ئەو بوارەی ملازم X دۆخێکی بۆ ڕەخساندم تا زیاتر گرنگی بە شیکاری قووڵتری ڕەگەزە دەروونییەکان لە "ئازاری دەروونی بەهۆی زیانلێکەوتن لە جەنگدا" بدەم، پاشان سەرەڕای بوونی بارودۆخی نەگونجاوی کار لە نەخۆشخانەی سەربازیدا سەرباری ئەو هەموو

سەرقاڵییە و ڕێژەی کەمی پزیشکەکان توانیم هۆکارێکی تر جیا لەوەی هەموو کەسێک بیریان لێ دەکردەوە بدۆزمەوە، چونکە زۆربەی پزیشکان لەسەر ئەو بڕوایەن ئەو جۆرە ئازارە دەروونیانە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تەقینەوەی قومبەلەیەک.

هێمای بەرچاوی شڵەژاوی لە ملازم Xدا دەبینرا. ئەو هێمایانەی کە لە هەموو بوارەکانی ئازاری دەروونییەوە سەرچاوەی گرتووە لە جەنگدا سەرەتا بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا و ڕوون هاوشێوەیەی یەکترن، بریتین لەم دۆخانە: نیگەرانی، حەز و ئارەزوو بۆ گریان بە چەند هۆیەکی پووچەوە، قەیرانی زۆر، توندوتیژی، تەشەنوجی بەرچاو، دەرکەوتنی جووڵەی منداڵانە، دۆخی ڕشانەوە (پاش بچووکترین وروژاوە یان بزواندن).

دەرکەوتنی دەروونی ئەم دوایین هێمایە بۆ نەخۆشەکانمان خۆهەڵواسینێکی نەستی بوو کە بە پشتبەستن بەوە هەوڵیان دەدا مۆڵەتی ئیسراحەتی زیاتر و درێژخایەن بەهۆی نەخۆشییەکەوە وەربگرن و هەموو پزیشکەکان لەو خاڵە ئاگادار بوون. هەر کات بەڕێوەبەری نەخۆشخانە، کە جارناجار بۆ بینین دەهاتە بەشی چارەسەر یان هاوڕێیەک کە نەخۆشەکەی لە شەقامدا دەبینی و پێی دەوت: "بە دڵنیاییەوە دۆخت بە تەواوی باش بووە، ڕەنگ و ڕووت زۆر باشە." لەناکاو نەخۆشەکە تووشی قەیرانی توندی ڕشانەوە دەبوو. گوایە لەبەر خۆیەوە دەیوت: "تەندروستی... گەڕانەوە بۆ بەرەی جەنگ... بۆچی من؟"

١٢- ئەمەیش چەند نموونەیک لە هەڵەکانی خوێندنەوە سەبارەت بە سەردەمی جەنگ کە بە قەڵەمی دکتۆر هانس ساکس (خەڵکی ڤییەنا) لە گۆڤاری نێونەتەوەیی دەروونناسیدا بە چاپی گەیاندووە.

أ) یەکێک لە ناسراوەکان چەندین جار پێی وتبووم: "ڕۆژێک کە

بمبەن بۆ جەنگ هیچ کەڵکێک لە بروانامەی خوێندنەکەم وەرناگرم، هەڵبەت بەو بروانامەیەوە حەقم هەیە لە بەرەی جەنگدا بمێنمەوە، بەڵام داوا دەکەم بمنێرن بۆ بەرەی شەڕ تا جەنگ بکەم. ئەو ماوەیەک پێش ئەوەی بانگی بکەن بۆ جەنگ ڕۆژێکیان بە زارێکی وشک و بەبێ بچووکترین شرۆڤەیەک پێی وتم کە کاری پێویستی بۆ پسپۆڕییەکەی ئەنجام داوە و لەو ڕووەوە دەینێرن بۆ دامەزراوەیەکی پیشەسازی. سبەی بەیانییەکەی لە ڕێکخراوێکی حکومیدا یەکترمان بینی، من بەرامبەر مێزێک ڕاوەستابووم و خەریکی نووسین بووم، چەند چرکەیەک لەسەر شانمەوە سەیری ئەو کاغەزەی کرد کە خەریکی پڕکردنەوەی بووم و وتی: "سەیرە! لێرەدا نووسیویانە (Druckbogen فۆڕمی چاپی) و منیش خوێندمەوە (Drückeberger فێڵباز!)

ب) لە ترامواى (شەمەنەفەری بچووکی سەر شەقام)دا دانیشتبووم و بیرم لە هاوڕێ جۆراوجۆرەکانی سەردەمی گەنجێتیم دەکردەوە. هەندێکیان هەمیشە بە لاواز و بێتوانا دەژمێردران، بەڵام ئێستا دەتوانن هیلاکییەکی زۆر تەحەمول بکەن. ئەگەر من لە بری ئەوان بوایەم لەژێر باری ئەو هەموو هیلاکییەدا کەمەرم دەچەمایەوە. لە حاڵێکدا بیرم لەم مەسەلە بێزارکەرە دەکردەوە لە کاتی تێپەڕبوونی ترامواکەدا و تارادەیەکیش بەبێ گرنگیپێدان وشەی Eisenkonstitution جەستەی ئاسنیم لەسەر دەرگای دوکانێکی گەورەی بازرگانی خوێندەوە. پاش یەک چرکە بە خۆمم وت ئەو وشەیە وەک ڕیکلامی بازرگانی زۆر گونجاو نییە. خێرا ئاوڕم دایەوە، توانیم دیسانەوە وشەکە بخوێنمەوە و تێگەیشتم وشەی مەبەست Eisenkonstruktio بینای ئاسنییە.

ت) ڕۆژنامەکانی سەردەم ڕاگەیاندنی "ڕێتەر"یان بە چاپ گەیاند

(کە دوایی نادروست دەستنیشان کرا) و ڕاپانگەیاند، کە "هۆکس" وەک سەرۆککۆماری ویلایەتەیەکگرتووەکان هەڵبژێردراوە. بە دوای ئەو هەواڵەدا کورتەیەک لە ژیاننامەی سەرۆککۆماری تازە هەڵبژێدراو بڵاو بووەوە. من لەو ژیاننامەیەدا خوێندمەوە، کە خوێندنەکەی لە زانکۆی بۆن (Bonn) تەواو کردووە. سەیرم لێ هات بە درێژایی ڕکەبەرایەتی نووسین کە چەند هەفتەیەک پێش هەڵبژاردن لە ڕۆژنامەکاندا بە ئاستی زۆری خۆی گەیشتبوو، هیچ کەسێک باسی لەو مەسەلەیە نەکردبوو. کاتێک بۆ دووهەمین جار ژیانی ئەوم خوێندەوە، تێگەیشتم کە دەرچووی زانکۆی براون (Brown)ە. ئەو هەڵە بەرجەستەیە نەک هەر نەبوونی سەرنجی تەواوی منی لە خوێندنەوەکەدا پیشان دەدا، بەڵکوو لە هەمان کاتدا ڕاقەی ئەو ڕاستییە کە بەهۆی مەسەلەی سیاسی و هەروەها شەخسییەوە سەرۆککۆماری تازە زۆر گرێدراوی دەسەڵاتی ناوەندی (نەمسا و ئەڵمانیا)بوو.

دووهەم: هەڵەی نووسینەکان

١- لەسەر لاپەڕەیەکی کاغەز کە زۆر جار یادداشتە کورتەکانی ڕۆژانەم دەنووسی، تا تووشی لەبیرچوونەوە نەبم و بیرم ئاسوودە بێت، بە سەرسوورمانەوە لە نێوان بەروارە دروستەکانی مانگی سپتەمبەردا بەرواری هەڵەی "پێنجشەممەی بیستی ئۆکۆبەر"م بینی. شرۆڤەی ئەو کارە دەرکەوتەی ئارەزوویەک بوو، کە ئاسان و ساکار دەهاتە بەرچاو. من چەند ڕۆژ پێش پشوو گەڕابوومەوە و هەستم دەکرد هیلاکی ئەو ساڵەم بە تەواوی لە جەستە دەرچووە و ئامادەییەکی باشم بۆ دەسپێکردنی کار و چالاکی پسپۆڕانەم هەیە، بەڵام هێشتا هیچ نەخۆشێک سەردانی نەکردبووم. کاتێک گەیشتبوومەماڵەوە نامەیەکم بینی نەخۆشێک تیایدا نووسیبووی، ڕۆژی بیستی

ئۆکتۆبەر سەردانم دەکات. بێگومان ئەو بەروارەم لە یاداشتی مانگی سپتەمبەردا دانا و لەبەر خۆمەوە بیرم لێی کردەوە: "ڕەنگە ئێستا خاتوو X لێرە بێت، حەیف بوو کە بەرواری چاوپێکەوتن یەک مانگ دواکەوتـــووە." ئەو بیرکـــردنەوەیە ببـــووە هـــۆی ئەوەی بەرواری چاوپێکەوتنەکە بهێنمە پێشـەوە. لەم بوارەدا بیرکردنەوەی شڵەژێنەر بە هیچ شێوەیەک نەشیاو نەبوو. بۆیە لەگەڵ ئەوەی کە لە هەڵەکەم تێگەیشتم شـرۆڤەیەکم بـۆ دۆزییـەوە. سـاڵێک پاش ئەو ڕاستییە لە وەرزی پـاییزدا تووشـی هەڵەیەکـی هاوشـێوە بـووم، کە هەر ئەو هۆکـارانە هەبـوو. کـاک ئـی. جـۆنس زۆرێکـی لەو هەڵانەی شـی کردووەتەوە و هەروەها توانیویەتی مەبەستەکانیشی دەربخات.

٢- ڕۆژێکیان کاغەزی بابەتەکانم وەردەگرتەوە بۆ ئەوەی پێیدا بچـمەوە. بـابەتەکەم بـۆ "سـاڵنامەی دەمارناسـی و دەروونشـیکاری" نووسـی بـوو و بە دڵنیـاییەوە دەبـوایە بە وردبینییەکـی زۆرەوە دیسانەوە ناوی نووسەرەکان ببینم. لە نێوان ناوەکاندا ناوێکی زۆری بیانی هەبوو کە بەتایبەتی دروست خوێندنەوە و پیتچنییەکانی زۆر دژوار دیـار بـوو. هەندێ شـتی جۆراوجـۆرم ڕاسـت کـردەوە، بەڵام سـەیر بـوو یەکێـک لە ناوەکـان کەسـی پیـتچن چـاکی کردبـووەوە، هەرچەنـد لە دەستنووسـی بەردەسـتی منـدا ئەو نـاوە بە هەڵە نووسـرابوو، ڕاسـتکردنەوەکە زۆر ڕاسـت و لە جێـی خۆیـدا بـوو. پیتچنەکە لە ناوەڕۆکدا لەبری Buckrhard کە لە دەستنووسـەکەدا هەبوو، وشـەی دروستی Burckhard بورکهاردی نووسی بوو. بـابەتەکەم بریتـی بـوو لە هانـدان و دەستخۆشـیکردن لە پزیشـکێکی تایبەت بە ناوی کاک بورکهاردBurckhard ـەوە کە سەبارەت بە کاریگەری زاوزێکردن لە دەرکەوتنی ئیفلیجیدا توێژینەوەی کردووە و بـابەتی سـەیری نووسـی بـوو. لە بـارەی ئەو نووسـەرەوە هەر ئەم بابەتەم دەزانـی، بەڵام بورکهارد لە هەمان کاتدا نـاوی نووسـەرێکی



CamScanner

ئەمساوی بوو کە تۆڵەسەندنەوەی ناعاقڵانەی لە بارەی کتێبی "زانستی خەونەکان"ـەوە ببووە هۆی نیگەرانییەکی زۆر و نیگەرانی کردم. من بە جۆرێک ڕەفتارم کردبوو کە گوایە لە کاتی نووسینی ناوی (بورکهارد) پسپۆڕی زاوزێکردن دەمویست نیگەرانی و ئازاری خۆم بەرامبەر بە بورکهاردەی نووسەر بگەیەنمە گوێی خەڵکەکە، چونکە گۆڕینی شێوەی ناوەکان بەو شێوەیەی کە لە بارەی هەڵە زمانەوانییەکانەوە شرۆڤەم کرد زۆر کات بە واتای جۆرێکە لە سووکایەتیپێکردن.

٣- توێژینەوەکانی لای خوارەوە کە کاک ئا. ئی. ستۆرفەر لە بارەی خۆیەوە ئەنجامی داوە، جەختکردنەوەیەکە لەسەر ئەم تێبینییە. ئەو نووسەرە بە ڕاشکاوییەکی شیاوی باسەوە دەبووە هۆی هەندێ هاندان، کە ناوی یەکێک لە ڕکابەرە خەیاڵییەکانی خۆی بە هەڵە چاک بکاتەوە و بینووسێت بە ئاشکرا پیشانی بدات.

گۆڕینی بە ئینکاری ناوێک

لە دێسەمبەری ساڵی ١٩١٠ـی زایینیدا لە دیکۆری یەکێک لە کتێبفرۆشییەکانی شاری زوریخدا کتێبێکی نوێم بینی کە دکتۆر ئەدوارد هیچمان Hitschmann لە بارەی تیۆرییەکانی فرۆیدەوە سەبارەت بە ئازاری دەروونی نووسیبووی. لەو کاتەشدا ڕێک من سەرقاڵی ڕێکخستنی کۆنفرانسێک بووم کە دەبوا لە بارەی بنەمای دەروونناسی فرۆیدەوە لە کونگرەی فەرهەنگستاندا بیخەمە ڕوو. لە پێشەکی بابەتەکەدا کە تازە تەواوم کردبوو جەختم لەسەر ئەم مەسەلانە دەکردەوە: پەیوەندی مێژوویی لە نێوان دەروونناسی فرۆید و توێژینەوە ئەزموونییەکاندا، ئەو کێشانەی کە بەم هۆیەوە دەبێتە ڕێگر لە بەردەم شرۆڤەیەکی گشتگیری بنەمای ئەو تیۆرییە و هەروەها نەبوونی شرۆڤەیەکی گشتگیر و ورد لەم بوارەدا. کاتێک لە

دیکۆرەکەدا کتێبی هیچمانم بینی سەرەتا نەکەوتمە یادی کرینیەوە، بەڵام پاش چەند رۆژێک کاتێک بڕیارم دا بیکرم ئیتر لە دیکۆرەکەدا نەبوو. کاتێک داوای کتێبەکەم لە فرۆشیارەکە کرد، لە بری ناوی نووسەرەکە وتم: "دکتۆر ئەدوارد هارتمەن"، فرۆشیاری کتێبەکەیش هەڵەکەی چاک کردمەوە و وتی: "مەبەستت هیچمان"ە، ئنجا کتێبەکەی بۆ هێنام.

مەبەستی نەستی هەڵەکەم روون و ڕاشکاو بوو. من تارادەیەک بە خۆم دەنازیم کە توانیومە شرۆڤەیەکی گشتگیر و ڕێکوپێک لە تیۆرییە دەروونشیکارییەکانی ئەو ڕێک بخەم، کتێبەکەی هیچمان بە ڕای من ناوەڕۆکێکی هەبوو، کە لە ئاستی توێژینەوەکەی کەم دەکردمەوە و هەستی بەخیلی و ئازاری دەبزواندم. بە خۆم وت: کەواتە کتێبی "زیانلێکەوتنی دەروونی لە ژیانی ڕۆژانەمدا" گۆڕینی ناوی ڕق دەربڕینی دەروونی منی دەردەخست. لەو کاتەدا تەنها ئەو شرۆڤەیەم بە لاوە بەس بوو.

پاش چەند هەفتەیەک بیرم لەو هەڵە ڕەفتارییە کردەوە و لە خۆمم پرسی: "بۆچی ناوی ئەدوارد هیچمانم گۆڕی بە ناوی ئەدوارد هارتمەن؟ ئایا هۆکاری ئەو کارە تەنها هاوشێوەبوونی ناوی فەیلەسووفی بەناوبانگە؟" یەکەمین وەبیرهێنانەوە کە بە مێشکمدا هات، بیرەوەرییەکی دادوەرانە بوو کە ڕۆژێکیان لە زاری دکتۆر هرگۆمێتسیلەوە، کە یەکێک بوو لە لاینگرانی پێداگری شۆپێهاوەر، بیستبووم، کە وتبووی: "ئەدوارد و. هارتمەن تەنها شێوەیەکی تەزویری ناشیرین و ناجوانی شۆپێنهاورە". لەو ڕووەوە ئەو شتەی بیووە هۆی ئەوەی کە ناوی هارتمەن لە بری ناوی لەبیرکراوی هیچمان بەکار بهێنم ئاراستەیەکی سۆزداری بوو، گوایە بە خۆمم وتبوو: "ئۆ! ئەم هیچمانە و شرۆڤە گشتگیر و ڕێکوپێکەکەی هیچ

بایەخێکی نییە. ئەویش وەک هارتمەن کە تەنها تەزویری شۆپێنهاوەر بوو، تەزوریری فرۆید بوو.[٢] پاشان بواری تایبەتی لەبیرچوونەوە و هەروەها ئەو بیرکردنەوەیە کە ببووە هۆی ئەوەی لە بری ناوی ڕاستەقینە ناوێک دابنێم کە هیچ جۆرە پەیوەندییەکی ڕواڵەتی لەگەڵدا نەبوو، یادداشتی بکەم.

پاش شەش مانگ کاتێک دیسانەوە سەیری کاغەزی یاداشتەکەم کرد، تێگەیشتم لە هەموو شوێنێکدا ناوی هیچمان Hitschmannم بە هینتسمان Hintschmann نووسیوە.

٤- ئەمەیش نموونەیەک لە هەڵە نووسینییەکان، کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە و دەکرێ ئەوە لە ڕیزی "هەڵەکان"دا دابنرێت. دەمویست لە حسابی پاشەکەوتی پۆستەکەم بڕی ٣٠٠ کورۆن وەربگرم و ئەوەش بۆ یەکێک لە خزمەکانم بناردبا کە دەبوا بە ئاوی گەرمی مەعدەنی لەژێر چاودێریدا چارەسەر بکرایە. پاشان تێگەیشتم هەموو پارەکەم ٤٣٨٠ کورۆنە و بڕیارم دا ئەو بڕە پارەیە تا ٤٠٠٠ کورۆن کە ژمارەیەکی ڕێکە کەم بکەمەوە، بەڵام تا ماوەیەک نابێ دەستم بدایە لە باقی پارەکەی کە ماوەتەوە. کاتێک چەکەکەم بەرامبەر بە یاسا باوەکان لەگەڵ بڕی پارەی مەبەستدا ڕێک خست، لەناکاو تێگەیشتم کە ڕادەی پێویستم لە بری ٣٨٠ کورۆن ٤٣٨ کورۆن نووسیوە و لە هەڵەکردنەکەم ترسام. سەرەڕای ئەوەیش حسابم کرد کە هیچ هۆکارێک بۆ ترس لە ئارادا نییە و بە وەرگرتنی ٤٣٨ کورۆن لە بری ٣٨٠ کرۆن، زۆر هەژارتر نابم، بەڵام ماوەیەکی پێچوو تا بیدۆزمەوە چ هۆکارێک بەبێ ئەوەی ویژدانی نەستم ئاگادار بوو بێت یەکەم مەبەستی تێک داوم. سەرەتا بە هەڵەدا چووم، ژمارەی ٣٨٠م لە ٤٣٨ کەم کردەوە، بەڵام تێنەگەیشتم کە پاشماوەی ئەو کەمکردنەوەیە بە کەڵکی چیم دێت. بەهەرحاڵ، ٤٣٨ یەکسان بوو

لەگەڵ ١٠٪ـی گشت پارەکەم، واتە ٤٣٨٠ کورۆن بوو. لە لایەکی ترەوە کتێبفرۆشەکان ١٠٪مان بۆ دادەبەزێنن. پاشان وەبیرم هاتەوە کە چەند ڕۆژ لەوەوبەر چەند کتێبێکی پزیشکم کۆ کردەوە کە بە کەڵکم نەدەهات و ویستم هەمووی پێکەوە بە بڕی ٣٠٠ کورۆن بە کتێبفرۆشیەک بفرۆشم. ئەو نرخەی بە لاوە زۆر بوو و بەڵێنی دا خێرا وەڵامی پێشنیارەکەم بداتەوە. ئەگەر دەمتوانی ئەو پارەیەی لێ وەربگرم ئەو بڕە پارەیەی بۆ خزمەکەم سەرفم کرد، بەدەستم دەهێنایەوە. دیاربوو لەو سەرفکردنە نیگەران بووم، چونکە کاتێک ئاگاداری هەڵەکانم بوومەوە وروژانێکی زۆرم تێئالا کە سەرچاوەکەی بەهۆی ترس لە هەژاری و ئیفلاس بوونەوە بوو، بەهۆی سەرفکردنی پارەیەکی وەهاوە. بەڵام نیگەرانی لە سەرفکردنی پارە و هەروەها ترس لە هەژاری بەو هۆیەوە نەچووبووە بیرکردنەوەی نەستمەوە، کاتێک بەڵێنم دابوو ئەو پارەیە بنێرم، هیچ هەستم بە نیگەرانی و خەفەت لەوبارەیەوە نەکردبوو و ئەگەر کەسێک هۆکاری بهێنایەوە تا ڕاستی هەستی پەشیمانیم بۆ بسلەمێنێت هۆکارەکانیم بە هەڵە دادەنا و ئەگەر پیشەی دەروونشیکاری منی بە دیاردە سەرکوتکراوەکان و دوورکەوتنەوەوە نەدەناسی و چەند ڕۆژ لەوەوپێش خەونێکم نەدیبا کە لەگەڵ هەمان شرۆڤەدا لێکدانەوە و پاساو بدرابایە، هەرگیز بڕوام نەدەکرد ئەو جۆر هەستانە لە مندا هەبوو بێت.

٥- ئێستایش نموونەیەکی تر لە زاری کاک و. ئەشتکیلەوە دەگێڕمەوە کە باوەڕم بەڕاستبوونی هەیە. "بە ڕاستی نموویەکی بڕواپێنەکراو لە هەڵەی خوێندنەوە و نووسین لە کاتی نووسینی بابەتێکدا بۆ گۆڤاری هەفتانەی پڕفرۆش ڕووی دا. لیژنەی بەرپرسی ئەو گۆڤارەیان لە بەرچاوی گشت خەڵکدا بە بەرتیلخواردن تاوانبار کردبوو. لەو ڕووەوە دەبێ بابەتێک بۆ بە درۆخستنەوەی ئەو بابەتە و بەرگری لە لیژنەی بەرپرس بنووسرابا. ئەو کارەیش بە گرووتین

ئەنجام درا. سەرنووسەر و نووسەر چەند جار دەستنووسی بابەتەکە و پاشان بەڵگەی پیتچنکراویان خوێندەوە و هەموویان زۆر خوشحاڵ دەهاتنە بەرچاو. ئنجا لەپڕ هەڵەبڕەکە ڕۆیشتە پێشەوە و سەرنجی ئامادەبوانی بۆ هەڵەیەک ڕاکێشا کە لە بەرچاوی هەموویاندا شاردرابووەوە. لەو بابەتەدا نووسرا بوو: "خوێنەرەکانمان جەختی لەسەر دەکەنەوە، ئێمە بەردەوام پاڵپشتیمان لە بەرژەوەندی گشتی و بەرژەوەندخوازی کردووە. پێویست بە وتن ناکات، نووسەر مەبەستی هەبووە بنووسێت: بەبێ بەرژەوەندیخوازی. هەروەها بیروباوەڕی ڕاستەقینەی ئەو لەگەڵ وزەیەکی پێداگر لەناو بابەتی پڕ وزەدا دەرکەوتووە.

٦- خاتوو کاتالۆی هەڵەبڕی گۆڤاری پستەرلۆید لە ڕاپۆرتێکی تەلەگرافیدا کە ئەم گۆڤارە لە بەرواری ١٤ـی ئۆکتۆبەری ١٩١٨ـی زاینی لە ڤیەننا وەرگرتبوو دانپیانانێکی بەو شێوەیە بینیوە. "بە گوێرەی متمانەیەکی تەواو کە بە درێژایی جەنگ لە نێوان نەمسا و وڵاتانی هاوپەیمانیدا و ئەڵمانیادا هەیە ڕوون و بەرچاوە ئەو دوو وڵاتە زلهێزە لە بارەی هەر ڕووداوێک کە ڕوودەدات بڕیارێکی گشتی دەدەن. پێویست بە وتن ناکات کە لە قۆناخی ئێستادا لە نێوان وڵاتانی ناهاوپەیماندا متمانەیەکی کاریگەر و پڕ لە بۆشایی (Lückenhaft) لە بری (Lückenlos) بێکەموکوڕ هەیە."

پاش چەند هەفتەیەک نەمساوییەکان توانیان بەبێ ئەوەی پشت بە هەڵەی نووسین یان هەڵەی چاپی ببەستن بیروڕای خۆیانیان لە بارەی "متمانەبەخۆبوونی دوو لایەنە"ـەوە بە ئازادانە دەربڕی.

٧- پیاوێکی ئەمریکی پاش دەمەقاڵە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ ئەورووپا ڕۆیشتبوو و نامەیەکی بۆ نووسیبوو تا حەزی خۆی بۆ ئاشتبوونەوە دەرببڕێت و داوای لە هاوسەرەکەی کرد تا لە

بەروارێکی دیاریکراودا ببینێت. پیاوە ئەمریکییەکە نووسیبووی: "خۆزگە دەکرا تۆیش وەک من بە کەشتیی مۆرانتانیا گەشتت بکردایە"، بەلام نامەکەی نەناردەوە و وای بە باش زانی ئەو پەڕەیە بنووسێتەوە تا هاوسەرەکەی نەزانێت، کە ئەو سەرەتا لە بری مۆرانتانیا نووسیبووی لۆزیتانیا و پاشان وشە هەڵەکەی سڕیەوە و ناوی ڕاستی مۆرانتانیای نایە شوێنی ئەو.

ئەو هەڵە نووسینە بە ڕادەیەک بەرجەستەیە کە پێویست بە شرۆڤەکردن ناکات، بەلام بە ڕێکەوت توانیمان هەندێ وردەکاریی پێ زیاد بکەین: هاوسەری ئەو پیاوە بۆ جاری یەکەم پێش جەنگ و پاش مردنی خوشکە تاقانەکەی ڕۆیشتبوو بۆ ئەوروپا و ئەگەر بە هەڵەدا نەچم هەموو کەشتییەکانی لۆزیتانیا لە کاتی شەڕدا تەقییەوە و تەنها کەشتییەک لەو چەند کەشتییەی دروستکراوی ئەو کۆمپانیایە بوون، مابووەوە مۆرانتانیا بوو.

٨- پزیشکێک منداڵێکی نەخۆشی تاقی کردەوە و لە کاتی نووسینی دەرماندا بوو کە دەبوو وشەی کحولی Alccol تێدابوایە، بەلام دایکی منداڵە ئەوەندە پرسیاری بێهوودە و ناعاقڵانەی خستە ڕوو هەرچەند پزیشکەکە هەولی دەدا ڕەفتاری توندی خۆی پیشان نەدات، بەلام لە بری وشەی Alccol وشەی acholی نووسی کە بە واتای (تووڕە) دێت.

بوارێکی هاوشێوەی ئەوە، کە ئێ. جۆنس و ئێ. ئێ. بریل گێڕاویانەتەوە، دەیانخەینە سەر ئەو نموونانە.

کاک بریل هەرگیز مەشروبی نەدەخواردەوە، بەلام شەوێکیان بە زۆری ڕەفیقەکەی نەختێ شەرابی خواردەوە. سبەی بەیانییەکەی کاتێک لە خەو هەستا ئەوەندە سەری دەئێشا کە لە سستی و لاوازی شەوی ڕابردووی خۆی پەشمان بووەوە، چونکە دەبوا ناوی ئەو



CamScanner

نەخۆشەی کە ناوی ئەتێل Ethel بوو بینووسێت. بە هەڵە وشەی Ethylکحولی ئیتیلیکی نووسی.

ئەو هەڵانەی کە پزیشکەکان لە کاتی نووسینی دەرمانەکاندا تووشی دەبن دەرئەنجامێکی خەفەتبارتریان هەیە تاکو هەڵە ڕەفتارییە ئاساییەکان، بۆیە کەڵک لە دۆخەکە وەردەگرین و تەنها شیکردنەوەیەک کە تا ئێستا بە وردەکارییەکی زۆرەوە لە هەڵەی نووسینی پزیشکێک بە چاپ گەیشتووە، لێرەدا باسی لێوە دەکەین.

هەڵە دووپاتبووەکان لە نووسینی دەرماندا

یەکێک لە هاوکارەکانم دەیگێڕایەوە کە لە ماوەی ساڵێکدا چەند جار لە ڕادەی دەرمانێکدا هەڵەی کردووە و ئەو مەسەلەیەیش هەموو جارێک سەبارەت بە دەرمانێکی تایبەت بووە و لە کاتێکدا دەیدا بە ڕەگەزی مێینە و بەساڵاچوو ڕووی دەدا.

ئەو دوو جار ڕادەی دەرمانەکەی دە ئەوەندە داوە و دوایی بە هەڵەکەی خۆی زانیوە. ئنجا لە ترسی کارەساتێکدا کە ئەگەری بوو بۆ نەخۆشەکە ڕوو بدات و خۆی تووش بکات ناچار بوو خێرا بڕواتە ماڵی نەخۆشەکە و کاغەزی دەرمانەکەی لێ وەربگرێتەوە. ئەم کارە نەخۆشئاسا و سەرسوڕهێنەرە بایەخی شیکارییەکی وردی هەیە و ئێمەیش ئێستا بە خستنە ڕووی وردەکارییەکان ئەوە شی دەکەینەوە.

بواری یەکەم: پزیشک شافتی بلادۆنی دا بە پیرەژنێک، کە تووشی سکچوون و ژانەسک بوو بوو، بەڵام ئەو شافتانە دە ئەوەندەی شافتە ئاساییەکان دەرمانی چالاکی لەخۆ گرتبوو. پاشان نەخۆشخانەی بەجێ هێشت و پاش کاتژمێرێک لە حاڵێکدا لە ماڵەوە نانی دەخوارد لەناکاو هەڵەکەی بیر هاتەوە، ناونیشانی نەخۆشەکەی پرسی و خێرا

خۆی گەیاندە ماڵەوەیان کە لە نەخۆشخانەکەیشەوە دوور بوو. لەوێ پیرەژنەکەی بینی کە هێشتا دەرفەتی کەڵکوەرگرتنی لە دەرمانەکان نەدۆزیبووەوە. پزیشک کاغەزی دەرمانەکەی چاک کردەوە و بە بیرێکی ئاسوودەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. ئەو پاساوەکەی کە بۆ هەڵەکەی هێنایەوە هەڵبەت حەقی بوو وا بڵێت، وتی: لە کاتی نووسینی کاغەزەکەدا تەرکیزم نەبووە، چونکە بەرپرسی نەخۆشخانە کە پیاوێکی زۆربلێ بوو لە دوایەوە ڕاوەستاوە و بەردەوام قسەی کردووە.

بواری دووهەم: پزیشک ناچار بوو لە تاقیکردنەوەی ژنێکی نەخۆش و جوان و نازدار و نەرمونیان دەست هەڵ بگرێت و بۆ بینینی نەخۆشێکی تر کە ژنێکی بەساڵاچوو بوو بڕوات بۆ شار. جیا لەوەیش بەڵێنی چاوپێکەوتنێکی گرنگی هەبوو کە وادەکەی بەمزوانە نزیک دەبووەوە و دەرفەتێکی زۆری بۆ نەدەهێشتەوە. خێرا سواری ئوتومبێلەکە بوو لە کاتی تاقیکردنەوەی نەخۆشەکەدا چەند هێمایەکی دەستنیشان کرد کە کەڵکوەرگرتن لە بلادۆنی بە پێویست دادەنا. دەرمانەکەی نووسی و دیسانەوە تووشی هەمان هەڵەی یەکەم بووەوە، واتە ڕادەی دەرمانەکەی دە ئەوەندە زیاتر نووسی. نەخۆشەکە سەرقاڵی وردەکاریی نەخۆشییەکەی بوو، بەڵام پزیشک کەم تەحەمولی پیشان دا لە حاڵێکدا پیرەژنەکەی دڵنیا دەکردەوە کە تووشی هیچ کێشەیەک نابێتەوە، ماڵئاوایی لەو کرد تا لە کاتی خۆیدا بگاتە سەر وادەی چاوپێکەوتنەکەی کە دایناپوو. پاش دوانزە کاتژمێر لە خەو هەستا و بە ترسەوە بیری هەڵەکەی کەوتەوە. کەسێکی دەستنیشان کرد بڕوات سەردانی نەخۆشەکە بکات، ئەگەر تا ئێستا دەرمانەکەی نەکڕیوە لێی وەربگرێتەوە، بەڵام ئەو کەسەی ڕۆیشتبوو کاغەزی دەرمانەکە وەربگرێتەوە بە دەرمانی ئامادە و کڕدراوەوە گەڕایەوە. پزیشکەکە بە گەشبینییەکی مرۆییانە و بە ئەزموون و

دۆخێک کە گوایە لە بەرامبەر چارەنووسدا کرنۆشی بردووە بۆ لای دەرمانسازەکە ڕۆیشت. دەرمانسازەکە ئەوی لە نیگەرانی هێنایە دەرەوە و وتی بە سروشتی (ڕەنگە بە هەڵەیش؟) هەڵەی نووسینی پزیشکەکەی چاککردووەتەوە و ڕێژەی دەرمانەکەی ئاسایی داوەتێ.

بواری سێیەم: پزیشک دەیویست تێکەڵاوییەک لە تەنتۆری بلادۆن و تەنتۆری تلیاک بە ڕادەیەکی بێ زیان بە پووری بدات. خێرا کاغەزی دەرمانەکەیان بۆ دەرمانخانە برد. پاش ماوەیەکی کەم پزیشکەکە و بیری هاتەوە لە بری تەنتۆر شیرازەی ئەو دەرمانەی بۆ نووسیوە جیا لەوەیش دەرمانسازەکە تەلەفۆنی بۆ کرد و لەو بارەیەوە شرۆڤەی کرد. پزیشکی چارەسەر داوای لێبووردنی کرد و وتی: کاغەزی دەرمانەکەیان خێرا لەژێر دەستدا ڕاکێشاوەتە دەرەوە و دەرفەتی نەبووە کۆتایی پێ بهێنێت و دیسانەوە بیخوێنێتەوە.

ئەو سێ بوارە هەڵە زمانەوانییە سێ خاڵی هاوبەشیان هەیە:

١- هەڵەکە دیسانەوە لە بارەی هەمان دەرمان ڕووی داوە.

٢- لە هەر سێ بوارەکەدا نەخۆشەکە پیرەژنێکی بەساڵاچوو بووە.

٣- ڕادە و ڕێژەی دەرمانەکە لە ئاستی خۆی زیاتری بۆ نووسیوە.

شیکارییەکی خێرا دەریخست پەیوەندی نێوان ئەو پزیشکە و دایکی ڕەنگە کاریگەرییەکی تەواوی لە دابینکردنی دووپاتبوونەوەی هەڵەکەدا هەبوو بێت. بە تایبەتی پزیشکەکە بە بیری هاتەوە ڕۆژێکیان (بە ئەگەری زۆر پێش دەرکەوتی نەخۆشی ئاسا کە من شیم کردەوە) هەر ئەم دەرمانەی بە دایکە پیرەکەی داوە و ڕادەی دەرمانەکەی لە بری ٠/٠٢ سەنتی گرام بێت، زۆر جار دەینووسی ٠/٠٣ سەنتی گرام، تا بە بڕوای خۆی دەرئەنجامی باشتر بەدەست بهێنێت. ئەو ڕادە دەرمانە ببووە هۆی ئەوەی دایکی (کە لە بواری جەستەییەوە ژنێکی

هەستیار بوو) تووشی کۆبوونەوەی خوێن لە ڕووخسار و وشکییەکی ناخۆش لە گەروویدا ببێتەوە. دایکی شکاتی لە دەرئەنجامەکانی دەرمانەکەی دەربڕی بوو و بە گاڵتەوە وتبووی ئەو دەرمانانەی کوڕ دەینووسێت، ڕەنگە هەندێک جار بۆ باوک و دایک مەترسیدار بێت. لە بارودۆخی تردا دایکەکە، کە خۆی کچی پزیشکێک بووە، دژایەتی ئەو دەرمانانەی دەکرد کە کوڕەکەی بۆی دەینووسی و هەڵبەت هەمیشە بە گاڵتە و پێکەنینەوە لە ئەگەری ژەهراویبوون قسەی دەکرد.

تا ئەو ڕادەیەی دکتۆر هیچمان توانیبووی لە پەیوەندیی نێوان دایک و کوڕ تێبگات، کوڕەکە بە شێوەیەکی سروشتی، سۆزدار بوو، بەڵام ئەوەندە باوەڕی بە هۆش و زیرەکی دایکی نەبوو و ڕێزێکی وەهای لێ نەدەگرت. ئەو لەگەڵ دایک و برا بچووکەکەیدا لە خانوویەکدا پێکەوە دەژیان و ساڵانێکە ئەو پێکەوە ژیانە بە لەمپەڕێک بۆ پەیوەندییەکی نزیک دادەنێت. دەروونشیکاری فێری کردووین زۆر جار ئەو ژیانە هاوبەشانە بە شێوەی فشارێکی دەروونی دێتە گۆڕێ. ئەو پزیشکە بەبێ بچووکترین نارەزایەتی شیکاریەکەی قبووڵ کردین و وتی لە شرۆڤەکردنەکەمان زۆر نارازییە، پاشان بە پێکەنینەوە وتی وشەی "بلادۆنا belladonna "دەتوانێ بە واتای "ژنی جوان" بێت و لە بارەی ئەوەیشەوە دەربڕی ڕووداوێکی خۆشەویستانە بێت.

هیوادارم لە بوارەکانی تردا هەڵەیەکی بەو شێوە مەترسیدارە هەرگیز دەرئەنجامی خراپتری لەو نموونەیە بە دواوە نەبووبێت کە باسمان کرد.

٩- ئەمەیش نموونەیەک لە هەڵەی زمانەوانی بێ زیان، کە کاک فرەنزی ڕاپۆرتەکەی بۆ ناردووم. دەتوانین ئەو هەڵەیە وەک دەرئەنجامی تێکەڵکردنێک لێک بدەینەوە، کە خۆی سەرچاوەکەی لە

بێتەحەمولی و بێسەبرییەوە دێت (سەیری هەڵەی زمانەوانی Apfe لە بەشی پێشوودا بکەن) و تا کاتێک شیکردنەوەیەکی قووڵتر دەستێوەردانی شلەژێنەرێکی تری بە هەمان هێزەوە ئاشکرا نەکردووە، ناچارین بەو ڕوانگەیە ڕازی بین: "من لە دەفتەر یاداشتەکەمدا نووسیم: دەکرێ ئەو بابەتە بە anecdote پەیوەند بدەم(Hierzu passte die Anektode لە حاڵێکدا دەمویست وشەی) Anekdote چیرۆکی کورت و گاڵتەجاڕی ) بنووسم. لەم کاتەدا بەتایبەتی بیرم لە چیرۆکێکی کورت لە بارەی قەرەجێک دەکردەوە. پیاوی قەرەچیان سزا درابوو بە مەرگ، بەڵام ئەو مۆڵەتی هەبوو سێدارەکەی خۆی هەڵبژێرێت، ماوەیەک بیری لێ کردەوە، بەڵام هیچ سێدارەیەکی پەسەند نەکرد.

١٠- بە پێچەوانەوە لە بوارەکانی تردا هەڵەیەکی نووسین بە ڕواڵەت بێبایەخ دەتوانێت واتایەکی زۆر جددی هەبوو بێت. پیاوێکی نەناسراو دەیگێڕایەوە: "من نامەیەکم بەو ڕستەیە کۆتایی پێ هێنا: سڵاوی گەرمم بگەیەنە بە خانم و کوڕەکەی"، بەڵام ڕێک لەو کاتەدا کە دەمویست نامەکە بخەمە ناو زەرفەکەوە ئاگاداری هەڵەکەم بوومەوە و خێرا پێیداچوومەوە. ڕاستییەکەی دوایین جار کە لە سەردانی ئەو بنەماڵەیە دەگەڕامەوە ژنێک لە هاوڕێکانم وتبووی کوڕی ئەو ژن و مێردە زۆر هاوشێوەیە لەگەڵ یەکێک لە ڕەفیقە نزیکەکانی ئەوان و بە دڵنیاییەوە منداڵی ئەوە.

١١- خاتوونێک بۆ خوشکەکەی نامەیەکی کورتی نووسی تا پیرۆزبایی لێ بکات، کە لە خانوویەکی نوێ و جواندا سەقامگیر بووە. یەکێک لە هاوڕێیان کە بۆ سەردانی ئەو خاتوونە چوو بوو لە کاتی نووسینی نامەکەدا ئامادە بوو و پێی وت کە ناونیشانی سەر زەرفی نامەکەی بە هەڵە نووسیوە. تەنانەت ناونیشانەکە پەیوەست بەو

خانووه نەبوو کە خوشکەکەی ئەو خاتوونە لەم دواییانە کەلوپەلی بۆ گواستوەتەوە، بەڵکوو ناونیشانەکە شوقەیەک بوو کە ئەو ماوەیەک لەوەوپێش واتە خێرا پاش هاوسەرگیرییەکەی تیایدا ژیابوو. خاتوون جەختی لەسەر قسەی هاورێکەی کردەوە و وتی: "مافی ئێوەیە، بەڵام بۆچی تووشی هەڵەیەکی وەها بووم؟" هاورێکەی وتی: "ڕەنگە بەو هۆیەوە بووبێت کە بەخیلی بە خوشکەکەت دەبەیت و خەفەتی بۆ دەخۆیت کە ئەو خانوویەکی جوان و گەورەی هەیە لە حاڵێکدا شوێنی ئێوە تەسکە. لەو ڕووەوە لە هەمان شوقەی جاران داتناوە کە بە پێی شوقەکەی ئێستاتان هیچ ئەولەویەتێکی نییە." خاتوونەکە بە ڕاشکاوی دانی پیادانا: "هەڵبەت من بەخیلی بە شوقە تازەکەی دەبەم." بەڵام خێرا وتی: "چەندە جێی داخە کە ئێمە لەم جۆر مەسەلانەدا ئەوەندە نزم و کورت بیر دەکەینەوە".

١٢- کاک ئی. جۆنس نموونەی لای خوارەوە کە خۆی لە کاک ئی. ئی. بریل بیستبووی پێی وتین، پیاوێکی گەنج نامەیەکی بۆ دکتۆر بریل نووسیوە و هەوڵی دابوو ئەو مەسەلە و کێشانەی کە هۆی تووڕەبوون و نائارمییەکەی بوو شرۆڤە بکات. ئەو لەم نامەیەدا بە تایبەتی لە کێشەی بازرگانیکردنی کە هۆی قەیرانی کارگەکانی چنین و ڕستنی دادەنا، قسەی کردبوو. لە نامەکەیدا ئەم ڕستەیەی لای خوارەوە دەبینرێت.

My trouble is all to that damned frigid wave, there isn t even any seed.

(هەموو شڵەژاوییەکم بەهۆی جووڵەی خاو و نەگونجاو...)

هەڵبەت ئەو دەیویست بە نووسینی (وشەی wave ڕووداوی کارە بازرگانییەکانی ڕابگەیەنێتە پزیشکەکە، بەڵام لە ڕاستیدا لە بری وشەی wave وشەی Wife هاوسەر)ی بەکار هێنا بوو. ئەو پیاوە

نەخۆشـــە تارادەیـــەک وا بیـــری دەکـــردەوە نەبـــوونی ڕازیبـــوونی هاوســەرەکەی و تەحەمولکردنی ئەو دۆخە بۆ دەرکەوتنی هێماکانی شڵەژاوی و نائارامی ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت.

١٣- دکتۆر ڕ. واگنەر بوارێکی تایبەتی شرۆڤە کردووە.

کاتێـک دەفـتەری کـۆنی وانەکـانم دەخوێنـدەوە، تێگەیشـتم، کە بە شـێوەیەک خێـرا قسـەکانی مامۆسـتاکەم یادداشـت دەکـرد، تووشـی هەڵەیەکی نووسین بووم و لە بری وشەی Epithel تووێژی شیداری لینج نووسیومە Edithel بە پشتبەستن بە فۆنەتیکی یەکەمی وشەی Edithelنـاوی کـورتکراوەی کچێکـی گەنـج بەدەسـت دێت. شـیکاری دووردااهات کارێکی سادەیە. کاتێک تووشی هەڵە بووم لە نێوان من و کچێکی گەنجدا کە Edithe ئیدیتی ناو بوو، پەیوەندی دوور و کزی دابین کرد. دوایی پەیوەندییەکە نزیکتر بووەوە. لەو ڕووەوە هەڵەی من جەختێکی بەرجەستە بوو لەسـەر ئاڕاستەی نەستم، کە بەرامبەر بەو کـچە هەمبـوو ئەو ئاڕاسـتەیە کاتێـک بـوو کە نەسـتی هوشـیارم تەنانەت بیری نەدەکردەوە لە ئەگەری پەیوەندییەکی هاوڕێیانە لەگـەڵ ئیدیتدا.

١٤- خـاتوو دکتـۆر ڤـۆن هـۆگ مێلمـۆت لە "ڕاپۆرتێکدا لە بـارەی هەڵەکانی خوێندنەوە و نوسین"ەوە دەنووسێت:

پزیشـکێک لە بری شـیرەی "Levico" شـیرەیـ "Levitico"ی پێ دا و ئەو هەڵەیەش بیـانوویەکی دایە دەسـت دەرمانسـازەکە تـا قسـەی نەشـیاو و نەگونجـاو بکـات. سـەرباری ئەوەیـش ئەگەر بتـوانین هۆکارەکـانی ئەگەری ئەو هەڵەیە لە ویژدانـی نەسـتی پزیشـکەکەدا بە دوادا بگەڕێن و بە پێشـداوەری ئەوانە بە ناڕاست دانەنێین، ئەگەری شرۆڤەی ئاسـان و سـاکاری ئەو هەڵە نووسینە لە ئارادایە. هەرچەند وا دیـارە ئەو هۆکـارانە دەربـڕی بـڕوا زەینیـیە شەخسـییەکانی ئەو

بێگانەیەیە لەگەڵ پزیشکەکەدا. پزیشکی ناوبراو نەخۆشەکانی بەهۆی خۆراکی نامەنتقییان بە ڕستەی زۆر ناشیرین لۆمە دەکرد، بەڵام سەرباری ئەوەی خوویەکی هەبوو بەرامبەر بە حەڵپساندن و لۆمەکردن (Leviten Lesen) وشە بە وشە: خوێندنەوەی ئامۆژگارییان هەبوو، ڕێژەی نەخۆشەکانی بێ ئەژمار بوو بە شێوەیەک کە ژووری چاوەڕوانی عیادەکەی لە کاتی قبوڵکردندا شوێنی چۆڵی لێ نەبوو و ئەو ناچار بوو پاش کۆتایی تاقیکردنەوە نەخۆشەکان هان بدات بۆ بەپەلە لەبەرکردنی جلوبەرگەکانیان بە خاووخلیچکی و ڕەنگە بە زمانی فەرەنسی پێیانی گوتبێت:"vite, vite زوو، زوو. ئەگەر لە بیرمان بێت کە هاوسەرەکەی بە ڕەچەڵەک فەرەنسی بوو، ئەو کارە تاڕادەیەک مەرجی ئازایانەی منی لەسەر بنەمای کەڵکوەرگرتنی لە زمانی فەرەنسی کاتێک کە دەیویست نەخۆشەکانی بە خێراییەکی زیاتر یەک بە دوای یەکدا بڕۆنە ژووری تاقیکردنەوەکە، پاساو بهێنێتەوە. هەروەها کەسانێکی زۆر خوویان بەو جۆرە داخوازیانەوە گرتووە کە بە زمانی دەرەکی دەریببڕن. بۆ نموونە باوکم کاتێک ئێمە منداڵ بووین و لەگەڵیدا بۆ سەیران دەڕۆیشتین زۆر جار بە زمانی ئیتالی "Avanti gioventu" یان بە زمانی فەرەنسی دەیگوت:!marchez au pas" ، (پیاسە بکەن). فەرمانەکانی خۆی پێ دەداین. کاتێک کچێکی گەنج بووم، پزیشکێکی بەساڵاچوو کە چارەسەرکردنی منی لە ئەستۆ گرتبوو هەوڵی دەدا جووڵەی لەناکاو و بەپەلەم ئارامتر بکاتەوە و بە زارێکی دڵنیابەخش دەیوت: !Piano , piano" هێواش، هێواش). لەو ڕووەوە بە ڕای من لەوانەیە هەر ئەو خووە بەو پزیشکەوە پەیوەند بدرێت. کەواتە ئەو دەرمانەی بە هەڵە بە نەخۆشەکەی دابوو (شیرەی Levitico لە بری شیرەیLevico) شرۆڤەیەک دەدۆزێتەوە.

هەمان نووسەر چەند نموونەیەکی تری لە سەردەمی گەنجێتی خۆی

بۆ سەر بواری یەکەم زیاد کردەوە.

١٥- ئەمەیش هەڵەیەکی نووسینە کە دەتوانیت بە پیشەیەکی وتاری بژمێردرێت کە سەرچاوەکەی لە سەلیقەی خراپەوەیە، بەلام کەسێک کە تووشی بووە بە هیچ شێوەیەک مەبەستی گاڵتە و قسەخۆشی نەبووە. ئەو هەلانە کاک ی. گ پێی وتم. من هاوکاریی ئەوم پێشتر لە توێژینەوەیەکدا باس کردووە.

"بەهۆی ئاوسانی سییەکانەوە لە نووستنگەیەکدا خەواندبوومیان، ئاگادار بوومەوە زانیبوویان یەکێک لە خزمانی نزیکم تووشی هەمان نەخۆشی بووە. زۆر نیگەران بووم و نامەیەکم بۆ نووسی. داوام لێ کرد بڕوات سەردانی پزیشکێکی تایبەت و پسپۆڕێکی بەناوبانگ بکات کە منی چارەسەر دەکرد و وتم متمانەیەکی زۆرم بە کارمەیی و زیرەکی ئەو پرۆفیسۆرە هەیە، بەلام ڕەفتار و هەڵوێستیم زۆر بە دڵ نییە، چونکە ماوەیەک لەوەوپێش منی لەسەر بنەمای بەڵگەی پزیشکی، کە زۆر بە لامەوە گرنگ نەبوو پەسەند نەکردووە. لە وەلامێکدا کە خزمەکەم بۆی نووسیبووم سەرنجی بۆ هەڵەیەکی نووسین لە نامەیەکدا ڕاکێشام. من خێرا هۆکاری ئەو هەڵەیەم دۆزییەوە و ڕووداوەکەیش بووە هۆی سەرقاڵیم.

لە ڕاستیدا لە بەشێک لە نامەکەدا نووسیبووم: "هەروەها ئامۆژگاریت دەکەم بەبێ فێرۆدانی کات بڕۆیتە لای پرۆفیسۆر X و جنێوی پێ بدەیت (Insulter) وا دیارە دەمویست بنووسم (Consulter). دەبێ بڵێم من زمانی لاتین و فەرەنسیم بە باشی دەزانی و ناکرێ هەڵەکەم بخەمە ئەستۆی زمانەکە.

سروشتییە ئەو کەموکوڕیانەی کە لە کاتی نووسیندا ڕوو دەدات، دەتوانێت هەندێ شرۆڤەی لەم بابەتە بکات. کاک ب. داتنەر دکتۆرای یاسا، نموویەکی زۆر سەیری لە "هەڵەی ڕەفتاری مێژوویی" باس

کردووە:

"بە مادەیەکی یاسایی لە بارەی بەڵێنە داراییەکانی نێوان دوو وڵاتی نەمسا و مەجارستان کە لە ساڵی ١٨٦٧ کاری پێ کرا وشەی ڕاستەقینەی effectif لە وەرگێڕاندا بە زمانی مەجاری لابرا بوو. بە بۆچوونی کاک داتنەر ئەو کەموکوڕییە بە ئەگەری زۆر ئاڕاستەی نەستی نووسەرانی مەجارستانی مادەی یاسایی بۆ ئەم کارە پیشان دەدا کە کەمترین ئیمتیاز بە وڵاتی نەمسا بدات.

هەروەها هەموو هۆکارەکان هاندەرمانە بۆ پەسەندکردنی بواری زۆر باوی دووپاتکراو و دووبارە نووسینەوەی وشە یەکسانەکان لە کاتی نووسین یان پاکنووسکردنەوەدا، واتە ئەو بوارانەی پێی دەوترێت "دووپاتبوونەوەی ناپێویست"، بەبێ واتا نین. کاتێک نووسەر پێشتر ئەو وشەیەی نووسیوە لەو ڕێگایەوە پیشانی دەدات بە دژواری دەتوانێت لەو وشەیە دەست هەڵ بگرێت و لە ڕستەیەکدا کە ناوەڕۆکی ئەو وشەیە توانیویەتی مەسەلەیەکی زۆر بخاتە ڕوو، بەڵام کەمتەرخەمی کردووە و... هتد. "دووپاتبوونەوەی ناپێویست" لە کاتی  پاکنووسدا بە ڕواڵەت دەبێتە جێگر بوو "بە بۆچوونی منیش هەر وایە". من لە پزیشکی یاساییدا بۆچوونی زۆرم خوێندووەتەوە، کە بەرچاوترین بەشەکانی "دووپاتبوونەوەی ناپێوییت"ـی هەبووە و هەموو جارێ ویستوومە هۆی ئەو کارە بە جۆرێک لە بێزاری دابنێم: پاکنووسکەرەوەی بابەتەکە لە ڕۆڵی جگە لە خۆی کە پێی سپێردراوە نیگەران و ئازاراوی بووە، گوایە هەموو جارێ ویستوویەتی لێکدانەوەیەک بداتە بابەتەکە بۆ نموونە: "منیش هەر بەو شێوەیە بیر دەکەمەوە" یان "لە وڵاتی ئێمەدا، لە بنەماڵەماندا... ڕێک هەر بەو شێوەیە".

هیچ شتێک لەمپەر نییە لە بەردەم ئەوەی هەڵە چاپییەکان یان



CamScanner

تایپییەکان بەو شێوەیە واتە وەک هەڵەی نووسینی تایپی دابنێین و بڕوا بەوە بکەین ئەو هەڵانەیش وەک هەڵە نووسینییەکان مەبەستێکیان هەیە. من بۆ دابینکردنی پێرستێکی ڕێکوپێک لە هەڵە ڕەفتارییەکان زەحمەتم نەکێشاوە، بەڵام دڵنیام کە پێرستێکی وەها ئەگەر هەبوو سەرقاڵکەر و ئەزموونـدار بوو. کاک جۆنس لە توێژینەوەیەکدا کە تا ئێستا چەندین جار یادمان لێ کردووەتەوە پارەگرافێکی تایبەتی تایبەت کردووە بە هەڵە چاپییەکان. گۆڕینی ناوەڕۆکی تەلەگراف لە زۆر بواردا دەتوانێ ببێتە هەڵەیەک کە وەرگر یان بدەری تەلەگراف تووشی بووە. بە درێژایی پشووەکان تەلەگرافێکم لە خاوەن چاپەمەنییەکەمەوە بەدەست گەیشت کە لە ناوەڕۆکەکەی تێنەدەگەیشتم، چونکە لە تەلەگرافەکەدا نووسرابوو:

Vor RÄTE erhalten, EinLADUNG X. drindend

(سەرچاوەکانی وەرگرتن، دەعوەتیX، خێرا). ناوی X کلیلی مەتەڵەکەی دایە دەستم. کاک X نووسەرێک بوو کە دەبوا پێشەکییەکم بۆ کتێبەکەی بنووسیبا (واتە وشە دروستەکە ئەمە بوو Einleitung نەکEinladung) پاشان وەبیرم هاتەوە چەند ڕۆژ لەوەوپێش پێشەکییەکم Vorrede نەک Vorräte بۆ کتێبێکی ترم نووسیبوو و خاوەن چاپەمەنییەکە لە ڕێگای تەلەگرافەوە هەواڵی وەرگرتنی ئەوەی دابوو. لەو ڕووەوە بە ئەگەری زۆر ناوەڕۆکی دروستی تەلەگرافەکە وەها بوو:

Vorrede erhalten, Einleitung X. dringend.

(هاوپێچی هاتوو، پێشەکی X، پەلە).

دەتوانرێ وا تێبینی بکرێت کە هۆکاری گۆڕانی بابەتی "گرێی برسێتی"

وەرگـری ئەلەگـرافەکە بـووە. هاوکـات ئەو لە نێـوان دوو بەشـی بـابەتەکەدا هاوئـاهەنگییەکی لۆژیکیـانەتری بەگـوێرەی ئەوەی کە لە بابەتەکەدا هەبوو، دروست کردبوو. لێرەدا نموونەیەکی شیاو بەدی دەکرێـت لە "پێدانی دووەم"، کە لە زۆربەی خەیاڵەکانیشـدا بەر چـاو دەکەوێت.

هەندێک کەس هەڵەی چاپی تریان ئاماژە پێ کردووە، کە بە زەحمەت دەکرێ نکۆڵی لە تایبەتمەندی ئاراستەدار بوونیان بکرێت. من لێرەدا باس لە بابەتی ( ئەشترۆفەر) و نووسینێک کە لە هەمان گۆڤاردا چاپ کرا دەکەم.

"لە ژمارەی ٢٥ـی نیسانی رۆژنامەی "مارز"دا هەڵەیەکی چاپی لە بابەتی سیاسەت بەدی دەکرێت. هەواڵنێرێک راپۆرتێکی سـەبارەت بە ئارگی کاسـترۆن لە بارەی بیر و باوەڕەکانی زوگرافوس، سـەرۆکی ئەپیرەکانی شۆڕشگێری ئاڵبانی (یان ئەگەر پێتان باشترە، دەوڵەتی سەربەخۆی ئەپیر) بەرز کردبۆوە. بە پێی ئەم هەواڵە، زوگرافوس لە درێژەی قسـەکانیدا وتبووی: "بڕواتـان هەبێت کە شـازادە لە هەمـوو کەس زیـاتر هـۆگری سـەربەخۆیی ئەپیـرە، چـونکە تەنیـا لە وڵاتـی سـەربەخۆی ئەپیـردا ئەگەری ڕووخـانی تـاج و تەخـتەکەی هەیـە (Stutzen) " لە ڕاسـتیدا، شـازادەی ئەلبـانی بـاش دەیزانـی کە پەسندکردنی پارێزگاریکردن لە ئەپیرەکان کە وەک پێشنیار ئاراستەی دەکرا تەنیا دەبێتە هۆی دواکەوتن و ڕووخانی (Sturz) دەوڵەتەکەی و پێویستی بەم هەڵە چاپییە نەبوو."

بەم دواییـانە لە یەکێـک لە ڕۆژنامەکـانی چـاپی ڤیەننـادا بـابەتێکم خوێندەوە، کە ناونیشانەکەی بەم شێوەیە بوو: بوکوین ژێر سوڵتەی ڕۆمانیا. ئەم ناونیشـانە شتێکی ناوەخت بـوو، چونکە ئەو کـاتەی کە بابەتەکـە چـاپ کـرا، ڕۆمانیا هێشـتا لەگەڵ نەمسـا دەسـتی بە شـەڕ

نەکردبوو. بە پێی ناوەڕۆکی بابەتەکە، پێدەچێت ناونیشانە ڕاستەکەی ئەمە بووبێت: "بوکوین لەژێر سوڵتەی ڕووسیا"دا، بەڵام، لەوانەیە ئەو کەسەی کە کاری سانسۆرکردنەکەی لە ئەستۆ بووە ئەم ناونیشانەی بە ڕادەیەک سروشتی خستووەتە بەرچاو کە بەبێ بچووکترین نارەزایەتییەک بە چاپی گەیاندووە.

بە بۆچوونی "وۆنت" ئێمە بە ساکارییەکی زیاترەوە تووشی هەڵەی نووسین دەبین تا تووشی هەڵەی زمانەوانی، ڕاڤەی ئەو توێژینەوەیە دەکرێ بە ئاسانی بخەیتە بەر لێکۆڵینەوەوە. وۆنت دەنووسێت:

"لە کاتی وتوویژێکی ئاساییدا پراکتیکی هۆی ڕاوەستانی ئیرادە بە بێوچان یارمەتی دەدات تا پەیوەندی بەردەوامی دەرخستەکان و جووڵە زمانەوانییەکان بپارێزرێت، بەڵام کاتێک جووڵەکان سەبارەت بە دەبڕین کە پەیڕەوی دەرخستەیە بەهۆی میکانیکی خاو بوونەوەوە، بۆ نموونە لە کاتی نووسیندا هەندێ پێشوەچوون لە جۆرەکانی ناوبراو لە لای سەرەوە ئاسانتر ڕوو دەدات".

بینینی هەلومەرجی دەرکەوتنی هەڵەی زمانەوانی شک و گومانێک پێک دێنێت، کە ناکرێت بە ڕاوەستان بمێنێتەوە، چونکە بە ڕای من هەر ئەم شک و گومانە دەتوانێت ببێتە خاڵێکی دەسپێک بۆ توێژینەوەی بەنرخ. هەموو کەسێک دەزانێت کە لە کاتی قسەکردن بە دەنگی بەرز، کە تەرکیزی خوێنەر لە بابەتەکە لابدات و بە دوای ئەندێشەکانی خۆیدا دەڕوات، لە دەرئەنجامی ئەم لادانی تەرکیزەوە زۆر جار ئەگەر لە کاتی خوێندن بە دەنگی بەرز قسە بە خوێنەرەکە ببڕین و هەندێ پرسیار لە بارەی بابەتەکەوە بپرسین، خوێنەر ناتوانێت واتای ئەو شتەی خوێندوویەتیەوە بگێڕێتەوە. لەو ڕووەوە خوێندەوەکەی هەرچەند ڕاستە، بەڵام بە شێوەیەکی خۆبەڕێوەبەر ئەنجام دراوە. هەڵبەت پێم وا نییە کە ناوەڕۆکی ئەم هەلومەرجە وەها

بێت، کە هەڵەکانی خوێندنەوە زیاتر بکات. لە ڕاستیدا ئێمە دەزانین یان وا بیر دەکەینەوە دەزانین، کە زۆربەی پراکیتیکی مێشک و جەستەمان خۆبەڕێوەبەرن، بەو واتایە، کە بەبێ سەرنجی ویژدانی نەستمان و بەو لێکدانەوەیە بە وردبینییەکی زۆرەوە ئەنجام دەدرێن. بۆیە وا دێتە بەرچاو کە بارودۆخی سەرنجی مرۆڤ لە کاتی هەڵە خوێندنەوەکان و هەڵە زمانەوانییەکان یان هەڵە نووسینییەکان دوور لەو شتە بێت کە وۆنت پروپاگەندەی بۆ دەکات (واتە لادان یان کەمکردنەوەی سەرنج). ئەو نموونانەی شییان دەکەینەوە بە هیچ شێوەیەک ڕێگە نادەن کە کەمبوونەوەی بوونی سەرنج پەسەند بکەین، چونکە ئەو شتەی دۆزیومانەتەوە تێکچوونی تەرکیزە کە لە دەستێوەردانی ئەندێشەیەکی دەرەکی و نامۆ پێک دێت و ئەو مەسەلەیە بە تەواوی لەگەڵ کەمکردنەوەی سەرنجدا جیاوازە.

## بەشی حەوتەم

## لەبیرچوونەوەی لێتێگەیشتن و بەرنامەکان

بەو کەسانەی کە دەستکەوتەکانی ئێستای دەروونناسان و دەروونشیکارەکان لە بارەی ژیانی دەروونیی مرۆڤ بەبایەختر و بەربڵاوتر لەو شتە ڕاستەقینەیەی وا بیری لێ دەکەنەوە دەبێ ڕێنوێنی بکەم ئێمە هێشتا لە بارەی کارکردنی زەین لە نەزانی و نەخوێندەواریدا بەسەر دەبەین و لەم ڕووەوە وانەیەک لە لەخۆبووردەییان فێر بکەین.

تا ئێستا هیچ مەسەلەیەکی دەروونناسی نەیتوانیوە ڕاڤەیەکی تەواو

له دیاردەی لەبیرچوونەوە و وەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکان بخاتە ڕوو و تەنانەت شیکردنەوەیەکی تەواوی بینینە پراکتیکییەکان تەنها لە خاڵی دەسپێکدایە. لە کاتێکەوە هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی خەونەکان و دیاردەکانی زیانناسی فێری کردووین کە تەنانەت ئەو بابەتەکانەی بیری لێ دەکەینەوە ماوەیەکە لە بیرمان کردووە دەتوانن لەناکاو لە ویژدانی نەستماندا دەربکەون و ڕەنگە لەبیرچوونەوە زیاتر لە وەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکان بە شێوەی مەتەڵ پێک هاتبێت. بەو شێوەیە هەندێ ڕاستیمان دەست کەوتووە، هەرچەند بە ڕێژەی پەنجەکانی دەستن، بەڵام هیواداریین بەمزوانە لە سەرانسەری دنیادا بناسرێن. ئێمە لەبیرچوونەوە بە دەرئەنجامێکی خۆهاندەر دادەنین کە دەکرێت بۆ بەربڵاوبوونی ماوەیەک لە بەرچاو بگیردرێت و ئەو هەوڵەی دەیدەین بەرجەستەتر بیخەینە ڕوو کە لە دەرئەنجامی لەبیرچوونەوەوە جۆرێک لەو هەڵبژاردنانەی بە زەیندا دەهات ئەنجام دەدرێت. ئەو کارە لە بارەی هەر کام لە هەڵسەنگاندنەکان و هەر کام لە ڕووداوەکانی ژیانمانەوە پشتڕاست دەکاتەوە. ئێمە دەزانین هەندێ بارودۆخ بۆ پاراستنی بیرەوەرییەکان، یان وەبیرهێنانەوەیان پێویستە و نەبوونیان دەبێتە هۆی لەبیرچوونەوە، بەڵام بە تێبینی لەسەر زۆربەی بارودۆخەکان کە لە ژیانی ڕۆژانەدایە بە ناچاری دەبێ دانی پێدا بنێین زانیارییەکانمان زۆر ناتەواوە و کەموکورتی هەیە. ئەگەر دوو کەس لە بەرچاو بگرین کە وێنە و دیمەنی دەرەکی یەکسانیان وەرگرتووە (بۆ نموونە دوو کەس کە پێکەوە گەشتیان کردووە) و پاش ماوەیەک لەگەڵ یەکتردا بیرەوەرییەکانیان دەگێڕنەوە، ئەو شتەی لە زەینی یەکێک لەو دوو کەسەدا تۆمار بووە، زۆر جار لە بیرەوەرییەکی تردا وەها لەبەین چووە، گوایە هەرگیز بوونی نەبووە و ناکرێت بڵێین ئەو تێگەیشتنانە بۆ یەکێک لەو دوو کەسە زیاتر لە کەسانی تر چەمک و هۆکاری هەبووە. کەواتە دیارە هۆکاری زۆر

زاله بەسـەر هەڵبژاردنـی ئەو ڕووداوانەی کە دەبـێ بە مێشـک بسپێردرێت و ئەم هۆکارانەیش هێشتا بە نەناسراوی ماونەتەوە.

چـونکە حەزم کـرد بەشـێکی، هەرچەنـد کەمـیش بێـت لە ناسـینی هەڵـومەرجی لەبیرچـوونەوەدا خـۆم لە خۆمـدا پێـک هێنـا، هەمـوو بوارەکانی لەبیرچوونەوەی شەخسیم شیکاریی دەروونناسانە بکەم. زۆر جار کار لەسەر جۆرەکانی لەبیرچوونەوە دەکەین، کە بە تایبەتی دەبـووە هـۆی سەرسـوورمانم، چـونکە وا بیـرم دەکـردەوە ڕاستییە لەبیرکراوەکانم بە تەواوی بە مێشکم ڕاسپاردووە. با ئەوەیش بڵێم ئەوەنـدەیش حەز نـاکەم ئاراستەیەکم بـۆ سـاکارکردن و ئاسـانکردنی لەبیرکردنـی ئەو شـتەی بەشـێکە لە ئەزمـوونی شەخسـیم (نەک ئەو شتەی لەبەرم کردووە) هـەبێت، جیا لەوەیش لە سـەردەمی گەنجێتیدا لە مـاوەیەکی زۆر کورتـدا زەینێکـی زۆر کـورتم هەبـووە. کاتێـک خوێنـدکار بـووم لاپەڕەیەکـی تەواوم دەخوێنـدەوە و دەمتـوانی خێـرا ناوەڕۆکەکەی لەبەر بڵێمەوە ئەو کارەیش بە لامەوە جۆرێک بوو لە سـەرقاڵی، مـاوەیەک پێش ڕۆیشـتنم بۆ زانکۆ تـوانیم قسـەیەک کە بە لای خەڵکەوە پەسـند بێـت یـان قسـەکردنێکی زانسـتی کە بیسـتبووم تاڕادەیەک وشـە بە وشـە بڵێمەوە: کاتێک لە دوایین تاقیکردنەوەکانی بەشی پزیشکیدا بەشداریم دەکرد، ئامادەسـازی بۆ ئەو تـاقیکردنەوانە فشارێکی زۆری خستە سەر زەینم و دیسانەوە ناچار بووم پشت بە پاشـماوەی بیـری بەهێـزم ببەسـتم، چـونکە لە زۆربەی وانەکانـدا، ئەو وەڵامەی کە دەمــدایەوە بە بەشـــداربوانی تــاقیکردنەوە تــاڕادەیەک ئۆتۆمـاتیکی بـوو، واتە هاوشـێوەی ئەو بـابەتە بـوو کە لە کتێـبەکەدا تەنیـا یەک جـار خوێنـدبوومەوە، ئەویـش بەپەلە و ڕووکەشـیانە. لەو کاتە بەدواوە بیرم ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازتر بوو، بەڵام توانیم دڵیا ببمەوە لەوەی کە ئەگەر کەڵک لە تـاکتیکێکی سادە وەربگرم، دەتـوانم زیـاتر لەوەی کە بیری لێ دەکەمەوە، بابەت لەبەر بکەم و هێشـتایش بڕوام

بەم شتەیە. بۆ نموونە کاتێک نەخۆشێک دێت بۆ لام و لە دانیشتنی ڕاوێژکاریدا دەڵێت پێشتریش سەردانی منی کردووە، من لە کاتێکدا نە ئەم ڕووداوە و نە بەروارەکەییم لەبیرە، هەوڵ دەدەم بیر لە ساڵانی ڕابردوو بکەمەوە و ئەم حیساباتە لە سەرەتای کاتی ئێستادا، دەست پێ دەکەم بۆ ئەوەی بتوانم چاوپێکەوتنی پێشووم بەبیر بێتەوە. هەر جارێک کە بەڵگەی تۆمارکراو یان هەندێک تێبینی نەخۆش وا لە من دەکات کە بتوانم ئەو مێژووەی من دامناوە دووبارە پێیدا بچمەوە، دڵنیا دەبمەوە کە هەڵەی من، لە ماوەی زەمەنێکی دە ساڵە، بە دەگمەن شەش مانگی تێپەڕی کردووە.

هەروەها کاتێک کەسێک دەبینم کە دووراودوور دەیناسم و وەک دەربڕینی ئەدەب و ڕێز ئەحوالی منداڵەکانی دەپرسم ئەگەر ئەو دەست بکات بە قسەکردن لە بارەی پێشکەوتنیانەوە، من هەوڵ دەدەم تەمەنیان لە زەینی خۆمدا دەستنیشان بکەم و پاشان ئەو دەرئەنجامەکانم بەو زانیاریانەی باوکیان پێم دەڵێت پێوانەی بکەم. دەبێ بڵێم لە بارودۆخێکی وەهادا بە دەگمەن تووشی هەڵە دەبم، واتە تەمەنی منداڵەکە بە جیاوازی یەک مانگ یان کاتێک مەسەلەکە لە بارەی منداڵی گەورەترەوەیە بە جیاوازی سێ مانگ مەزەندەی دەکەم. سەرباری ئەوەیش ناتوانم بڵێم لە چ هێمایەک بۆ هەڵهێنان و مەزەندەکردن کەڵک وەردەگرم. من لەو بارەیەوە ئەوەندە ئازایەتیم پەیدا کرد، هەموو ڕۆژ دوا بە دوای یەک بە شێوەی خۆهاندەر بەروارەکان هەڵبێنم و لەو مەترسییەی هەموو جارێک بەبێ ئەوەی باوکەکە ئاگای لە نەبوونی وریاییم لە بارەی تەمەنی منداڵەکانیەوە بێت پرسیارم کردووە. بەو شێوەیە من زەینی هەستیم پەرە پێ دەدەم و ئەو کارەیش بە کەڵکوەرگرتن لە زەینی نەستم کە بەهێزترە ئەنجام دەدەم.



CamScanner

ئێستایش چەند نموونەیەکی زۆر سەیر لە بارەی لەبیرکردنی بەرچاوەوە باس دەکەم و دوو دۆخی لەبیرچوونەوە لێک جیا دەکەمەوە: لەبیرچوونەوەی تێگەیشتنەکان و ڕاستییەکانی ڕابردوو (واتە ئەو ڕاستیانەی دەزانین لە زەینی هەستماندا هەبوون) و لەبیرچوونەوەی پلان و بەرنامەکان (واتە سڕینەوە). هەر لە ئێستاوە دەبێ بڵێم سەبارەت بە هەندێ لە بینینەکانم بە دەرئەنجامی یەکسان گەیشتووم. بۆ نموونە تێگەیشتووم کە زۆر جار مەبەستی لەبیرچوونەوە، هەستێکی ناخۆش بووە.

یەکەم: لەبیرچوونەوەی تێگەیشتنەکان و زانیارییەکان

١- بە درێژایی هاوین هاوسەرەکەم بووە هۆی دڵئێشانم. بیانووە هیچوپووچەکەی ئەمە بوو: ئێمە لە ئوتێلێکدا، لەسەر کورسییەک دانیشتبووین و پیاوێک خەڵکی ڤیەننا بوو، کە دەمناسی و بە چەند هۆیەک منی بە بیر دەهاتەوە لە بەرامبەرماندا دانیشتبوو. سەرەڕای ئەوەیش بەهۆی چەند مەسەلەیەکەوە وام بە باش زانی خۆمی پێ بناسێنم. هاوسەرەکەم کە تەنها ناوبانگی باشی ئەوی بیستبوو بە ڕاشکاوی پیشانی دەدا، کە وتووێژی لەگەڵ ناسراوەکانیدا درێژە پێ دەدات و هەندێک جاریش لە بارەی باسکردنیانەوە هەندێ پرسیاری لێ دەکردم. بەهەرحاڵ، تەحەموولم نەما و تووڕە بووم. پاش چەند هەفتەیەک لە ڕەفتاری هاوسەرەکەم لە بەردەمی یەکێک لە خزمەکانمدا گلەییم کرد، بەڵام هەرچەند هەوڵم دا نەمتوانی تەنانەت وشەیەک لە وتووێژی ئەو پیاوە و ناسراوەکانی بەبیر بهێنمەوە، چونکە کەسێکی ڕقهەڵگرم و تەنانەت بچووکترین وردەکاری ڕووداوێک کە دەبێتە هۆی نیگەرانی من، لەبیر ناکەم، ناچارم پەسەندی بکەم، کە لە بارەی ئەو ڕووداوە تایبەتەوە بەهۆی ڕێزم لە

بەرامبەر هاوسەرەکەم لەپڕ تووشی بۆشاییەکی تەواو بووم. ماوەیەک لەمەوبەریش ڕووداوێکی هاوشێوەم بەسەر هات. بە ئامادەبوونی کەسێک دەمویست گاڵتە بە هاوسەرەکەم بکەم، بەهۆی دەستەواژەیەک کە چەند کاتژمێرێک پێش ئێستا بەکاری هێنابوو، بەڵام نەمتوانی درێژە بە پلانەکەم بدەم، چونکە شتێکی سەیرە ئەو دەستەواژەیەی کە باسم کرد لەبیرم چووبووەوە، ئینجا ناچار بووم داوا لە هاوسەرەکەم بکەم قسەکەی دووبارە بکاتەوە. بە ئاسانی دەردەکەوێت کە ئەم فەرامۆشییە یەکێکە لە گرفتەکانی ناوبژیوانی. ئەم گرفتانە کاتێک بەدیار دەکەون کە ئێمە بمانەوێت سەبارەت بە یەکێک لە خزمەکانمان ناوبژیوانی بکەین.

٢- خاتوونێک تازە هاتبوو بۆ شاری ڤیەننا، ویستم سندووقێکی بچووکی ئاسنی بۆ بکڕم تاکو بتوانێت پارە و بڕوانامەکانی خۆی تێدا دانێت. کاتێک ئامادە بووم بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە بە ڕوونی و لە بەرامبەر چاوەکانمدا، وێنەی جامخانەی دوکانێکم لە ناوەندی شار دەبینی. پێدەچوو ئەم جۆرە سندووقانەم لە هەمان دوکان بینیبێت، هەڵبەت نەمدەتوانی ناوی شەقامەکە بەبیر بهێنمەوە، بەڵام دڵنیا بووم لە پیاسەیەکی کورت بەناو شاردا دوکانەکە دەبینمەوە. بە باشی لە بیرم بوو کە چەند جارێک بە بەردەم ئەو دوکانەدا تێپەڕ بووم، بەڵام گەرچی لە هەموو لایەکەوە دەستم کرد بە گەڕان، بە تووڕەییەوە بۆم دەرکەوت کە ناتوانم ئەو جامخانەیە بدۆزمەوە. ئینجا بە خۆمم وت تەنیا ڕێگەچارە ئەوەیە کە چاوێک بە دەفتەری ناونیشانەکاندا بخشێنم، ناوی گشت بەرهەمهێنەکانی سندووق بنووسم و پاشان سەرلەنوێ گەڕانێک بەناو شاردا بکەم و ئەو جامخانەیە بدۆزمەوە، بەڵام بیانوویەکم بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە سەختە نەدۆزیەوە، چونکە لەنێو ناوەکاندا ناونیشانێکم بەرچاو کەوت، کە یەکسەر تێگەیشتم پەیوەندی بە دوکانەکەوە هەیە. لە ڕاستیدا زۆر جار بە بەردەم ئەو

جامخانەیەدا تێپەڕیبووم، بەتایبەت هەموو جار کە بۆ سەردانی خانەوادەکەم دەڕۆیشتم، چونکە ئەو خانەوادەیە چەند ساڵێک بوو لە ماڵێکدا دەژیان، کە دوکانەکەیش بەشێک لەو ماڵە بوو، بەڵام لەو کاتەوە کە برانی پەیوەندی بە تەواوی جێگەی دۆستایەتی و نزیکایەتی منی لەگەڵ ئەو خانەوادەیە گرتبۆوە، بەبێ ئەوەی کە سەرنج بدەمە هۆکارەکانی ئەم کارە، وا ڕاهاتبووم کە خۆم لە چوون بۆ ئەو گەڕەکە بپارێزم. کەوابوو لەگەڵ گەڕان بەناو شار بۆ دۆزینەوەی دوکانی سندووقفرۆشی، ئەوسەر و ئەمسەری شەقامەکانی دەوروبەر گەڕابووم و تەنیا نەدەچووم بۆ ئەو تاکە شەقامە. وەک بڵێی ئەو شوێنە ڕێگایەکی قەدەغەکراو بێت! لەو نموونەیەدا، بە ئاسانی دەردەکەوێت چ هەستێکی ناخۆش ڕێگەی منی لەو شەقامە لادابوو. بەڵام میکانیزمی فەرامۆشی وەک نموونەی پێشوو، هاسان نییە. دیارە کە من هیچ قینێکم لە بەرامبەر بەرهەمهێنی سندووقدا لە دڵدا نەبوو، بەڵکوو ئەم هەستە پەیوەندی بە کەسێکی ترەوە هەبوو، کە تەنانەت نەمدەویست ناویشی ببیسم. کەوابوو قین لە کەسێکەوە گوازراوەتەوە بۆ کەسێکی تر و هەڵەکەی قۆستبووەوە تاکو بە شێوەی فەرامۆشی خۆی نیشان بدات. بە هەمان شێوەیش لە نموونەی بورکهارددا، تووڕەبوونی من لە کەسێک ببووە هۆی گۆڕانی شێوەی ناوی کەسێکی تر. لەو نموونەیەدا یەکسانی ناوەکان توانیبووی لە نێوان دوو کۆمەڵە هزر کە لە ناوەڕۆکدا جیاواز بوون، پەیوەندییەک دروست بکات و لەم حاڵەتەدا پەیوەندی دەرئەنجامی نزیکایەتی گەڕەک و دراوسێیەتی دیواربەدیوار بوو (یەک دیواریان بەین بێت). هەروەها لە نموونەی سەرەوە پەیوەندییەکی پتەوتر لە ئارادا بوو، چونکە لەناو ئەو هۆکارانەی کە ببوونە هۆی پچڕانی پەیوەندیم لەگەڵ خانەوادەکەم، پارە دەورێکی بەرچاوی دەبینی.

٣- کۆمپانیای (ب. و. ر)، تکای لە من کرد بە مەبەستی

چاودێریکردنی یەکێک لە فەرمانبەرەکانی سەردانی بکەم. لە درێژەی ڕێگادا بیرم لەمە دەکردەوە کە پێشتریش چەند جارێک هاتوچۆی ئەو بینایەم کردبوو، کە کۆمپانیای (ب. و. ر)ی تێدا بوو و کەم یان زۆر بە بیرم دەهاتەوە، کە لە هەمان بینادا، لە قاتی ژێرەوەی ئاپارتمانی یەکێک لە نەخۆشەکانم، پلاکی کۆمپانیام بینیوە، بەڵام نەمتوانیوە ئەو ماڵە و ناوی نەخۆشەکە بە بیری خۆم بهێنمەوە. گەرچی ئەم بابەتە زۆر گرنگ و واتادار نەبوو، بەڵام فیکری منی بە خۆیەوە خەریک دەکرد. لە ئاکامدا بە پشتبەستن بە ڕێوشوێنێک کە من دەیگرمە بەر و بە کۆکردنەوەی تەواوی ئەو هـزرانەی کە لەو بارەیەوە بە مێشکمدا دەهات، توانیم بەبیر خـۆمی بهێنمەوە کە لە قاتی سەرەوەی شوێنی کۆمپانیای (ب.و.ر)، میوانخانەی "فیشر Fischer" هەیە و منیش زۆر جـار بە ناونیشـانی پزیشـکی چارەسـەرکردن چـوومەتە ئەو شـوێنە. پاشان ئەو بینایە، کۆمپانیای بازرگانی و میوانخانەی فیشرم بە باشی لە مێشکمدا وێنا کرد، بەڵام ئەوەی هێشتا بە نادیاری مابۆوە هۆکاری فەرامۆشـی بـوو. کۆمپانیـا، میوانخـانە یـان ئەو نەخۆشـانەی کە لەوێ دەرمانم کردبوون، هیچ کامێکیان بیرەوەرییەکی ناخۆشیان لە مێشکی مندا دروست نەکردبوو. سەرەڕای ئەوە هیچ مەسەلەیەکی ڕەنجهێنەر نەبـوو، چـونکە بە پـێچەوانەوە سـەرنەدەکەوتم، فەرامۆشـییەکەم بە پشتبەستن بە ڕێوشوێنی تایبەتی و بەبێ ئەوەی پێویست بە فاکتەری دەرەکی بکات، بەلاوە بنێم. لە ئاکامدا بە بیرم هـاتەوە کە پێش چەند دەقەیەک، کاتێـک کە دەچـووم بـۆ دیتنـی نەخۆشـە تـازەکەم، پیاوێـک لەسەر شەقام سڵاوی لە من کرد، بەڵام من ئەوم باش نەناسی. ئەو پیـاوەم چەنـد مانگێـک بەر لەوە لە ڕەوشـێکی خراپـدا بینـی بـوو و دەستنیشانم کردبوو کە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات شـەلەل دەبێت، بەڵام دواتـــر تێگەیشـــتم کە چـــاک بـــووەتەوە و ســـەلمێندرا، کە دەستنیشـانکردنەکەم هەڵە بـووە، بەڵام ئایـا باشـتربوونی دۆخـی ئەو

پیاوە نەبوو کە ئیمە زۆر جار دەمانبینی وەک کەمکردنەوەی هێمای شێتی ئیفلیجی؟ ئایا ئەم کارە لەسەر ڕاستبوونی لێکدانەوەی من نابێتە پاڵپشت؟ بە هەر شێوەیەک چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسەدا بووە هۆی ئەوەی کە ناوی کۆمپانیای دراوسێ ب.و.ر. لە بیر بکەم، هەروەها سەرنجمی بۆ لای ئەو ڕێگاچارە و مەسەلە نوێیە ڕاکێشام، واتە جەختی لەسەر ناوی لەبیرکراو کردبووەوە، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی پەیوەندییەکی سست، کە لە نێوان ئەو دوو دۆخەدا (ئەو کەسەی بە پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانمەوە باشتر ببووەوە لە کۆمپانیایەکی گەورەدا کاری دەکرد کە هەندێک جار چارەسەری نەخۆشەکانیم لە ئەستۆ دەگرت) دەبینرا، کەواتە پەیوەندی وەبیرهێنانەوە بەهۆی یەکسانی ناوەکانەوە پێک دێت: ئەو پزیشکەی منی بانگ کردبوو تا ئەو پیاوەی بە ڕواڵەت ئیفلیج بوو چارەسەر بکەم، ناوی دکتۆر فیشەرFischer بوو، کە ناوی تەلاریکیش بوو لە بینای کۆمپانیای ب.و.ر، هەروەها فیشەر (واتا هەمان ناوی لەبیرکراو).

٤- کاتێک لە دۆزینەوەی شتومەکێک ناتوان دەبووین لە ڕاستیدا لە بیرمان کردووە ئەوەمان لە کوێ داناوە. منیش وەک هەموو ئەو کەسانەی کە بە کتێب و دەستنووسەوە خەریکن بە باشی دەتوانم لەسەر مێزی نووسینەکەم ئاڕاستەیەک بدۆزمەوە و بەبێ هیچ کێشەیەک بە یەکەمین جووڵە کتێب یان کاغەزی مەبەستم بدۆزمەوە. ئەو شتەی بە ڕای کەسانی تر بێ دیسیپلینە بە لای منەوە بە تێپەڕبوونی کات بە شێوەی دیسیپلین خۆی دەرخستووە. کەواتە بۆچی نەتوانم ئەو کەتالۆگەی لەم دواییانەدا وەرمگرتبوو بیدۆزمەوە؟ من دەمویست یەکێک لە کتێبەکانی ئەو ڕاسپێرم و بیکڕم. ناوی کتێبە "سەبارەت بە ژنان" بوو و نووسەرەکەیشی لەو نووسەرانە بوو کە شێوەی نوێیە و ڕەفتاریانم بە دڵە و بە بیروبۆچوونیان لە بارەی

دەروونناسی و زانیارییەکانیان لە بارەی مێژووی شارستانیەتەوە سەرسامم و ڕێزیان لێ دەگرم. پێموایە یەکێک لە هۆکارەکانی بێتواناییم لە دۆزینەوەی کەتالۆگ ڕێک هەر ئەم خاڵە بوو. لە ڕاستیدا من پێمخۆش بوو کتێبەکانی ئەو نووسەرە بە قەرز بیدەمە هاوڕێیان و ناسراوەکانم و پاش چەند ڕۆژێک کەسێک لە کاتی هێنانەوەی کتێبەکەدا پێی وتبووم: "شێوازی ئەو وەک شێوازی تۆیە و شێوەی بیرکردنەوەکەیشی هەر وایە". ئەو هاوڕێیەی ئەو ڕستەیەی دەوت نەیدەزانی دەست لەسەر چ خاڵێکی گرنگ دادەنێت. چەند ساڵ لەوەوبەر کاتێک هێشتا گەنج بووم و پێویستم بە پشتیوان بوو لە کاتی قسەکردن لەگەڵ یەکێک لە هاوکارە بەساڵاچووەکانم وەسفی یەکێک لە پزیشک و نووسەرە زۆر بەناوبانگەکانم دەکرد و ئەو هاوکارەیشم ڕێک هەر ئەو وەڵامەی دابوومەوە: "شێواز و شێوەی ئەو ڕێک وەک شێوە و شێوازی تۆیە." بەو تێبینییە هاندرام، نامەیەکم بۆ پزیشکەکە نووسی و خۆشەویستی خۆمم بۆ دەربڕی کە لەگەڵیدا پەیوەندی نامەمان هەبێت، بەڵام ئەو وەڵامەی وەرمگرتەوە زۆر دڵساردکەرەوە بوو. لەوانەیشە لە پشت ئەم بیرەوەرییەدا بیرەوەرییەکی نائومێدکەرتر هەبێت. بەهەرحاڵ، نەمتوانی کەتالۆگەکە بدۆزمەوە و ئەو ناتوانییەیش بووە هۆی دەرکەوتنی کارەساتێکی بەد و شووم بۆ من، چونکە بڕیارم دا کتێبەکە ڕانەسپێرم، چونکە نادیارنەمانی کەتەلۆگەکە بەبەرستێکی گەورە نەبوو و نەدەبوا ببێتە هۆی بەربەستی ڕاسپاردنی کتێبەکە بە تایبەتی کە ناوی کتێبەکە و ناوی نووسەرەکەیش لە زەینمدا مابوو.

٥- نموونەیەکی تر لەم جۆرە، شیاوی سەرنجڕاکێشانێکی زۆرە، چونکە ئەو شتەی ون ببوو لە بارودۆخێکی تایبەتدا دۆزرایەوە.

پیاوێکی تارادەیەک گەنج بۆی گێڕامەوە: "چەند ساڵ لەوەوپێش لە

ژیانی هاسەرگیریمدا چەند لێتێنەگەیشتنێک رووی دا. هەستم دەکرد هاوسەرەکەم بەرامبەر بە من رەفتارێکی ساردی هەیە و ئێمە بەبێ حەز و خۆشەویستی پێکەوە دەژین، هەڵبەت ئەو مەسەلەیە نەدەبووە هۆی ئەوەی تایبەتمەندییە باشەکانی لەبەرچاو نەگرم. ئەو ڕۆژێکیان لە کاتی گەڕانەوەدا لە گەشتەکەی، کتێبێکی بۆ هێنامەوە کە پێی وابوو بەلامەوە شتێکی باش دەبێت. بە میهرەبانییەوە سوپاسیم کرد و کتێبەکەم بەلاوە نا و بەڵێنم دا بیخوێنمەوە. چەند مانگ تێپەڕ بوو. پاش شەش مانگ کە زۆر دایکم خۆش دەویست نەخۆش کەوت و هاوسەرەکەیشم خێرا ماڵەکەی بەجێ هێشت تا پەرەستیاری لێ بکات. دۆخی نەخۆشەکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خراپتر دەبوو و ئەو کاتەیش دەرفەتێکی زۆر باش بوو تا هاوسەرەکەم بەرجەستەترین تایبەتمەندییەکانی خۆی دەربخات. ڕۆژێکیان لە حاڵێکدا کە بە ڕەزامەندی و خۆشەویستییەوە بیرم لە هاوسەرەکەم دەکردەوە لە دڵی خۆمدا بە هۆکاری فیداکارییەوە زۆری سوپاسیم کرد، گەڕامەوە بۆ ماڵەوە وەک کەسێک خەو لێک دەداتەوە بەو کارەی دەمکرد لێی دڵنیا بووم، ئینجا یەکەمین شتێک بەرچاوم کەوت هەمان کتێبی ونکراو بوو، کە ماوەیەک بوو نەدەدۆزرایەوە. کاک ئەشتەر کە نموونەیەکی تری گێڕاوەتەوە کە زۆر هاوشێوەی ئەم دوایین نموونەیەیە بە تایبەتی لەو بوارەوە کە کاتێک ئاراستەی لەبیرچوونەوە لەبەین چووە کەسەکە شتومەکێکی پێویستی بەو دڵنیاییەوە دۆزیوەتەوە.

"کچێکی گەنج کاتێک دەیویست پارچە پەردەیەک ببڕێت تا یەخەیەک بدۆزێتەوە پەردەکەی تێک دا. ناچار بوو لە بەرگدوورێکی ماڵەکیدا داوای یارمەتی بکات تا زیانەکە قەرەبوو بکرێتەوە. ژنە گەنجەکە هاتە ماڵەوە، کچەکە ئەو چەکمەجەی پەردەکەی لێبوو کردیەوە، بەلام نەیتوانی پەردەکە بدۆزێتەوە. هەموو شوێنێک بە دوایدا گەڕا، هەموو

کونـوکەلەبەرێکی تێـک دا بە دوایـدا، بەڵام بێســوود بـوو. پاشــان بەرامبەر بە خـۆی تـوورە بـوو و لە خـۆی پرسی؛ چۆن لەناکاو ئەو پەردەیە ون بووە، ئەگەر ئەو ناتوانێت بیدۆزێتەوە ئایا هـۆکەی ئەوە نییە کە نایەوێـت بیـدۆزێتەوە؟ لـە ڕاسـتیدا کاتێـک ئـارامیی خـۆی بەدەست هێنایەوە لە ئاکامدا تێگەیشت شەرمی کردووە پیشانی ژنە بەرگدرووەکەی بـدات کە لە ئەنجامی کـارێکی ئاسـانەوە واتە بڕینی یەخەیەک نـاتوان بـووە. کاتێـک شـرۆڤەی لەبیرچـوونەوەی خـۆیی دۆزییەوە هەسـتا و نزیـک کومیدییەکـە بـووەوە و بەبێ بچـووکترین شک و گومانێک یەخە تێکچووەکەی دۆزییەوە".

٦- نموونەی لای خوارەوە بەندە بە مەسەلەیەکەوە، کە ئەمڕۆکە هەموو دەروونشیکارەکان دەیناسن. پێش ڕاڤەکردنی ئەو بوارە دەبێ بڵـێم ئەو کەسـەی ڕووداوەکەی بـۆ ڕوویـداوە خـۆی شـرۆڤەکەی دۆزیوەتەوە.

"یەکێک لە نەخۆشەکان ناچار بوو کاتەکانی چارەسەری دەرمانیی لە کاتێکی هەستیاری قۆنـاخی خـۆڕاگری و دۆخێکی خراپی دەروونیدا دابـبڕێـت. ئەو شــەوێکیان پــاش ئەوەی جلەکــانی لەبەر دەرهێنــا وایـدەزانی دەسـکە کلیلەکانی لە شـوێنی جاراندا داناوە. پاشـان خێرا بیـری هــاتەوە سـبەی بەیــانییەکەی دەبــێ پــاش دوایـین کــاتی دەروونشـیکاری بـڕوات بـۆ گەشـتەکەی. لەو ڕووەوە ویسـتی هەندێ کاغەز و بڕێکی پێویست پارە بۆ حەقی زەحمەتی پزیشکەکە دابین بکات. بەڵام کاغەز و پارەکان لە چەکمەجەی مێزی خوێندنەکەدا بوو و دەبوایە بە کلیل ئەو چەکمەجەیەی بکردبایەوە. هەرچەند تێگەیشت کلیلەکانی... ون ببوون. دەستی کرد بە دۆزینەوە. هەر چرکە بە دوای چرکەدا توورەتر دەبوو، دەوراندەوری شوقە و هەموو سووچێک و کەنــارێکی بە وردی گەڕا، بەڵام ئەنجــامێکی وەرنەگــرت. کاتێــک

تێکەیشت نەبوونی تواناییەک بۆ دۆزینەوەی کلیلەکان کاریکی هێمادار و بەئەنقەستە خزمەتکارەکەی لە خەو هەستان بەو هیوایەی کە کەسێکی بێلایەن کە سوودێکی لە ڕووداوەکە نەدەبینی سەرکەوتنێکی زیاتری بەدەست هێنا. دیسانەوە پاش یەک کاتژمێر گەڕان هەموو هیواکانی لەناو چوو و لە ئاکامدا بیری کردەوە کلیلەکانی ون بوون، کە سبەی بەیانییەکەی کلیلی تازەتری ڕاسپارد بۆی دروست بکەن، کە خێرا دروست کران. دوو هاوڕێی کە شەوی ڕابردوو بە ئوتومبێل ئەویان گەیاندبووە ماڵەکەی پێیان وابوو بە بیریان دێتەوە لە کاتی دابەزین لە ئوتومبێلەکە دەنگی کەوتنی شتێکیان بیستووە. لەو ڕووەوە نەخۆشەکە ڕازی بوو کە کلیلەکان لە گیرفانی کەوتوون، بەڵام هەر ئەو شەوە خزمەتکارەکەی بە خۆشحاڵییەوە کلیلەکانی پێ دا. ئەو کلیلەکانی لە نێوان دەفتەرێکی ئەستوور و دەوفتەرێکی بچووکدا کە ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەی یەکێک لە خوێندکارەکانی منی تیا بوو و نەخۆش دەیویست لە کاتی پەشۆکانیدا لەگەڵ خۆی بیبات و بیخوێنێتەوە دۆزییەوە. کلیلەکان ئەوەندە بە باشی شاردرابوونەوە کە کەسێک نەیدەتوانی بیری بۆ ئەو شوێنە بڕوات، هەروەها تەنانەت خودی ئەویش نەیتوانی کلیلەکان وەک جاری یەکەم بخاتەوە بەینی دەفتەرە بچووکەکە و کتێبە ئەستوورەکە تا بە تەواوی لە بەرچاو نەمێنن. هونەری شاردنەوەی دەست بە شێوەی نەست کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مەبەستی ئاراستەی نەست، بەڵام زۆر بە زیرەکی کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئێمە شتومەکێک ون بکەین و ئەوەیش هاوشێوەی "دڵنیابوونی لێکدەری خەونەکانە". لە نموونەی ئێستادا مەسەلەکە ئەوە بوو کە نەخۆشەکە لە ڕاوەستان بۆ چارەسەری و پێویست بۆ پارەدانی بۆ حەقی زەحمەتی پزیشک سەرباری دۆخی نالەباری تەندروستیی نیگەران و شڵەژاو بوو.

٧- کاک ئی. ئی. بریل دەیگێڕایەوە، کە پیاوێک بەهۆی دۆخی

باشی هاوسەرەکەیەوە ئامادە بوو بڕوات بۆ میوانییەکی دەوڵەمەنانە، بەڵام لە ناخی دڵیەوە هیچ حەز و ئارەزوویەکی بۆ ئەو میوانییە نەبوو. سەرەتا جلە فەرمییەکانی لە کۆمێدییەکەی هێنایە دەرەوە، بەڵام دوایی لەبەری نەکرد و بڕیاری دا سەرەتا ڕیشی بتاشێت. پاش ڕیشتاشینەکەی گەڕایەوە بۆ لای کۆمێدییەکەی سەیری کرد دەرگای کۆمێدییەکە داخراوە و بە دوای کلیلەکاندا گەڕا، بەڵام هەموو هەوڵدانەکانی بێسوود بوو، بە تایبەت ئەو ڕۆژە یەکشەممەیش بوو و کلیلساز لە بەر دەستدا نەبوو، ژن و پیاوەکە بە ناچاری لە ماڵەوە مانەوە و نامەیەکیان بە هێمای داوای لێبووردن بۆ ئەوێی نارد. سبەی بەیانییەکەی کە کلیلسازەکە کلیلەکەی کردەوە هەموویان بینییان کە کلیلەکان لە ناوەوەی کۆمێدییەکەدا بەجێ ماوە. ئەو پیاوە بەهۆی نەبوونی تەرکیزەوە کلیلەکانی لەناو کۆمێدییەکەدا داناوە و دەرگاکەی داخستبوو (قفڵی کومێدییەکە ئوتۆماتیک بوو). ئەو پێی وتم ئەو کارەی بەبێ هیچ سەرنج و بەبێ هیچ مەبەستێک ئەنجام داوە، بەڵام ئێمە دەزانین ئەو هیچ حەزی لەو میوانییە نەبوو، بۆیە هۆکارێکی زۆر باشی بۆ ونکردنی کلیلەکان هەبوو.

کاک ئێ. جۆنس وتوویەتی چەندین جار پاش ئەوەی ڕادەیەکی زۆر پایپی دەکێشا، بە ڕادەیەک کە هێڵنجی دەدا لە دۆزینەوەی پایپەکەی بێزار دەبوو. لەو کاتانەدا پایپەکە ڕێک لەو شوێنەدا دانرابوو، کە نەدەبوایە بدۆزرابایەتەوە و کاک جۆنس عادەتی نەبوو پایپەکەی لەوێ دابنێت.

٨- خاتوو "دۆرا مۆلەر" بوارێکی بێ زیانی پێ وتین ئاڕاستەکەی کەسێک دۆزیویەتیەوە کە تووشی لەبیرچوونەوە بووە.

دوو ڕۆژ پێش جەژنی نوئەیل خاتوو ئێرنا دەیگێڕایەوە:

دوێنێ شەو زەرفی ئەو نانەی بەهاراتی پێوە کرابوو کردمەوە و



CS CamScanner

دەستم کرد بە خواردنی نانێکیان. لە کاتی خواردنـدا ئەوەم بیر کەوتەوە خاتوو ف. (ئەو ژنەی خەریکی پەرەستاریکردنی دایکم بوو) پاش چەند چرکەیەک هات بۆ لام تا شەوباش بڵێت و منیش ناچار دەبم یەکێک لە نانەکانی پێ بدەم. حزم لەو بیرکردنەوەیە نەکرد، بەلام بریارم دا ئەو کارە بکەم. کاتێک خاتوو ف. هاتە ناوەوە دەستم نایە سەر ئەو مێزەی کە وا بیرم دەکردەوە نانە بەهاراتپێوەکراوەکەم لەسەر داناوە، دەستم بردە پێشەوە، بەلام کاتێک سەیرم کرد پاکەتە نانەکە لەوێ نەبوو. بە دوایدا گەڕام و لە ئاکامدا پاکەتە نانەکەم لە کۆمێدییەکی داخراودا دۆزییەوە. من بەبێ ئەوەی ئاگادار بم پاکەتە نانەکەم لەوێ دانابوو. چونکە خاتوو ئێرنا بە تەنهایی شرۆڤەی لەبیرچوونەوەکەی دۆزیبووەوە، کەواتە شیکردنەوەی ئەو نموونەیە ئەوەندە گرنگ نییە. ئاڕاستەی سەرکوتکراوی خاتوو ئێرنا بۆ ئەوەی نانە بەهاراتپێوەکراوەکە بۆ خۆی هەڵبگرێت تارادەیەک بە شێوەی کاریکی ئۆتوماتیک (خۆنەویست) دەرکەوتووە، بەلام بە دوای رەفتاری وریایانەیەکی تر دیسانەوە سەرکوتکراوە.

٩- کاک ساکس دەیگێرایەوە رۆژێکیان بە چ شێوەیەک بە یارمەتی کارێک لەم جۆرە لە کارێکی بە ناچار نافەرمانی کردووە.

یەکشەممەی رابردوو نزیکەی دوای نیوەڕۆ لە خۆمم پرسی ئایا دەڕۆم بۆ دەوام، یان بۆ گەشت لە ماڵەوە دەچمە دەرەوە و پاشان دەڕۆم بۆ ئەو شوێنەی وادەی چاوپێکەوتنم هەیە. پاش نەختێ شک و گومان بریارم دا دەست بە کار بکەم. پاش یەک کاتژمێر تێگەیشتم، کە پاشەکەوتی کاغەزم تەواو بووە. باش دەمزانی دەبێ لە یەکێک لە چەکمەجەکانـدا هەندێ کاغەز کە ماوەیەک لەوەو پێش کڕیبووم هەبووبێت. لە چەکمەجەی مێزی نووستنەکەمدا بە دوای کاغەز گەڕام و کون و کەلەبەر و سووچی خانووەکە هەمووی گەڕام: بەینی کتێب

و دەفتەر و نامەکان و... هتد. بەلام هیچ سوودیکی نەبوو. لە ئاکامدا ناچار بووم دەست لە کارەکە بەردەم، چونکە چارەیەکی ترم نەبوو لە ماڵ چوومە دەرەوە. ئەو شەوە کاتێک گەڕامەوە بۆ ماڵەوە لەسەر قەنەفەکە دانیشتم و لە حالێکدا زەق زەق سەیری کتێبخانەی بەرامبەرم دەکرد لە ژوورەکەدا، نوقمی بیرکردنەو بووبووم. لەناکاو بۆکسێکم بە بیر هاتەوە و بە بیرم هاتەوە، کە ناوەڕۆکەکەیم ماوەیەکە نەبینیوە. چوومە نزیکی و دەرگای بۆکسەکەم کردەوە. ڕێک لەسەر بۆکسەکە جانتایەکی چەرم دانرابوو و لەناویشیدا هەندێ کاغەزی سپی هەبوو. بەلام تەنها کاتێک کاغەزەکانم لەوێ هەڵگرت و لە چەکمەجەی مێزی نووسینەکەمدا دامنا بە بیرم هاتەوە ئەم کاغەزانە ڕێک هەمان کاغەزێک بوون، کە ئەو دوای نیوەڕۆیە بەدوایدا گەڕابووم. با ئەوەیش باس بکەم، من زۆر بە وریاییەوە ئیش دەکەم و لەخۆڕا کاغەز لەکیس نادەم و کەڵک لە بچووکترین پاشماوەیشی وەردەگرم. بێگومان هەر ئەم خووەش بووەتە هۆی ئەوەی کاتێک ئاراستەی لەبیرچوونەوەی کاغەزەکان لەبەین چوو، توانیم لەبیرچوونەوەکەم قەرەبوو بکەمەوە.

ئەگەر ئەو نموونانەی لە بارەی نەبوونی بەدەستهێنانی شتومەکی ڕێکوپێک ڕیزکراوەوەیە، بە وردی لێی بکۆڵینەوە ناچارین قبووڵی بکەین ئەم ناتوانییە تەنها سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مەبەستی نەست.

١٠- لە ساڵی ١٩٠١ـی زاینیدا لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێکانمدا سەبارەت بە مەسەلەیەکی زانستی هەندێ گفتوگۆی توند و بەگڕ و تینمان هەبوو. ڕۆژێکیان پێم وت: "تەنها کاتێک دەتوانین کێشە ئازارییەکانی دەروونی چارەسەر بکەین، کە بێ ئەملاوئەولا بیرۆکەی دوو جۆربوونی ڕەگەزی سەرەتایی تاک پەسەند بکەین." وەڵامی

دایەوە: "دوو ساڵ لەوەوبەر من لە شاری "بر"دا لە کاتی گەشتێکی شەوانەدا هەر جەختم لەسەر ئەم خاڵە کردەوە، بەڵام تۆ ئەودەم نەتدەویست بە هیچ شێوەیەک ئەو بیرۆکەیە پەسەند بکەیت".

مرۆڤ دژوار دەتوانێت ئەو شتەی بە دەستکەوتی تەواوی خۆی دادەنێت بە هی کەسێکی تری دابنێت. من توانیم وتووێژی دوو ساڵ لەوەوبەر و هەروەها بۆچوونی هاوڕێکەم لەو سەردەمەدا بە بیر بهێنمەوە. بە دڵنیاییەوە یەکێک لە ئێمە بە هەڵەدا دەچوو و بە پێی بنەمای Cui prodest ئەو کەسە من بووم. لە ڕاستیدا هەفتەی داهاتوو ڕێک بە بیرم هاتەوە کە قسەکانی دایکم ڕاست بووە و تەنانەت وەڵامی خۆمم بە بیر هاتەوە، من وەڵامێکم دابووەوە: "هێشتا بەو مەسەلەیە نەگەیشتووم و نامەوێ لە بارەیەوە هیچ باس بکەم". لەو ڕۆژەوە تا ئێستا کاتێک دەبینم لە چاوپێکەوتنی پزیشکی یەکێک لە بیرکردنەوەکان یان تیۆرییەکان، کە دەکرێ بە منەوە پاڵ بدرێت بە بێ ناوبردنی لە لایەن نووسەری بابەتەکەوە بەیان کراوە کەمتر نیگەران دەبم.

لۆمەکردنی هاوسەر، هاوڕێیەتییەک، کە ئێستا بووەتە ڕقهەڵگرتن، بەهەڵەداچوون لە دەستنیشانکردندا، لابردنی ڕکەبەرەکان، تیۆرییەکان، بدەیتەپاڵ خود و بیروڕای کەسانی تر: بە ڕێکەوت نییە، کە لە نێوان ئەو نموونانەی بەبێ هیچ مەبەستێکی تایبەت کۆمان کردووەتەوە ناچارین بۆ دۆزینەوەی ڕاڤە، بیاندەینە پاڵ ئامانجەکان و بابەتە ناخۆشەکان. بە ڕای من هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێت مەبەستی یەکێک لە بوارەکانی لەبیرچوونەوەیان بدۆزنەوە لە ئاکامدا بە ناچار دەگەنە هەندێ شرۆڤە، واتە ئەو شرۆڤانەی بە هەمان ڕادە ئازاراوین. بە ڕای من ئاراستە بۆ لەبیرچوونەوە ئەو شتەی ناخۆش و ئازاراوییە ئاراستەیەکی گشتگیرە هەرچەند وزەی لەبیرچوونەوە لە خەڵکدا

جیاواز دێته بەرچاو. زۆربەی وەڵامە نێگەتیڤەکان، کە لە پیشەی پزیشکیدا ڕووبەڕوویان دەبینەوە، ڕەنگە تەنها دەرەنجامی لەبیرچوونەوەیەکی سادە بێت.

لێکدانەوەمان بۆ ئەو جۆرە لەبیرچوونەوانە، یارمەتیمان دەدات جیاوازییەکان لە نێوان ئەو ڕوانگەیە ببینین و تەنها پاڵی بدەینە هەلومەرجی دەروونی و هەردوو پەرچدانەوەکە، بە بەیانی مەبەستێکی یەکە دابنێین. لە نێوان نموونەکانی لای خوارەوە بۆ سڕینەوەی بیرەوەرییە ناخۆشەکان، کە من توانیومە لە نێوان خزم و ناسراوەکانی نەخۆشدا ببینم بە تایبەتی نموونەیەکم بە بیر دێتەوە. دایکێک دەیویست لە بارەی دەورانی منداڵیی کوڕە گەنجەکەیەوە کە تووشی نەخۆشی عەسەبی ببوو قسە بکات و زانیاریمان بداتێ. ئەو وتی کە ئەو کوڕ و کچ و براکانی تری تا تەمەنی نەوجەوانی تووشی شەومیزی بوون. ئەو مەسەلەیە وەک پێشینەیەک لە خێزانێکدا، کە ئەندامەکانی لە نەخۆشی عەسەبی ئازار دەچێژن بێبایەخ نییە. پاش چەند هەفتەیەک هەر ئەم خاتوونە بۆ ڕاوێژکردن لە بارەی شێوەی چارەسەرکردنی کوڕەکەیەوە هات بۆ لام، هەلومەرجەکەم قۆستەوە و سەرنجیم ڕاکێشا بۆ لای ئەو هێمایانەی، کە ڕێخۆشکەر بوو بۆ نەخۆشی عەسەبی لە کوڕەکەیدا و لەو بوارەشدا ئاماژەم بە شەومیزی کرد، واتە ئەو خاڵەی کە خودی دایکەکە پێی وتم، بەڵام بە سەرسوڕمانەوە دیم دایکەکە ئەو مەسەلەیە نەک هەر بۆ کوڕە نەخۆشەکەی، بەڵکوو بۆ هەموو منداڵەکانی تری حاشای لێ کرد، پرسیاری لێ کردم چۆن ئاگام لەو بابەتانەیە و منیش ناچار بووم بڵێم خودی ئەو مەسەلەکەی بۆ باس کردووم: دایکەکە بە تەواوی ئەو مەسەلەیەی لەبیر کردبوو. تەنانەت لە کەسە تەندروستەکانیشدا کە هیچ هێنایەک لە دەروون ئازاریان تێدا نییە جۆرێک خۆڕاگری لە بەرامبەر بیرەوەرییە ناخۆشەکان و لێکدانەوەی ئازاراوی دەبینرێت،

بەڵام ئەم مەسەلەیە بە واتای تەواو تەنها لە کاتی تاقیکردنەوەی دەروونی کەسی دەروون ئازاردا ئاشکرا دەبێت. بۆیە ناچارین لەو غەریزە سەرەتاییە بەرگری لە بەرامبەر ئازار و هەڵاتندا لەو بوارەوە شیاوی پێوانەیە کە یەکێک لە بنەما میکانیزمییەکان بناسین کە هێماکانی هیستریای لەسەر سەقامگیرن. لە بەرامبەر تیۆرییەکانماندا لەسەر بنەمای بوونی ئەو غەریزە بەرگرییە نابێ نارەزایەتی بکرێت و بڵێین مرۆڤ زۆر جار ناتوانێ بیرەوەرییە ناخۆشەکانی بە تەواوی لە زەین دوور بخاتەوە، وەک پەشیمانی و پاشگەزبوونەوە و تۆبەکردنەکان، چونکە ئێمە ناڵێین ئەو غەریزە بەرگرییە دەتوانێت لە هەموو بوار و کاتەکاندا زاڵ بێت و لە کێشمەکێشی هێزە دەروونییەکان لەگەڵ هۆکاری بەهێزدا ڕووبەڕوو نابێتەوە، ئەو هۆکارانەی لە پەیوەندیدان لەگەڵ ئامانجەکانی تردا هەوڵ دەدەن تا پێچەوانەی ئەو غەریزەیە بگەیەننە ئەنجام و ئەو کارە لە ئاڕاستەی پێچەوانەی غەریزەی بەرگرییەوە بە ئەنجام دەگەیەنن. دەبێ بڕوا بکرێت کە بنەمای سستمی پێکهاتەی دەروونی بە شێوەیەکە کە چەندین غەریزەی جیاواز لە توێژی جۆراوجۆردا لەسەر یەک دانراوە و کەڵەکە بووە و بە تەواوی ئەگەری هەیە کە غەریزەی بەرگری بەند بێت بەم نموونەیەی لای خوارەوە و نموونە بەرزەکانی چالاکییەکان سنووردار بکاتەوە. سەرەڕای هەموو ئەوانە و ئەو هێزی غەرزییەی بەرگری دەسەلمێنێت ئەو دەرەنجامانە کە وەک ئەو دەرەئەنجامانەی لە نموونەکانی پێشوودا وەسفمان کرد دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو غەریزەیە. ئێمە بە باشی تێدەگەین هەندێ مەسەلە بە تەواوی لەبیر دەچنەوە، بەڵام لەو بوارانەدا ئەگەری نییە، غەریزەی بەرگری ئامانجی خۆی دەگرێت و بابەتێکی تر، بابەتێکی وردتر کە دەخاتە بەردەمی لەبیرچوونەوە کە بە هۆکارێک لەگەڵ بابەتی سەرەکیدا جۆرێک وەبیرهێنانەوەی هەیە.



CamScanner

بیرەوەرییەکـان لە بەرامـبەر لەبیرچـوونەوە مەبەسـتدارەکاندا توانـای خۆڕاگرییان نییە و وەها لێکدانەوەیەک بۆ لەبیرچوونەوە، دەبێ لە زۆر بـواری تـردا سـەرنجی بخـرێتە سـەر. بەداخەوە زۆر جـار ئەو مەسەلەیە یان حاشای لێ دەکرێت یان بەو جۆرەی دەبێ گرنگی پێ بدرێت، ناخرێتە ڕوو. بۆ نموونە بە بۆچوونی من لە کاتی شایەتیدانی خەڵک لە دادگادا بۆ ئەم لێکدانەوەیە بایەخ دانانێن، چونکە شایەتییەکە لەژێر سوێنددا ئەنجام دەدرێت، پێیان وایە کە سوێندخواردن لەسـەر شـەڕە دەروونییەکـان کـاریگەریی لەڕادەبەدەری گۆشـەگیری هەیە. هەمـوو کەسـێک ئاگـادارە لە بـارەی تەمەن و مێـژووی ئەفسـانەیی نەتەوەیەک، ئەگەر بمانەوێـت لەو تەمەن و مێـژووە تێـبگەین دەبـێ مەبەستێکی هاوشێوە بهێنینە ئاراوە، واتە ئارەزووی ئەو نەتەوەیە بۆ لەبیرکردنـی هەمـوو مەسـەلەکان کە زەربە لە هەسـتە نەتەوەییەکـان دەدات یان ئەو هەستانە بریندار دەکات. ڕەنگە ڕۆژێک توێژینەوەیەکی قـووڵتر ئیجازەمـان پـێ بـدات پێـوانەیەکی تەواو لە نێـوان شـێوەی پێکهـاتنی دابـونەریتی گشـتگیری نەتەوەیەک و شـێوەی پێکهـاتنی بیـرەوەری منـداڵیی کەسـێک دابـین بکەیـن. دارویـن بە باشـی تێگەیشتبوو، کە لەبیرچوونەوە زۆر جار کردارێکە لە بەرامبەر هەستە نـاخۆش و ئازاراویەکانـدا، کە بەنـدە بە هەنـدێ بیـرەوەری و ئەو ڕوانگـەیەی وەک "بنەمـایەکی ئـاڵتوونی" بـۆ سـەلماندنی تیـۆرییە زانسـتییەکان دادەنێـت. بەو شـێوەیە بـۆ لەبیرچـوونەوەی نـاوە تایبەتییەکان بینیمـان لەبیرچـوونەوەی لێکدانەوەکان دەتوانێت لەگەڵ بیـرەوەرییە ڕواڵەتییەکانـدا بـێ و کاتێـک کەسـێک ئەوانە وەک لێکدانەوەیەک لە ڕاستییەکان لە بەرچـاو دەگرێـت دەکـرێ ئەوانە بە "خەیاڵی زەیـن" نـاوی لـێ بنرێت. ئەو خەیاڵە زەینیانە کە جۆریەتی زیانناسیان هەیە و -لە پارانۆیادا ڕێک ڕۆڵی ڕەگەزی پێکهێنانی شێتی دەگێڕێت- بوونەتە هۆی ئەدەبیاتێک، کە تیایدا هیچ ئاماژەیەک بۆ

مەبەستی خەیاڵەکان نابینم. هەڵبەت مەسەلەی سەر زارمان ئەو بوارە نییە، چونکە ئەو مەسەلەیە لە بارەی دەروونناسی دەروون ئازارەکانەوەیە، بەلام نموونەیەکی سەیر و شەخسی لە خەیاڵی زەین باس دەکەم. ئیمە لەو نموونەیەدا مەبەستی خەیال بەهۆی ڕەگەزی نەستی سەرکوتکراو و هەروەها شێوەیەک بە ئاشکرا دەبینین کە خەیال بەو ڕەگەزانەوە پەیوەست دەکات.

کاتێک دوایین بەشی کتێبی "لێکدانەوەی خەونەکان"م دەنووسی لە هاوینەهەواردا بووم و کتێبخانە یان کتێبێکی سەرچاوەم لە بەردەستدا نەبوو. لەو ڕووەوە ناچار بووم بە مەرجێک دوایی پیاچوونەوەیان بکەم زۆربەی قسە و سەرچاوە و ئەو خەوانەی بۆیان گێراومەنەتەوە بهێنمە دەرەوە. لە حاڵێکدا خەریکی بەشێک بە ناوی "خەوی کاتی وریایی" بووم، ڕووخساری زۆر سەیری ژمێریاری داماو، یەکێک لە کەسایەتییەکانی نەبا بە بیر خۆم بهێنمەوە کە ئەلفۆنس دوودە، تایبەتمەندییە هاوشێوەکانی خۆی لەوەدا دەبینێت و دەیداتە پاڵ ئەو. من پێم وا بوو یەکێک لە خەیاڵکردنەکانی ئەو ژمێریارەم بە باشی لەبیرە. (ناوی ئەو کەسە، لە بیرەوەرییەکانمدا، ژۆسلێن) بوو. ئەو لە کاتی گەشت لە شەقامەکانی پاریسدا خەیاڵی زۆری دەکرد و منیش لەبەر دەستم کرد بە نووسینی خەیاڵکردنەوەکانی. هەرچەند کاک ژۆسلێن لە دنیای خەیاڵیدا دەبینێت لەسەر ئەسپێکی سلکردوودایە و ڕایدەگرێت، دەرگای گالیسکەکە دەکرێتەوە و پیاوێکی خاوەن کەسایەتی و کارتێکەر لە گالیسکەکە دادەبەزێت و لەگەڵیدا تەوقە دەکات و دەڵێت: "تۆ گیانی منت ڕزگار کرد، ژیانم بە قەرزداری تۆ دەزانم، چ کارێکم لەدەست دێت بۆتی بکەم؟" من لەبەر خۆمەوە بیرم لێ کردەوە، بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە و کتێبەکە بە دەستەوە بگرم، بە ئاسانی دەتوانم ئەو هەڵە کەمانەی ڕەنگە تووشیان بووم پێیاندا بچمەوە. کاتێک لە پشووەکان گەڕامەوە

دەستم کرد بە لاپەڕەدانی کتێبی "نەباب" تا بابەتی دەستنووسەکە لەگەڵ کتێبەکەدا پێوانە بکەم، بەڵام بەوپەڕی سەرسوورمان و شەرمەزارییەوە هیچ بابەتێکم نەدۆزییەوە کە هاوشێوەی خەونێک بێت کە بەندم کردبوو بە کاک ژۆسلین و -تەنانەت تێگەیشتم ناوی ئەو ژمێریارە داماوە کاک ژوایۆیە نەک ژۆسلین-. ئەم هەڵەی دووەمە خێرا ڕێگایەکی بۆ شرۆڤەکردنی یەکەم هەڵە لە بەردەستم دانا، واتە خەونی زەین. ژوایۆ (کە ڕیشەی مێینەکەی ژوایۆز)ـە، وەرگێڕاوەی فەرەنسی ناوەکەی منە "فرۆید"، بەڵام ئەو خەونەی بە هەڵە دابوومە پاڵ "دوودە"وە لە کوێوە سەرچاوەی دەگرت؟ ئەو وێناکردنە تەنها دەیتوانی وێناکردنی کەسی دووەم بێت. (وێنایەک کە لە کاتی وریاییدا دروستم کردبوو)، بەڵام نەچووبووە ویژدانی نەستمەوە، یان ئەگەر چووبووە ئەویَ ماوەیەک لەوەو پێش بە تەواوی لەبیر کرابوو. ڕەنگە ئەو کاتانەی بە تەنها و خەفەتبار لە شاری پاریسدا گەشتم دەکرد و پێش ئەوەی مامۆستا شارکۆ من لە شوێنەکانی خۆیدا قبوڵ بکات، پێویستم بە پشتیوان و پاڵپشت هەبوو، ئەو وێنایەم هێنابووە مێشک. چەندین جار نووسەری کتێبی "نەباب"م لە ماڵی دکتۆر شارکۆدا بینیبوو، بەڵام ئەو شتەی دەبووە هۆی نیگەرانیم تەنها ئەوە بوو کە لە دۆخی شەخسی کە ئەو دەگرنە ژێر پەڕ و باڵی خۆیان، زیاتر لە هەموو شتێک ڕقم لێی هەڵدەستێت. ئەو شتەی لە بارەی پاڵپشتیکردن لە هاوڕەگەزەکانەوە لە وڵاتماندا دەبینرێت، بەسە تا ئارەزووی پێویست بە پاڵپشتێک لەناو بەرێت. هەروەها ڕەفتارم لەگەڵ ئەرکی ئەو کەسانەی پاڵپشتییان لیَ دەکەن بە هیچ شێوەیەک سازگار نییە. هەروەها هەوڵم داوە مرۆڤێکی ئازاد و سەربەخۆ بم، کە قەرزداری کەس نییە و بەو لێکدانەوەیە وێنایەکی وەهام بە مێشک هاتبوو. (جیا لەوەیش وێناکەم هەرگیز دۆخی ڕاستەقینەی لەخۆ نەگرت). ئەو نموونەیە لە جۆریەتی پەیوەندییەکانمان لەگەڵ کەسی خۆماندا



CamScanner

نموونەیەکی سەیرە، ئەو پەیوەندییانەی لە کاتی ئاساییدا سەرکوت دەبن، بەڵام لە نەخۆشی پارانۆیادا سەرکەوتوانە خۆی دەردەخات، بە گشتی دەماندەپەشۆکێنێت و بیرکردنەوەی بەرچاومان لە بارەی زۆربەی مەسەلەکانەوە تێک دەدات.

یەکێکی تر لە بوارەکانی خەونی زەین کە دەکری شرۆڤەیەکی بەرچاوی بۆ بکرێت، هاوشێوەی ئەو شتەیە پێی دەڵێین "دیسانەوەناسینی رۆتینی". لە بەشەکانی داهاتووی کتێبەکەدا ئەو خاڵە باس دەکەین، بەڵام نموونەی پێویست ئەمەیە: "بۆ یەکێک لە نەخۆشە بەرژەوەندیخواز و بە تواناکان لێکم دایەوە، کە یەکێک لە خوێندکارە گەنجەکان بەرهەمێکی زۆر سەیری بە ناوی "هونەرمەند، توێژینەوەیەکی لەسەر دەروونناسی رەگەزی" نووسیوە و لەو رووەوە وەک یەکێک لە خوێندکارانی من ناسراوە. پاش پانزە مانگ کاتێک ئەو کتێبە لە کتێبفرۆشییەکاندا دانرا بۆ فرۆشتن، هەر ئەو نەخۆشەیش پێی وتم بە بیری دێتەوە پێشتر لە شوێنێکدا (رەنگە لە کەتەلۆگێکدا) ئاگاداری کتێبەکەی تەنانەت پێش ئەوەی من بۆ جاری یەکەم لەو بارەوە قسەی لەگەڵدا بکەم بووە. (رەنگە مانگێک یان شەش مانگ پێش ئەوە) خوێندوویەتییەوە. ئەو پێشتر بیری لەو ئاگادارییە نەکردووەتەوە و لە لایەکی ترەوە تێگەیشتووە کە نووسەر ناوی بەرهەمەکەی گۆڕیوە و سەرەتا ناوی کتێبەکە "توێژینەوە لەسەر دەروونناسیی رەگەزی" بوو، ئێستا بووەتە "راپۆرتێک لە بارەی دەروونناسیی رەگەزییەوە". من لەم بوارەدا هەندێک زانیاریم لە نووسەری کتێبەکە بەدەست هێناوە و کاتێک بەروارەکانم پێکەوە پێوانە کرد، ناچار بەو دەرەنجامە گەیشتم کە نەخۆشەکەم ویستوویەتی مەسەلەیەکی دژوار بە مێشکیدا بهێنێتەوە، چونکە پێش چاپکردنی کتێبەکە و بڵاوکردنەوەی بە هیچ شێوەیەک ئاگاداری نەدرابوو و بەهەرحاڵ، پانزە مانگ پێش بڵاوبوونەوەی لە هیچ

شوێنێکدا باسی لێوە نەدەکرا. من دەمویست لە لێکدانەوەی ئەو خەونە زەینییە دەست هەڵگرم، بەڵام دیسانەوە نەخۆشەکە هاتەوە بۆ لام و خەونێکی هاوشێوەی گێڕایەوە. ئەو وایدەزانی بەمزوانە لە دیکۆری کتێبفرۆشـــییەکەیدا، کتێبێکـــی لە بـــارەی ســــەرەگێژەوە بینیـــوە و ویستوویەتی بیکڕێت، بەڵام لە هیچ کەتەلۆگێکدا ناوی ئەو کتێبەی نەبینیبوو. ئەوسا توانیم هۆی بەدواداگەڕانی سەرنەکەوتوانەی بۆ شرۆڤە بکەم. بەرهەمێک لە بارەی سەرەگێژەوە وەک پلانێکی نەست لە لێکدانەوەکانیدا پێک هێنرابوو و دەبوا خۆی ئەوەی بینووسیبا. ویستی بەرژەوەندیخوازانەی بە مەبەستی ڕکەبەرایەتیکردنی لەگەڵ نووســەری کتێــبەکەدا "دەروونناســیی ڕەگەزی" و هەروەهــا بــۆ نووسینی بەرهەمی زانستی کە بتوانێت ئەو لە ڕیزی خوێندکارانی مندا دابنێت بووە هۆی یەکەمین و هەروەها دووهەمین خەونی زەینی. پاش ئەو شــرۆڤەیە، نەخۆشــەکە بە بیــری هــاتەوە ئاگــاداری ئەو کتێبفرۆشییەی کە ببووە هۆی خەونی سەبارەت بە کتێبێک بوو، بە ناوی "دەرکەوت، یاسای زاوزێکردن" بووە. بەڵام لە بارەی گۆڕینی نــاوی کتێبــی بەر باســی ئــێمە دەبــێ دانــی پیــادا بنــێم مــن ئەو بیرکردنەوەیەم بەو دابوو، چونکە بە بیرم دێتەوە لە کاتی ناوهێنانی کتێبەکەدا خوێندکارە گەنجەکەم تووشی هەڵەیەک بووە و لە بری وشەی توێژینەوە لە وشەی ڕاپۆرت کەڵکی وەرگرتووە.

### لەبیرچوونەوەی بەرنامەکان

چونکە لەبیرچوونەوەی بەرنامەکان زیاتر لە بابەتەکانی تر دیاردەی لەبیرچوونەوە لەخۆ دەگرێت، بۆ سەلماندنی بیرۆکەکەمان گونجاو دیـارە: لاوازی ســەرنجدان خــۆ لە خــۆوە بــۆ شــرۆڤەی هەڵەیەکــی ڕەفتاری بەس نییە. بەرنـامە تەکـانێکە کە پێشـتر کەسـێک پەسـندی

کردووە، بەڵام جێبەجێکردنەکەی خراوەتە کاتێکی تر. هەروەها لە ماوەی کاتی نێوان وێنای بەرنامە و ئەنجامدانی دەکرێ مەبەستەکان بگۆڕدرێن بە شێوەیەک کە بەرنامە جێبەجێ نەکرێت، بەڵام لە بیریش نەکرێت: لەو ڕووەوە یان بە ئاسانی بەرنامەکە دەگۆڕدرێت یان دەسڕێتەوە. کەسەکان لەبیرچوونەوەی بەرنامە، کە هەموو ڕۆژ و لە هەموو بارودۆخێکدا ڕوو دەدەن نەک هەر بە پشتبەستن بە گۆڕینێک لە یەکسانی مەبەستەکاندا شرۆڤە ناکرێن، بەڵکوو ئەو جۆرە لەبیرچوونەوانە بە بێمتمانەیی و بەبێ شرۆڤە دەمێننەوە، یان بە وتنی ئەو بابەتە کۆتا دێت، کە لە کاتی جێبەجێکردندا بە بۆشایی سەرنج بۆ جێبەجێکردن ڕووبەڕووی دەبنەوە، هەر ئەو سەرنجەی کە لە کاتی وێنای بەرنامەکەدا پێویستی بە مەرج بووە و ئەو کاتە بۆ گەرەنتیکردنی جێبەجێکردن بەس بووە. ڕوانگەی ئاساییمان بە بەرنامەکان پیشانمان دەدات ئەو هەوڵدانە بۆ شرۆڤەکردن تا چ ڕادەیەک لەخۆڕا ئەنجام دراوە. ئەگەر ڕۆژێک بەیانییەکەی بەرنامەیەک دابنێین کە دەبێ هەمان شەو جێبەجێ بکرێت، ڕەنگە هەندێ هەلومەرج ڕوو بدات بە درێژایی ڕۆژ چەندین جار بیر لەو بەرنامەیە بکەینەوە، بەڵام هەرگیز پێویست ناکات ئەو بەرنامەیە سەرانسەری ڕۆژ لە ویژدانی نەستدا بمێنێتەوە. کاتێک کاتی جێبەجێکردن نزیک دەبێتەوە، دیسانەوە بەرنامە دەگەڕێتەوە بۆ زەین و وامان لێ دەکات پێشەکیی پێویست بۆ کاری بەنامەداڕشتن ئامادە بکەین. کاتێک کەسێکی ئاسایی نەک دەروون ئازار، بە نامەیەکەوە لە ماڵ دەڕواتە دەرەوە و دەیەوێت پۆستی بکات، بە هیچ شێوەیەک پێویست ناکات لە گشت ڕێگاکەدا نامەکە بە دەستەوە بگرێت و بەردەوام بۆ دۆزینەوەی سندووقی پۆست سەیری ئەملا و ئەولای بکات تا نەخشەکەی خۆی لە یەکەمین دەرفەتدا جێبەجێ بکات، ئەو نامەکەی دەنێتە گیرفان و بە ئاسوودەییەوە بە ڕێگاکەیدا دەڕوات،

ئیجازە دەدات بیرکردنەوەی جۆراوجۆر بە ئازادانە لە میشکیدا پێک بێت و بە باشی تێدەگات کە لە کاتی بینینی سندووقی پۆستەدا سەرنجی ڕادەکێشرێت و پەرچدانەوەی گونجاو دابین دەکرێت: واتە دەستی دەنێتە گیرفانی و نامەکە دەردێنێت. ڕوانگەی ئاسایی بە گوێرەی بەرنامەیەکی داڕێژراو هاوشێوەی ڕوانگەی هەندێ کەسە کە لە ڕێگای هیپنۆتیزم "بیرکردنەوەی پاش هیپنۆتیزمی درێژ خایەن"ەوە پیان وتراوە. زۆر جار ئەو دیاردەیە بەم شێوەیە وەسف دەکەن: "پلانی وتراو لە زەینی کەسی مەبەستدا تا کاتی جێبەجێکردن لە بێدەنگییەکی تەواودا بەسەر دەبات، پاشان دەورووژێتەوە و کەسەکە هان دەدات بۆ پراکتیککردنی".

لە ژیاندا دوو دۆخ لە ئارادایە، کە تیایدا تەنانەت ئەو کەسانەی بچووکترین ئاسینێکیان نییە تێدەگەن کە لەبیرچوونەوەی بەرنامەکان بە هیچ شێوەیەک دیاردەیەکی سەرەتایی و بەرەوکەمبوونەوە نییە، بەڵکوو دەکرێ ئەنجام وەربگرین مەبەستە دانپیانەنراوەکان لە مرۆڤدا هەیە. مەبەستم لەو دوو دۆخە، پەیوەندی خۆشەویستی و خزمەتی سەربازییە. ئەو خۆشەویستەی کە بە نەختێ درەنگکردن دەڕوات بۆ جێژوانەکەی، هەرچەند داوای لێبوردن لە خۆشەویستەکەی بکات و بڵێت بەداخەوە وادەکەی لەبیر کردبوو و لە ئاکامدا ڕووبەڕووی ئەم وەڵامەی ژنەکە دەبێتەوە: "بەڵام ساڵی پار هیچ کات وادەی جێژوانەکانمانت لەبیر نەدەکرد. کەواتە دیارە ئیتر خۆشت ناوێم." ئەگەر ئەو دڵدارە بە شرۆڤە دەروونناسانەییەکان کە لە سەرەوە باسمان کرد پشتی پێ ببەستێت و هەوڵ بدات تا بە باسکردنی کێشە و گرفتی جۆراوجۆر و کاری پێویست پاساو بۆ لەبیرچوونەوەکەی بهێنێتەوە، لەپڕ خۆشەویستەکەی بەقەد پزیشکێکی پسپۆڕ لە دەروونشیکاریدا وشیار و قووڵ دەبێتەوە، وەڵامی دەداتەوە: "سەیرە هەرگیز کار و کێشەکان تۆی ئەوەندە نەدەشڵەژاند." هەڵبەت ئەو

خـاتوونه حاشـای له ئەگەری لەبیرکردنـی نەدەکـرد، تەنهـا لەبەر خۆیەوە بیری لێ دەکردەوە لەبیرچووونەوەکە بەئەنقەست نییە، وەک بیانوویەکی نەسـت هێمای بەرجەسـتەی نەبـوونی ئاراسـتەیە و لەو بارەوە حەق بەوە.

لەو ڕووەوە، لە لەشـکردا هـیچ جۆرە جیاوازییەکی سـەرەکی نێـوان گرنگیپێنەدانـی بەئەنقەسـت و گـرنگیپێنەدان بەهـۆی لەبیرچـوونەوە دانـانێن. نـابێ سـەرباز هـیچ کـام لەو ئەرکـانەی خزمەتـی نیزامـی سەربازی چاوەڕێی لێ دەکات لەبیری بکات و ئەگەر بە وشیارییەوە تووشی لەبیرچوونەوە بێت، کەواتە لە زەینیدا هەندێ مەبەست هەن کە لەگـەڵ مەبەسـتە هاندەرەکانیـدا لە کـاتی ئەنجامـدانی خزمەتـی سـەربازی دژبەرن. ئەو گەنـجەی کە سـاڵێک لە خزمەتـی سـەربازی تێـپەڕ کـردووە بە باشـی دەزانێـت ئەگەر لە دەربڕینەکانیـدا داوای لێبووردن بڵێت، لە بیری کردووە بریقە بخاتە دوگمەکانی تەمییەوە. هەڵبەت ئەو سـزایە زۆر تونـد نییە، واتە ئەگەر ئەو لە لای خـۆی و سـەرووترەکانیەوە دانـی پیـادا بنێـت کە لە هەمـوو کـارە سەیروسەمەرەکانی سەربازی ڕقی هەڵدەستێت بیری لێ بکەنەوە چ سزایەکی توندی بەسەردا دەسەپێت. سەرباز بۆ دوورەپەرێزبوون لە سزای توند، واتە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی، لەبیرچوونەوە دەکاتە بیانوو و داوای لێبـووردن دەکـات، مەگەر ئەوەی لەبیرچـوونەوە ڕاسـتەقینە بێـت و وەک بیـانوویەک کەڵکـی لـێ وەر نەگیرابێـت. ژنـانیش وەک بەرپرسـانی سـەربازی چـاوەڕوانن ئەو شـتانەی پەیوەنـدە بەوان لە چوارچێـوەی لەبیرچـوونەوە دوور بێـت و لەو ڕووەوە لەسـەر ئەو بـاوەڕەن لەبیرچـوونەوە تەنها بـۆ مەسـەلەی بێبـایەخ دەهێنـرێتەوە، چونکە لەبیرچوونەوە لە مەسەلە گرنگەکاندا ئەوە دەگەیەنێت کەسەکە دەیەوێت مەسەلە گرنگەکان بێبایەخ دابنێت، واتە هیچ بایەخێکیان بۆ دانەنێـت. بە دڵنیـاییەوە ناکرێـت ڕوانگـەی دەروونناسـانە بـۆ

مەزەندەکردنی ئەو جۆر مەسەلانە لەبەرچاو نەگیرێت. هیچ کەسێک ئەنجامدانی ئەو کارانەی بە لایەوە گرنگن لەبیر ناکات، جیا لەوە گومانی لێ دەکەن تووشی تێکچوونی دەروونی بووبێت. بۆیە بوارە توێژینەوەییەکانمان تەنها بۆ لەبیرکردنی ئەو بەرنامانەی تارادەیەک لاوەکین سنووردار دەبێتەوە. بە بۆچوونی من بەرنامەیەک لە ئارادا نییە کە بۆ پلاندانەر بە تەواوی گرنگ نەبێت، چونکە جیا لەو دۆخە بەرنامەیەکی وەها هەرگیز بە زەیندا نایەت.

بەو شێوەیەی لە بارەی تێکچوونە پراکتیکییەکانەوە باس کرا، لێرەدا بوارەکانی گرنگیپێنەدان بەهۆی لەبیرچوونەوەوە کە بۆ خۆم رووی داوە کۆم کردووەتەوە و بۆ شرۆڤەکردنیان هەولّم داوە و هەروەها بەبێ جیاوازی تێگەیشتووم لە هەموو بوارەکاندا لەبیرچوونەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەبەستی نەناسراو و دانپیادانەنراو، بە واتایەکی تر بەهۆی دەستێوەردانی هێزی "دژ- ئیرادە" پێک هاتووە. لە هەندێ بواردا لە بارودۆخێکدا بووم بێ هاوشێوە نەبوو لەگەڵ سەربازیدا واتە تەحەمولی دۆخێکم دەکرد کە هەرگیز لە بەرامبەریدا دەستم لە یاخیبوون بەر نەدەدا و ئەو پێڕەونەکردنی فەرمانە بە شێوەی لەبیرچوونەوە دەردەکەوت. دەبێ ئاماژە بەو خاڵە بدەم بە ئاسانی ساڵرۆژی لەدایکبوون و جەژنە گشتییەکان و هاوسەرگیرییەکان و پلەوپایەوەرگرتنەکان لەبیر دەکەم تا پیرۆزبایی لە خەڵک بکەم، هەرچەند زیاتر هەوڵ دەدەم، کەمتر لەو کارانەدا سەرکەوتوو دەبم. لە ئاکامدا بڕیار دەدەم لەو کارە دوور بگرم و بە ئەنقەست و وریاییەوە لەو مەبەستانەی من دوور دەخەنەوە لەو کارە پێڕەوی بکەم. یەکێک لە هاوڕێیانم بەهۆی مەراسیمێکەوە داوای لێ کردم تا تەلەگرافێکی پیرۆزبایی لە مێژوویەکی دیاریکراودا لە لایەن ئەوەوە بنێرم (وایدەزانی ئەو کارەم بە لاوە ئاسانە، چونکە دەبوا منیش هەر بەو بۆنەیەوە تەلەگرافێکم بناردبا). هەر لەو کاتەدا پێم وت بە

دلنیـــاییەوە هەم نـــاردنی تەلەگـــرافەکەی ئەو و هەم نـــاردنی تەلەگـرافەکەی خـۆم لەبیـر دەکەم و کاتێـک پێشـگۆییەکەم ڕاسـت دەرچوو قەد سەرم نەسوڕما. من بە دوای ئەو ئەزموونە ناخۆشانەی لە ژیانمدا هەمبووە ئیتر ناتوانم سەرنج و حەزم دەرببڕم بە تایبەتی لەو بوارانەی کە ئاشکراکردنی ئەو جۆر هەستانە بە پێویست دەبینێت شێوەیەکی ڕۆتینی لەخۆ بگرێت کە بە هەستی سارد و بێ گڕوتینی من لەو جۆرە بوارانەدا بە هیچ شێوەیەک پێوانە ناکرێت. لەوەتەی تێگەیشتووم کە ئارەزووی ڕۆتینی و درۆی بەرامبەرەکەمم زۆر جار بە شـتێکی ڕاسـتەقینە دانـاوە لە بەرامـبەر دەربڕینـی بەڵێننـامەی سـۆزداری ڕۆتینیـدا، واتە ئەو قسـانەی کە لـە ڕاسـتیدا لە سـوودە کۆمەڵایەتییەکانیان تێناگەم یاخی بوون پیشان دەدەم. تەنها لە کاتی مردنـی خەڵکدا زیـاتر سـۆزدار دەبـم و هەر جـارە و ویسـتوومە بە بۆنەی مردنـی کەسـێکەوە سەرەخۆشـی بە خزمەکـانی بڵێم تووشـی لەبیرچـوونەوە نەبـووم. کاتێـک دەربڕینـی سـۆزەکانم لایەنـی ئەرکی کۆمەڵایەتییان نییە هەستەکانم بە ئازادانە دەردەبڕم و لەبیرچوونەوە ئەوانە سەرکوت ناکات.

ملازم ت. بوارێکی لەبیرچوونەوەی لەو جۆرە شرۆڤە دەکات، کە لە کاتی دیلکردنیدا ڕووی دابوو، ئەو مەسەلەیە جیا لەوەیش گرێدراوی بەرنامەیەکە، کە سەرەتا سەرکوت بووە و پاشـان توانیبووی ئاشکرا بێت و بارودۆخی ناخۆش و ئازاراوی پێک بهێنێت.

نموونەیەک لە سڕینەوە

لە مقەڕی ئەفسەرە زیندانییەکاندا، ئەفسـەری گەورە، واتە فەرماندەی مقەڕەکە ڕووبەڕووی ئیهانەی یەکێک لە ئەفسەرەکان بووەوە. ئەو بۆ دوورەپەرێزی لە دەرەنجـامی خراپی مەسـەلەکە دەیویسـت لە تەنها

ئـامێری کۆتـایی، کـە لە بەردەسـتیدا بـوو کەڵـک وەربگرێـت و ئەو ئەفســەرە لە شــوێنەکە دوور بخــاتەوە و بینرێـت بـۆ مقەرێکـی تـر. سەرەڕای ئەوەیش بەهۆی پێداگریی چەند کەسێکی هاوقیتارەوە بە پێچەوانەی حەزی ناخەوەی بڕیاری دا ئەو ڕێگەچارەیە ئەنجام نەدات و سـەرەڕای هەمـوو ئەنجـامی نـیگەرانکەر یاسـای لێپرسـینەوەیەکی بەشـەرەفی هەڵبـژارد. بەیانیی هەمـان ڕۆژ دەبوایە فەرماندەکە لەژێر دەسەڵاتی پاسەوانەکەدا حازر و نەبوونی هەموو ئەفسەرەکان ئەنجام بدات. هەمـوو ئەفسـەرەکانی دەمێک بـوو دەناسـی و هەرگیز لە کاتی حـازر و نەبوونیانـدا تووشـی هەڵە نەدەبوو، بەڵام ئە مجارەیان نـاوی ئەو ئەفسەرەی ئیهانەی پێ کردبوو لەبیر کرد، بە شێوەیەک کە ئەو کەسە ناچار بوو پاش ڕۆیشتنی هەموویان و تا کاتێک کە فەرماندەکە لە هەڵەکەی خۆی تێبگات لە شوێنی خۆی بوەستێت. لە حاڵێکدا نـاوی ئەو ئەفســـەرە بە ڕوونـــی و جـــوانی لە ناوەڕاســـتی لاپەڕەکەدا نووسرابوو.

قوربـانی ئەو ڕووداوە پەرچـدانەوەی فەرمانـدەکەی بە ئیهـانەیەکی بەئەنقەست دانا، فەرماندەکە ئەوەی بە ڕێکەوت دادەنـا، بەڵام حاشـای لە بیرکـردنەوەی هەڵەی ئەفســەرەکەیش نەکـرد. ئەو پـاش ناسـینی "زیـانلێکەوتنی دەروونی"ـی فرۆیـد تـوانی ڕێـک تێبگـات چ کارەسـاتێک ڕووی داوە.

کێشـــەکێش لە نێـــوان ئەرکـــی ڕێکـــەوتنی تـــاک و دادوەریـــیە دەروونییەکەی، کە نەهـاتووەتە سـەر زار، دەتوانێت لەبیرچوونەوە لە ئەنجامـدانی کارێکـدا وادەی بە خەڵـک داوە شـرۆڤە بکـات. لەو جـۆر بوارانەدا کەسی خێرخواز زۆر جار تەنها کەسێکە کە لەبیرچوونەوەی خۆی بە کـارێکی پێویسـت دادەنێت، بەڵام ئەو کەسـەی نیـازیەتی بە بێگومان لەبەر خۆیەوە دەڵێت: "ئەو هیچ کەڵکێک لە ئەنجامدانی کارێک

وادەی پێ دابووم، نابات. ئەگینا لە بیری نەدەکرد.* لێرەدا حەق بە کەسی بەنازە. کەسانێکیش هەن ئێمە پیان دەڵین بیروهۆش خراپ و هەر بەو شێوەیەی ئەو کەسانەی نزیکبین کاتێک لە شەقامدا سڵاو و چاکیوچۆنیمان لەگەڵ ناکەن لێیان دەبوورین، نیگەران نابین بەهۆی لەبیرچوونی کارەکانیانەوە. ئەو کەسانە هەموو وادە و بەڵێنی ئاسایش لە بیر دەکەن و هیچ کام لەو کارانەی دەیخەینە ئەستۆیان ئەنجامی نادەن و لە مەسەلە وردەکاندا بێ متمانەیی پیشان دەدەن و پروپاگەندە دەکەن، نابێ کەسانی تر هەڵە بچووکەکانیان لە بەرچاو بگرن، چونکە ئەو هەڵە وردانە ناگەڕێتەوە بۆ ڕەفتار و کرداریان، بەڵکوو هۆیەکی جەستەیی هەیە. من لە ڕیزی ئەو کەسانەدا نیم و ئەو هەڵەم بۆ نەرەخساوە تا ڕەفتاری ئەو جۆر کەسانە شی بکەمەوە، بۆیە ناتوانم لە بارەی ئەو مەبەستانەی لەسەر ئەو جۆرە لەبیرکردنەوانە زاڵن بە دڵنیاییەوە ڕای خۆم دەربڕم. بەڵام پێم وایە بە گوێرەی بواری هاوشێوە دەتوانین بڵێین کە مەسەلەکە لێرەدا دەگەڕێتەوە بۆ سوکایەتییەکی نەست و دەرنەبڕاو کە لە هۆکاری جەستەیی کەڵک وەردەگرێت تا بەرجەستە بێت. لە بوارەکانی تردا بە دژواری دەکرێ مەبەستی لەبیرچوونەوە هەڵبهێنرێت و دۆزینەوەیشی زیاتر دەبێتە هۆی سەرسوورمان. بۆ نموونە تێگەیشتم لە ڕابردوودا کاتێک دەبوایە سەردانی نەخۆشێکی زۆرم بکردبا تەنها ئەو نەخۆشانەم لەبیر دەکرد، کە حەقی زەحمەتیان نەدەدا، یان هاوکارەکانی خۆم بوون. بۆ دوورەپەرێزی لەو جۆرە لەبیرچوونەوانە، کە بووەتە هۆی شەرمەزاریم، خووم بەوەوە گرتبوو لە بەیانییەوە هەموو ئەو چاوپێکەوتنانەم لە کاتی ڕۆژدا دەبوایا ئەنجامم بدایە، لە دەفتەرێکی بچووکدا یادداشتی بکەم. نازانم ئایا پزیشکەکانی تر بۆ دوورەپەرێزی لە لەبیرچوونەوە هەر بەو چارەسەرە پشت دەبەستن یان نا، بەڵام ئەم ئەزموونە لە بارەی ئەو

هۆکـارانەی نەخۆشـەکانی "دەروون ئـازار" هـان دەدات لەسـەر لەتە کاغەزێـک هەمـوو ئەو شـتەی دەیانەوێت بە پزیشـک بڵێن یادداشـتی بکەن. هێمایەکمان لە بەردەستدا دادەنێت: ئەوانە متمانەیان بە وزە و وەفاداری خۆیان نییە. بە دڵنیاییەوە ئەو بۆچوونە ڕاستە، بەڵام زۆر جـار مەسـەلەکان بەو شـێوەیە ڕوودەدەن، نەخـۆش پـاش ئەو تێکچوونـانەی بۆی دەچێت، چرکەیەک بێدەنگ دەمێنێتەوە و پاشان لەتە کاغەزێـک لە گیرفـانی دەردێنێـت و لە کـاتی داوای لێبووردنـدا دەڵێت: "مـن لەسـەر ئەو کـاغەزە هەنـدێ بـابەتم یادداشـت کـردووە، چونکە جیا لەوەیش هیچ شتێکم بە بیر نایەتەوە." زۆر جار نەخۆش هەموو وردەکارییەکان دووپات دەکاتەوە و خۆی وەڵامیان دەداتەوە: "باشـە ئەو مەسـەلەیەم پرسـی". لەو ڕووەوە لەتە کـاغەزەکەی، ڕەنگـە تەنهـا بـۆ ئاشـکرا کردنـی یەکێـک لە هێماکـانی نەخۆشـییەکەی، واتە گومان لەو بورارانەدایە کە بەرنامەکانی بەهـۆی مەبەستە نامۆکانەوە تێک بچێت.

ئێسـتا دەمەوێـت دان بە عەیبێکـدا بنێـین کە زۆربەی هاوڕێیـان و خزمـانی تەندروسـتم لەوە ڕەنـج دەبینن. بە ئاسانی ڕوو دەدات کە لە بیـری بـکەم کتێبێـک بـدەمەوە یـان شـتێک بـدەمەوە. ڕەنگـە کاتێـک گەنجترم ئەومەسـەلەیە کەمتر ڕوو بدات، بەڵام بەهەرحاڵ، ماوەیەک لەوەوپـێش لە دوکـانی جگەرەفرۆشـییەکدا کە هەمـوو ڕۆژێـک لەوێ جـگەرە دەکێشـم دەربـکەوم و بـڕی پـارەدانەکەم لەبیـر کـرد. ئەوە گرنگیپێنەدانێکـی بـێ زیـان بـوو، چـونکە خـاوەن دوکـانەکە بە باشـی دەیناسـیم و دڵنیـابوو ڕۆژی دوایـی پـارەکەی پـێ دەدەم. بەڵام ئەو درەنگکەوتـنە بە دڵنیـاییەوە باسـی لە حەزبەقەرزگرتنـی دەکـردم و پەیوەنـد دەبـوو بەو تێبینیـانەی کە ڕۆژی پێشـوو لەو ڕووداوە لە بـارەی پاشـکەوتەکانمەوە زۆر منـی سـەرقاڵ کردبـوو. تەنـانەت لەو کەسـانەیدا کە بـە ڕای ئـێمە زۆر بەشـەرەفن بە ئاسـانی دەتـوانین

ئاسەوارێک لە ڕوانگەیەکی دووجۆربوون بەرامبەر بە پارە و خاوەنداریتی بدۆزینەوە. ئەو گرێدراوییە سەرەتاییەی کورپەکان هەوڵ دەدەن هەموو شتومەکەکان هەڵبگرن و (بەرەو دەمیان بیبەن) زۆر جار تەنها ئارادەیەک لەژێر کاریگەریی پەروەردە و کلتووردا لەناو دەچێت.

ڕەنگە بەو ڕێژە نموونانەی باسمان کرد، خوێنەر تووشی ئەو هەستە بکەم دەرەنجام باسم لە بابەتی ئاسایی و بێبایەخ کردووە. بەڵام ئامانجی من سەرنجڕاکێشانی خوێنەرە بۆ لای ئەو دیاردانەی هەموو کەسێک دەیناسێت و بە یەکسانی لێی تێدەگەن. بە واتایەکی تر ویستوومە ڕووداوەکانی ڕۆژان کۆ بکەمەوە و شییان بکەمەوە و تێناگەم بۆچی ئەو جۆرە "بیرکردنەوانە" کە دەرکەوتەی ئەزموونەکانی ڕۆژانەی ژیانە، ناکرێ لە ڕیزی دەسکەوتە زانستییەکان دابنرێت. تایبەتمەندیی سەرەکی توێژینەوەی زانستی چۆنیەتی ڕاستییەک نییە کە توێژینەوەیان لەسەر دەکرێت، بەڵکوو دروستی شێوازێکە کە لە توێژینەوە و بینینەکاندا ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێت و هەروەها ئەو بەدواداچوونەی بۆ تێکەڵاوبوون و نۆژەنکردنەوەیە، دەبێ زۆر بەربڵاو بێت.

لە بارەی بەرنامە گرنگترەکانەوە تێگەیشتووم، زۆر جار ئەم بەرنامانە کاتێک لە بیر دەکرێن، کە مەبەستە نادیار و نەناسراوەکان ئەوانە تێک دەدات. لە بەرنامە کەم بایەخترەکاندا دەکرێ لەبیرچوونەوە بە میکانیزمێکی تر پەیوەند بدرێت. بەرنامەکە لە بەرامبەر خۆڕاگرییەکی دەروونیدا دادەنرێت کە لە دژایەتیکردنی لەگەڵ کۆمەڵەیەکی دەروونی تردایە و ئەو کارەیش بەهۆی وەبیرهێنانەوەیەکی ساکاری دەرەکی نێوان ئەو کۆمەڵەیە و بەرنامەی مەبەست پێک دێت. ئێستا نموونەیەک بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە دێنینەوە: من کاغەزی

وشککەرەوەی باشی مرەکەبم زۆر خۆش ئەوێ، ڕۆژێکیان بڕیارم دا کاتێک دوای نیوەڕۆ بۆ کڕینی دەچم بۆ بازاڕ لە کاتەکە کەڵک وەربگرم، بەڵام چوار ڕۆژ بە دوای یەکدا ئەو بەرنامەیەم لەبیر کرد لە ئاکامدا لە خۆمم پرسی کە هۆکاری لەبیرچوونەوەکەی چییە و هۆکەیم دۆزییەوە: بە بیرم هاتەوە زۆر جار دەنووسم Löschpapier بەڵام بەهۆی خووگرتنەوە لە قسەکردندا وشەی Filesspapierبەکار دەبەم. هەروەها فلیس Fliess ناوی یەکێک لە هاوڕێیانمە کە خەڵکی بەرلینە و چەند ڕۆژێک پێش ئەم ڕووداوە ناوی ئەو هەندێ بیرکردنەوە و ئەندێشەی خراپی لە زەینمدا وەبیر هێنایەوە. من نەمدەتوانی ئەو ئەندێشە و بیرکردنەوانە لە خۆم دوور بخەمەوە، بەڵام غەریزەی بەرگری دەرکەوت و بە یارمەتی وەرگرتن لە نموونەیەکی هاوشێوەی فۆنێتیکی جێگۆڕکێیەکە ئەنجام درا و لە ئەنجامدا غەریزەی بەرگری لەسەر بەرنامە بێبایەختر و کەم خۆڕاگر کاریگەریی دانا.

لەم نموونەی لای خوارەوەدا کە لە بارەی درەنگکەوتنە، ناکۆکییەکی ڕاستەوخۆ و هۆیەکی دوورتر هاوکات دەرکەوتن. بابەتێکی کورتم بۆ کۆلێکشنی "مەسەلە هاوبەشەکانی عەسەب و ژیانی دەروونی" نووسی، کە کورتەیەک بوو لە کتێبی "زانستی خەونەکان". (برگمەن) لە (ویسبادێن)ەوە نموونە چاپییەکانی بۆ ناردم و تکای کرد زووتر بەوانەدا بچمەوە، چونکە دەیویست گۆڤارەکە تا جەژنی نوئێل بڵاوی بکاتەوە. من هەمان شەو بە نموونەکاندا چوومەوە و لەسەر مێزی نووسینەکە دامنا تا بەیانییەکەی پۆستی بکەم. سبەی بەیانییەکەی ئەو بەرنامەیەم پشتگوێ خست و لە بیرم کرد و دوای نیوەڕۆکەی لە بیرم کرد پاکەتەکە لەگەڵ خۆم بەرم و شەوەکەی و بەیانییەکەیشی هەر بەو شێوەیە تێپەڕی. لە ئاکامدا دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دووهەم لەناکاو هەستام و نموونەکانم هەڵگرت و خێرا لە ماڵ چوومە دەرەوە

تا زەرفەکە لە یەکەمین دەرفەتدا بخەمە ناو سندووقی پۆستەکە. لە ڕێگادا بە سەرسووڕمانەوە لە خۆمم پرسی هۆکاری درەنگکەوتنی من چی بووە. دیارە هیچ ئارەزووییەکم بۆ ناردنی نموونەکان نەبووە، بەڵام هۆکەی هێشتا بەلامەوە ڕوون نەبوو. لە کاتی گەشتدا لە شاری ڤیەننا چوومە ناو دامەزراوەیەکی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەوە کە کتێبی "لێکدانەوەی خەونەکان"ی بە چاپ گەیاندبوو. ئنجا بە شێوەیەک کە گوایە ئیلهامم بۆ هاتبێت لە بەرپرسی چاپەمەنییەکەم پرسی: "ئەرێ بەڕاست دەزانی من بەرگێکی نوێم لە (خەونەکان) نووسیوە؟ ئەو پرسی: ئۆ، چۆن؟ من وتم: نیگەران مەبە، مەبەستم تەنها بابەتێکی کورتە کە بۆ کلێکشنی "مەسەلە هاوبەشەکانی عەسەب و ژیانی دەروونی"م ناردووە". بەرپرسی چاپەمەنییەکە نیگەران بوو، چونکە دەترسا بابەتەکە زیان لە فرۆشتنی کتێبەکە بدات. هەوڵم دا پێچەوانەی ئەو مەسەلەیەی بۆ بسەلمێنم و لە ئاکامدا وتم: "ئەگەر پێش نووسینی بابەتەکە ئیجازەم لە تۆ وەربگرتبا، ئایا وەڵامی نەرێت دەدایەوە؟ ئەو وتی: هەڵبەت نا". من بڕوام وابوو لەو ڕووداوەدا حەق بە من بوو و بە پێی دابونەریتی ئاسایی ڕەفتارم کردووە و سەرباری ئەوەیش وا دیارە منیش هەر لەو مەسەلەیە دەترسام کە ببووە هۆی ترسی بەرپرسی چاپەمەنییەکە و هەر ئەم کارەیش هۆی گومانم بوو لە ناردنی نامەکەدا. ئەو ترسە بەند بوو بە دۆخی لەوەوپێش و بەتایبەتی بەو ناڕەزایەتیانەی بڵاوگەیەکی تر پێی کردبوو. کاتێک بەرپرسی نووسینی بەشێک لە کتێبی "وانەی هاوکاری و جێگربوون" سەبارەت بە ئیفلیجبوونی مێشکی منداڵان بووم و لە نووسیندا لە چەند لاپەڕەی نامەکەدا کە پێشتر لە لایەن چاپەمەنی دووهەمەوە نیگەران ببوو، بەڵام لەو بوارەدا هیچ ناڕەزایەتییەک نەبوو، چونکە بەوپەڕی جوامێرییەوە بڵاوکەرەوەی بابەتەکەم لە مەبەستی خۆم واتە تێهەڵکێشی چەند لاپەڕەیەک بۆ کاری نووسینی "کتێبە

وانەی"یەکەم ئاگادار کردبووەوە.

بەڵام بە بەدواداچوونی بیرەوەرییەکانم هەلومەرجێکی کۆنترم بە بیر هاتەوە، کاتێک وەرگێڕانی کتێبێکی فەرەنسیم کردبوو و لە ڕاستیشدا هەندێ مافی ئەدەبیم پێشێل کردبوو، واتە هەندێ بابەتم بە ناوەڕۆکی وەرگێـڕانەکە زیـاد کردبـوو بەبـێ ئەوەی لە نووسـەری ئەو کتێـبە ئیجازە وەربگرم و دوای چەند ساڵ دڵنیا بوومەوە کە ئەو نووسـەرە لەو کارەی من کردوومە بە هیچ شێوەیەک ڕازی نییە.

عەقڵی باشی گشتی بە باشی دەزانێت کە لەبیرچوونەوەی پلانێک یان بەرنامەیەک هەرگیز بە ڕێکەوت نییە. مەسەلەیەکی کۆن هەیە، دەڵێت: "ئەگەر شتێک بۆ جارێک لەبیری بکەیت بۆ هەمیشە لە بیری دەکەیت."

بێگومان ناکرێ ئەو ئەندێشـەیە لە بەرچاو نەگیرێت کە ئەو شـتەی لە بـارەی لەبیرچـوونەوە و هەڵە ڕەفتارییەکانـەوە دەکـرێ، بڵێـین بـۆ بەدەستهێنانی زۆربەی خەڵک لە ڕیزی مەسەلە نەناسراوەکاندایە و بە تەواوی نادیـارە. کەواتە بـۆچی وا دیـارە ئـێمە هەمـوو جارێـک ئەو شتەی هەمـوو کەسـێک بە باشـی دەیزانن پێیان دەڵێین؟ من چەندین جار لە خزمان و ناسراوەکان ئەوەم بیستووە: "ئەو کارەم لە ئەستۆ مەنێ، ڕەنگە لەبیری بکەم." ئەو کەسەی ئەم ڕستانە دێنێتە سـەر زار بە شێوەیەکی نادیار هەست بەوە دەکات دەیەوێت ئەو ئەرکە لە بیر بکات و تەنها بۆ وتنی ئەو کارە گومان پیشان دەدات.

جیا لەوەیش لەبیرکردنی بەرنامەکان دەرکەوتنێکی زۆر سـەیرە، کە دەکـرێ ئەوەش بە "وێنـای بەرنـامەی ڕۆتینـی" بناسـرێت. بـەڵێنم بە نووسـەرێکی گەنـج دابـوو پێشـەکییەک لە بـارەی ئەو کتێـبەی تـازە نووسیبووی بنووسم. ئەو خۆڕاگرییە دەروونیـانەی کە ئاگام لێیـان نەبـوو بـووە هـۆی ئەوەی ئەو کـارە دوا بـخەم، تـاکو ڕۆژێکیـان نووسەرە گەنجەکەم بینی، چونکە لەو بارەیەوە پێداگر بوو ڕێکەوتم

لەگەڵیدا و بەڵێنم دا هەر ئەو شەوە پێشەکییەک بۆ کتێبەکەی بنووسم. بڕیاری کۆتاییم دابوو بەڵێنەکەم بەجێ بهێنم، بەڵام لە بیرم کردبوو هەمان شەو دەبێ بۆچوونێکی پزیشکی خێرا بنووسم. دەرەنجام کاتێک تێگەیشتم پلانێکی ڕۆتینیم لە مێشکدا دروست کردووە، دەستم بەردا لە کێشمەکێشی دەروونیم و نووسەرە گەنجەکەم ئاگادار کردەوە کە بەڵێنەکەم وەربگرمەوە.

بەشی هەشتەم

ناشیبوون و هەڵە

بابەتی لای خوارەوە لە کتێبی "مرینگەر" و "مایەر"دا کە پێشتر ناویانم هێنا تێهەڵکێشی دەکەم: "هەڵە زمانییەکان دیاردەی جیا نین. ئەو هەڵانە بەندن بە چەند هەڵەیەکی ترەوە، کە ڕەفتارەکانی تری مرۆڤ لەژێر کاریگەرییاندایە و بە ناوی نەشیاو بە لەبیرچوونەوە ناوبانگیان هەیە". لەو ڕووەوە من یەکەم کەس نیم کە چەمک و مەبەستێک لە بەرامبەر کردارە وردەکاندا دەدەمە پاڵ ژیانی ڕۆژانە.

زمـــان ڕەفتـــارێکی جـــووڵەییە، کەواتە ئەو هەڵانەی لە کـــاتی کەڵکوەرگرتن لە زماندا تووشی دەبین، دەتوانن چەمکێکی وەهایان هەبێت هیچ شتێک ڕێگر نەبێت لە بەردەمیدا، هەر ئەو چەمکە پەرەی پێ دەدەین و دەیدەینە پاڵ ئەو هەڵە جۆراوجۆرانەی لە کاتی ئەنجامدانی ڕەفتارە جووڵەییەکانی تردا تووشی دەبین. من ئەو جۆر هەڵانە بە دوو بەش پۆلێن دەکەم: بەشی یەکەم/ ئەو بوارانە لە خۆ دەگرن کە بەدەستنەهێنانی دەرەنجامی مەبەست بە ڕواڵەت ڕەگەزی

بنەڕەتیان پێک دێنێت، بە واتایەکی تر ئەمانە بواری شیاوی پێوانەنەکردنن لەگەڵ مەبەست و ئامانجی کەسەکەدا و لەو ڕووەوە بە هەڵە ناو دەبرێن. بەشی دووهەم/ بریتییە لە بوارێک کە تیایدا کردار بە گشتی نەشیاو دێتە بەرچاو و وا دەریدەخات وەڵامی هیچ ئامانجێک ناداتەوە. ئەم بەشی دووهەمە دەکرێ ناوی کرداری هێمادار و بەرێکەوتی لەسەر دابنرێت. جیا لەوەیش ماوەی نێوان ئەو دوو بەشە ڕوون و دابڕاو نییە و ئێمە لە کاتی ئەم قسەکردنەدا ڕازی بووین ئەو هەموو پۆلێنانەی ئەنجامیان دەدەین تەنها بایەخی وەسفکردن و لەگەڵ یەکبوونی دەروونی دیاردەی مەبەستمان دژبەر بن.

ئەگەر لە بواری خاڵی تێگەیشتنی دەروونی هەڵەکە بە "ناهەماهەنگی جووڵەیی" یان بەتایبەتی "ناهەماهەنگی مێشکی" دابنێین هیچ شتێکمان دەست ناکەوێت. کەواتە باشتر وایە هەوڵ بدەین تا هەر کام لەو بوارانەی هەڵیان دەسەنگێنین پاڵی بدەین بەو هەلومەرجەوە کە هەڵەکەی تیا دەرکەوتووە. لێرەدا دەبێ لە بینینە شەخسییەکانم کەڵک وەربگرم و هەر لە ئێستاوە جەختی لەسەر دەکەمەوە، ئەو بوارانە زۆر نین.

١- لە سەردەمانی ڕابردوودا کاتێک زیاتر لە ئەمڕۆ دەچووم بۆ سەردانی نەخۆشەکانم لە ماڵەوە ئەمە ڕووی دەدا کە لەبەر دەرکی ماڵی نەخۆشەکەدا لە بری زەنگ لێدانی دەرگاکە یان لێدانی دەرگاکە کلیلی خانووەکەی خۆمم لە گیرفان دەردەهێنا و خێرا و تاڕادەیەکیش بە شەرمەزارییەوە دیسانەوە دەمنایەوە گیرفانم. زۆر لەو ڕەفتارەی خۆم ورد دەبوومەوە و لە ئاکامدا تێگەیشتم ئەو هەڵە ڕەفتارییە واتە دەرهێنانی کلیلی ماڵەکەی خۆم لە بەرامبەر دەرگای ماڵی کەسێکی تردا بە واتای ڕێزلێنان و ئارەزوویەکە کە بۆ دانیشتوانی ئەو ماڵە

هەمە. گوایە بەو کارە دەمویست بە خۆم بلێم "من لەم ماڵەشدا وەک ماڵی خۆم ئاسوودەم"، چونکە ئەو هەڵەیە تەنها کاتێک رووی دەدا کە لە شوێنی نیشتەجێبوونی ئەو نەخۆشانە بووم کە هەمان کات بە گەرمی بەرەو پیریم دەهاتن. (پێویست بە شرۆڤە ناکات، پێچەوانەی ئەو مەسەلەیە هەرگیز روو نادات، واتە من هیچ کات زەنگی دەرگای ماڵەکەی خۆم لێنادەم).

لەو رووەوە رەفتاری هەڵەم پەرچدانەوەی سومبولیکی ئەندێشەیەک بوو کە ویژدانی نەستم ئەوەی بە جدی وەرنەدەگرت، چونکە لە راستیدا پسپۆرێکی عەسەبناسی بە باشی دەزانێت تەنها کاتێک نەخۆش گرێدراویەتی کە چاوەڕێی چاکبوونەوەی لێ دەکات و ئەو حەزە دۆستانەی کە پزیشک بەرامبەر بە نەخۆش دەریدەبرێت زۆر جار سوودێکی دەروونی هەیە و بەشێک لە چارەسەری گشتی پێک دێنێت.

توێژینەوەی جۆراوجۆری کەسەکانی تر لەسەر رەفتاری خۆیان پیشانی دەدات ئەو هەڵانەی کە دەسکە کلیل، یان کلیلەکان رۆڵیان هەیە تیایدا تایبەت بە من نییە.

کاک ئی. میدەر، لە بەرهەمێکدا بە ناوی "راپۆرتێک لە بارەی زیانناسیی دەروونی لە ژیانی رۆژانەدا"، هەندێ ئەزموون لێک دەدەنەوە، کە لەگەڵ ئەزموونەکانی مندا یەکسانە و دەنووسێت: "بۆ هەموو کەسێک لانی کەم جارێک رووی داوە، کە لە کاتی گەیشتنی بۆ بەردەمی دەرگای ماڵی هاورێ زۆر خۆشەویستەکەیدا دەسکە کلیلەکەی دەرهێناوە و خۆی لە دۆخێکدا بینیوەتەوە کە بە کلیلەکەی خەریکی کردنەوەی دەرگاکەیە، گوایە دەیەوێت دەرگای ماڵەکەی خۆی بکاتەوە. هەڵبەت ئەو کارە دەبێتە هۆی درەنگکردن، چونکە لە ئاکامدا دەبێ زەنگی دەرگاکە لێ بدرێت، بەڵام ئەو کارەیش هۆیەکەی

ئەوەیە ئەو کەسە وا دەزانێت لە ماڵی خۆیایەتی یان پێی خۆشە هەستێکی وەهای هەبێت".

ئێ. جۆنس لە لاپەڕە ٥٠٩ی کتێبەکەیدا دەنووسێت: "کەڵکوەرگرتن لە کلیلەکان سەرچاوەی دروستبوونی ڕووداوی لەو جۆرەیە"، دوو نموونە دەگێڕینەوە:

"کاتێک ناچار دەبم لە خوێندنەوەیەک کە تیایدا قووڵ بوومەتەوە دەست هەڵ بگرم و بۆ ئەنجامدانی کارێک کە پێویستی بە بیرکردنەوە و ئیرادە نییە بڕۆم بۆ نەخۆشخانە، زۆر جار بە سەرسوڕمانەوە خۆم لە کاتی خەریکبوون بە کردنەوەی دەرگای تاقیگەکە دەبینمەوە بە کلیلی ئەو نووسینگەیەی لە ماڵەوە هەمە، هەرچەند کلیلی تاقیگەکەیش هیچ هاوشێوەییەکی لەگەڵ کلیلی تاقیگەکەدا نییە. بەو هەڵەیە بە پێچەوانەی حەزی خۆمەوە پیشان دەدەم وام بە باش زانیوە لە ماڵەوەدا بمێنمەوە و نەڕۆم بۆ نەخۆشخانە".

"چەند ساڵ لەوەوپێش پیشەیەکی کەم بایەخم هەبوو لە ڕێکخراوێکدا. دەرگای ڕێکخراوەکە بەردەوام قفڵ بوو بە شێوەیەک کە بەردەوام ناچار بووم زەنگ لێ بدەم تا دەرگاکە بکەنەوە. من چەندین جار لەناکاو خۆمم لە کاتی هەوڵدان بۆ کردنەوەی دەرگاکە دەبینی. هەریەک لە ئەندامە فەرمییەکانی ڕێکخراوەکە (منیش لەو کاتەدا پێم خۆش بوو ئەندامی فەرمی ئەو ڕێکخراوە بم) کلیلێکی هەبوو و دەیتوانی بەبێ ئەوەی چاوەڕێ بکات دەرگاکە بکاتەوە. لەو ڕووەوە هەڵەکەی من پیشاندەری ئارەزووم بوو بۆ گەیشتن بە دۆخێکی وەها و هێمای ئەوە بوو دەمویست ئەو شوێنە وەک ماڵی خۆم وا بێت".

"هانس ساکس"ی خەڵکی ڤیەننا، چیرۆکێکی وەهای گێڕاوەتەوە: "بەردەوام دوو کلیلم پێیە. یەکێکیان دەرگای نووسینگەکەم دەکاتەوە و ئەویتریان دەرگای ماڵەکەم دەکاتەوە. ئەو دوو کلیلە

هاوشێوەییەکی تایبەتیان پێکەوە نییە و ناکرێت ئەوانە بە ئاسانی بە هەڵە بیانبینیت، چونکە کلیلی نووسینگەکە لانی کەم سێ ئەوەندە گەورەترە لە کلیلی ماڵەکە. هەرچەند بەردەوام من یەکەمیان لە گیرفانی پانتۆڵەکەم و دووهەمیانم لە گیرفانی جاکەتەکەم دادەنا. سەرەڕای ئەوەیش چەندێک جار ڕووی دەدا کاتێک لە بەرامبەر یەکێک لە دوو دەرگاکەوە بووم تێدەگەیشتم لە کاتی هاتنە سەرەوە لە پلیکانەکاندا کلیلی دەرگایەکی ترم لە گیرفان هێناوەتە دەرەوە. لەو ڕووەوە بڕیارم دا ئەو کارە کۆنترۆڵ بکەم و سەرژمێرییەک بە دەست بێنم، چونکە هەموو ڕۆژێک لە بەردەمی ئەو دوو دەرگایەدا لە دۆخێکی دەروونی یەکساندا بووم و بەو ئەنجامە گەیشتم کە بە هەڵەزانینی کلیلەکان ئەگەر بەهۆی هاندەری دەروونییەوە بێت، ڕەنگە دیسیپلینێک پەیڕەوی بکات. هەرچەند کاتێک کونترۆڵکردنەکانم درێژە پێ دا، زانیم بە بەردەوامی دەمەوێت بە کلیلی ماڵەوە دەرگای نووسینگەکەم بکەمەوە، پێچەوانەی ئەو مەسەلەیەیش جارێکیان ڕووی دا ئەوەش کاتێک بوو کە ماندوو و هیلاک لەسەر ئیش و کار دەهاتمەوە و دەمزانی کەسێک بۆ سەردان چاوەڕێمە، ئەو ڕۆژە هەوڵم دا دەرگای ماڵەکەم بە کلیلی نووسینگەکەم بکەمەوە، ئەو کلیلەی لە قفڵی دەرگاکە گەورەتر بوو".

٢- لە شەش ساڵ لەوەوپێشەوە خووم بەوەوە گرتووە ڕۆژی دوو جار لە کاتێکی دیاریکراودا زەنگی دەرگای ماڵێک لێ بدەم. بە درێژایی ئەم شەش ساڵە دوو جار ڕووی دا (دوو جار لە ماوەیەکی کورتدا) لە بری نهۆمی دووهەم بڕۆم بۆ نهۆمی سێیەم و زەنگی ئەو دەرگایە لێ بدەم. جاری یەکەم نوقمی خەونی بەرزەفڕانە بووم و لە دنیای خەوندا دەمبینی زۆر پێشکەوتووم. ئەو ڕۆژە کاتێک چوومە سەر یەکەمین پلیکانەکانی نهۆمی سێیەم دەنگی کردنەوەی دەرگای شوقەی نهۆمی دووهەمم نەبیست کە تیایدا چاوەڕێم بوون. جاری

دووهەم دیسانەوە لە بەردەم شوقەی مەبەستدا تێپەڕیم، چونکە نوقمی بیرکردنەوەکانم بووم. کاتێک لە هەڵەکەم تێگەیشتم بەو ڕێگایەی پێیدا ڕۆیشتبووم گەڕامەوە و هەوڵم دا تێبگەم نوقمی چ بیرکردنەوەیەکم. ئنجا تێگەیشتم کە لە ڕەخنەگرێکی "خەیاڵی" بەرهەمەکانم توورە بووم، چونکە ڕەخنەی لێ گرتبووم کە "زێدەڕۆیی" دەکەم و دەمەوێت "لە ئاستی خۆم زیاتر بڕۆم".

٣- سالانێک لەوەوپێش لەسەر مێزی نووسینەکەم چەکوشێکی ئەندازەگرتنی پەرچدانەوەی عەسەبی و (دەنگگەیەنەر)ێک لەپاڵ یەکدا و بەردەوام لە شوێنێکی تایبەتدا دامنابوون. ڕۆژێکیان دەبوایە خێرا پاش کۆتایی وەرگرتنی نەخۆشەکە سواری شەمەندەفەری قەراخی شار بم، چونکە بۆ هاتنە دەرەوە لە عیادەکە زۆر بەپەلە بووم تا شەمەندەفەرەکەم لە کیس نەچێت، لە بری چەکوشی ئەندازەگرتن کە دەمویست لەگەڵ خۆمدا بیبەم "دەنگگەیەنەر"ـەکەم نایە گیرفانی جلە مەتەرییەکەم، بەلام بەهۆی قورسایی شتومەکێکەوە لە هەڵەکەم تێگەیشتم. کەسێک کە خووی بەوەوە نەگرتووە بیر لەو ڕووداوە وردانە بکاتەوە بێگومان لە دۆخێکی وەهادا بەپەلەبوون بۆ ئامادەبوونی ئەو هەلانە شرۆڤە دەکات و شیاوی لێبوردنی دەکات. بەلام من هەڵەی نێوان چەکوشەکە و دەنگگەیەنەرەکەم بە مەسەلەیەکی جدی دانا و هەوڵم دا هۆکەی بدۆزمەوە. پەلەکردنەکەم هۆیەکی باش بوو کە دەبوا منی لە هەڵەکردن دوور بخستبایەتەوە تا کاتەکەم بەفیڕۆ نەڕۆشتبا. یەکەمین پرسیار کە لە خۆمم کرد ئەوە بوو: "کێ بۆ دوایین جار دەنگگەیەنەرەکەی لە شوێنی خۆی جێگیر کرد؟" ئەو ڕووداوە چەند ڕۆژێک لەوەوبەر ڕووی دابوو، من منداڵێکی مەغۆلم تاقی کردەوە و هەندێ سەرنجیم بۆ لای دەنگەکان هەڵدەسەنگاند. منداڵەکە بە ڕادەیەک سەرنجی بۆ لای دەنگگەیەنەرەکە ڕاکێشرابوو بە زەحمەت توانیم ئەوەی لە دەست وەربگرمەوە. ئایا

دەبوا وا ئەنجامم وەربگرتبا کە کەسێکی گەمژەم؟ بە ڕواڵەت وا دیار بوو، چونکە یەکەمین ئەندێشە کە لە بارەی چەکوشەکەوە (Hammer)بە زەینمدا هات ئەوە بوو (Chamer) بە واتای "ولاخ"ە لە زمانی عبریدا.

بەڵام ئەو ناسزاکردنە چ واتایەکی هەبوو؟ دەبوایە بارودۆخەکەم نەختێ هەڵبسەنگندایە. من بەپەلە بووم بڕۆم سەردانی نەخۆشێک بکەم، کە لە ڕۆژئاوای قەراخی شاردا دەژیا و بەو شێوەیەی لە نامەکەدا خەبەریان پێ دابووم چەند مانگ لەوەوپێش لە باڵەکۆنەکەوە کەوتبووە خوارەوە و لەو کاتە بەدواوە توانای ڕێ و چوونی نەبوو. ئەو پزیشکەی بانگی کردبووم لە تاقیکردنەوەکەیدا گومانی هەبوو و نەیدەزانی لاوازی ڕێ و چوونی نەخۆشەکە دەرەنجامی زەربەبەرکەوتنی دڕکەپەتکە، یان دەروون ئازاری زیانبەخش (هیستریا)، لەو ڕووەوە منی دەعوەتی کردبووم تا بۆچوونی تەواوی بۆ دەربڕم. دەبێ لە بیرمان بێت لە دەستنیشانکردنی کێشەدا نەخۆشییەک نابێ هەرگیز لایەنی پاراستنی خۆی لەدەست بدات. جیا لەوەیش پزیشکەکان وا بیریان دەکردەوە لەو بوارانەی کە مەسەلەکان زۆر جددییە، ئێمە بە کەمتەرخەمییەوە هیستریا دەستنیشان دەکەین، بەڵام هەموو ئەم بیرەوەرییە ناسزاییانەی من دابوومە پاڵ خۆم پاساو نەدەدرایەوە. هەرچەند ئەو وێستگە شەمەنەفەرەم بە بیر هاتەوە، کە دەبوایە لەوێ دابەزیبام هەر ئەو وێستگەیە بوو کە چەند ساڵ لەوەوبەر بۆ بینینی نەخۆشێکی گەنج لەوێ دابەزیبووم. پیاوە گەنجەکە پاش وروژاندنێک تووشی هەندێ تێکچوونی جووڵەیی ببوو. من نەخۆشییەکەی ئەوم بە هیستریا دەستنیشان کردبوو و دەستم کردبوو بە چارەسەری دەروونیی، بەڵام ئەوەندەی نەخایاند تێگەیشتم هەرچەند دەستنیشانکردنەکەم بە تەواوی ڕاست نەبووە. هەندێ لە هێماکانی نەخۆشییەکەی جۆریەتی

هیستریایی بوو و پاش ماوەیەکی تر بەهۆی چارەسەری دەروونییەوە چاک بووەوە، بەڵام بە دوای ئەو هێمایانەدا، چەند هێمایەکی تر دەرکەوت کە چارەسەرکردنەکانم ئەوانەی باشتر نەدەکردەوە و تەنها دەیتوانی بەند بێت بە سەختبوونی دەمارە جۆراوجۆرەکانەوە. ئەو کەسانەی پاش من نەخۆشەکەیان بینی بەبێ هیچ کێشەیەک ئاوسانی ئەندامیان دەستنیشان کردبوو، منیش ئەگەر لە باتی ئەو پزیشکانە بوومایە بە دڵنیاییەوە وەک ئەوان دادوەری و کارم دەکرد. سەرەڕای ئەوەش شتەکان دەریاندەخست بە ڕاستی لە دەستنیشانکردندا تووشی هەڵەیەکی گەورە بووم و هەڵبەت نەمتوانی بەڵێنەکەم جێبەجێ بکەم. بۆیە ئەو هەڵەیەی ببووە هۆی ئەوەی لە بری چەکوش، دەنگگەیەنەرەکە بنێمە گیرفانم واتایەکی وەهای هەبوو: "گەمژە، وڵاخ! ئەمجارەیان ئیتر باش لێی ورد بەرەوە و کاتێک نەخۆشێکی بێ چارەسەر دەبینیت، هیستریای بۆ دەستنیشان مەکە! لە بیرت نایە چەند ساڵ لەوەوپێش جارێکیان لەو شوێنەی کە ئێستا نەخۆشێکی داماوی لێ کەوتووە، تۆ ئەم دەستنیشانکردنە هەڵەیەت کردبوو؟" خوشبەختانە بۆ ئاسانکاری شیکردنەوە و بە داخەوە بۆ ورە و عەسەبم -هەر ئەو پیاوەی کە زۆر تووشی ئیفلیجی ببوو بەهۆی سەختبوونی دەمارەکانییەوە- چەند ڕۆژێک پێش منداڵە مەغۆلەکە و هەروەها ڕۆژێک پاش ئەوە هاتبوو بۆ عیادەکەم.

لێرەدا بە باشی دەبینم کە دەنگی "ڕەخنە لەخۆ" بە پشتبەستن بە هەڵەکە پەرەی سەند و جیا لەوەیش بەتایبەتی لەو جۆرە بوارانەدا بەکار دێت. هەڵەی ئەمڕۆ هێمای هەڵەیەکە کە پێشتر تووشی بووم.

٤- دیارە مەبەستی بێ ئەژمار و نادیاری تر دەتوانن لە هەڵەکە کەڵک وەربگرن. ئێستا نموونەیەک لەو بارەیەوە دێنمەوە. من بە دەگمەن شتێک دەشکێنم. هەڵبەت کارامەییەکی تایبەتم نییە، بەڵام

چونکە سیستمی عەسەبی ماسولکەیەکی بێ کەموکورم هەیە هیچ هۆیەک نییە کارێکی ناشی ئەنجام بدەم و دەرەنجامی خراپی لێ بخەمەوە. بۆیە لە بیرم نایەت لە ماڵەوە شتێکم شکاندبێت یان دامرزاندبێت، چونکە عیادەم ئەوەندە بەربڵاو نییە، زۆر جار ناچارم بۆ دەستلێدان لە شتومەکی گڵێن، یان بەردینی کلێکشنە بچووکەکەم بکەومە دۆخێکی ئازاراوییەوە. ئەو کەسانەی لەو جۆر کاتانەدا سەیرم دەکەن چەندین جار خەفەتیان لێ خواردووە، ڕەنگە شتێک لە دەستم بکەوێت و بشکێت، بەڵام ئەو کارە هەرگیز ڕووی نەدابوو. کەواتە بۆچی سەری مەرەکەبەکە کە لە ڕەگەزی مەرمەڕ بوو لە دەستم کەوت و شکا؟ مەرەکەبەکەم لە قاپێکی مەرمەڕی بەتاڵ پێک دێت، کە کونێکی تیا دروست بووە و دەبێ جێی مەرەکەبێکی شووشەیی تیا دابنرێت. سەرێکی دوگمەدار ئەوەش لە ڕەگەزی مەرمەڕ لەسەر مەرەکەبەکە دابنرێت. لە پشت بۆکسی مەرەکەبەکەدا ڕیزێک لە پەیکەرە بچووکە برۆنزی و نیوە جەستەییەکان هەبوو کە لە گڵ دروست کرا بوو. ڕۆژێکیان کە دەمویست بۆ نووسین لەسەر کورسی و پشت میزی نووسینەکەم دابنیشم بەو دەستەی قەڵەمەکەم بە دەستەوە گرتبوو جووڵەی ناشیانە و زۆر بەربڵاوم ئەنجام دا. سەری مەرەکەبەکە کە لە تەنیشت مەرەکەبەکەدا بوو کەوتە سەر زەوییەکە و شکا. شرۆڤەی ئەو کارە ئەوەندە دژوار نەبوو: چەند کاتژمێر پێش ئەوە خوشکەکەم هاتبوو بۆ عیادە تا بزانێت شتی تازە چیم کڕیوە. ئەو شتە تازەکانی زۆر بە لاوە باش بوو و وتی: "نووسینگەکەت زۆر بە باشی ڕازاوەتەوە، تەنها بۆکسی مەرەکەبەکە هەماهەنگی نییە لەگەڵ شتەکانی تردا. دەبێ مەرەکەبێکی جوان بکڕیت". من بیرم لە پێشنیاری خوشکەکەم دەکردەوە و پاش چەند کاتژمێرێک گەڕامەوە بۆ نووسینگەکەم و ئەو کات بوو کە ئەو مەرەکەبەی دەبوایە لەناو بچووبا شکا. ئایا لە قسەی خوشکەکەم

ئەنجامم وەرگرتبوو کە لە یەکەم دەرفەتدا بۆکسێکی مەرەکەبم بە دیاری دەداتێ و هەروەها بۆ هاندانی ئەو بۆ ئەنجامدانی مەبەستێک کە بەوەوە گرێم دابوو بەپەلە مەرەکەبە کۆن و ناشیرینەکەم شکاندبوو تا خوشکەکەم بخەمە ناو مەوقفێکی ئەنجامدراوەوە؟ ئەگەر شتێکی وەها بوو کەواتە جووڵە توندەکەم تەنها بە ڕواڵەت ناشیانە و لە ڕاستیدا زۆر کارامانە بوو و بە تەواوی لەگەڵ ئامانجەکەمدا یەکی دەگرتەوە چونکە ئەو جووڵەیە نەبووە هۆی شکاندنی هیچ کام لە شتومەکەکانی سەر مێزەکە کە لە پاڵ مەرەکەبەکاندا دانرابوون.

بە ڕای من دەکرێ ئەو دادوەرییە گرێ بدرێتە زنجیرە ڕەفتاری بە ڕواڵەت ناشیانە. هەڵبەت جووڵەی توند و خێرا و لە هەمان کاتدا ناهەماهەنگ دیارن، بەڵام مەبەست و ئامانجێکی لەسەر زاڵە و هەموو ئەو جووڵانە ئاراستە دەکات. ئەو جۆر زەربانە بە دڵنیاییەکی وەها و وردبینییەک ئامانجەکە دەپێکێت، کە زۆربەی جووڵە نەست و بە ئەنقەستەکانمان دەتوانن بەخیلییان پێ بەرن. هەروەها ئەو دوو تایبەتمەندییە واتە خێرایی و دڵنیایی لە پەرەسەندنە جووڵەکانی دەروون ئازاریی هیستریا و هەروەها لە پەرەسەندنی لێکدانەوەی خەودا بەر چاو دەکەون و هاوبەشن. ئەو کارە دەیسەلمێنێت لە زۆربەی بوارەکاندا ئاڵوگۆڕی یەکسان لە دەرەنجامی بزواندنی عەسەبی (تعصیب)دا لە ئارادایە کە هێشتا بە نەناسراوی ماونەتەوە.

ئەم بابەتەی لای خوارەوە لە خاتوو "لۆ ئەندری ئیس- سالۆمێ"دا بە ڕوونی پیشان دەدات کە ناشیبوونی بەردەوام بە باشی دەتوانێت لە خزمەتی مەبەستە دانپیانەنراوەکانماندا بێت. ئەو دەڵێت: "لەو سەردەمەی کە شیر وەک خواردنێکی بەنرخ و دەگمەن دەردەکەوێت، چەندین جار ڕووی دا بە ترس و نیگەرانییەوە بینیم هەر جارە و دەمەوێ شیر بکوڵێنم شیرەکە لێدەچێت. هەوڵم دا ڕێگر بم لەبەردەم

ئەو زیـانەدا، بەڵام سـوودێکی نەبـوو. لە حاڵێکـدا کە زۆر جـار بە بێتەرکیزی سەیری ئاسمان دەکەم و لە بەرامبەر مەسـەلەی ڕۆژانەی وەهـادا کەمـتەرخەم نـیم. خـۆزگە ئەو ڕووداوە پـاش مردنـی سـەگە جـوان و سـپییەکەم کە زۆر خۆشـم دەویسـت ڕووی بـدابا (نـاوی سـەگەکەم درۆجـۆکDroujok ــە لە زمـانی ڕووسـیدا بە واتـای "هـاوڕێ، ڕەفیق" دێت و ئەو زیاتر لە کەسانێکی تر شیاوی ناوێکی وەها بوو)، بەڵام نا، ڕێک پاش مردنی سەگەکەم ئیتر نەمهێشت شیری لێ بچێت. یەکەم بیرکردنەوەیەک بە مێشکمدا هـات ئەوە بـوو: "زۆر چاکە. ئیتر شیری لێ ناچێت، چونکە ئەوەی دەڕژێتە سـەر زەوییەکە یان فەرشـەکە ئیتـر بە کەڵکی هـیچ نـایەت." ئینجـا لە هەمـان کاتـدا لە بەرچـاوی خـۆم وێنـای دروجـۆک دەرکەوت. ئەو لە بەرامبەرمـدا دانیشـتبوو و بە تەواوی گـوێ و چـاوی لـێم بـوو، زۆر بە وردی سـەیری قۆنـاخی کولانـدنی شـیرەکەی دەکـرد تـا چارەرەشـیی زۆر سەیر سەداسەد ڕوو بدات. ئەوسا هەمـوو شـتێک بە لامەوە ڕووی دا و بەتـایبەتی ئەو بـابەتەی مـن زیـاتر لەوەی بیـرم لـێ دەکـردەوە ئەو سەگەم خۆش دەویست".

لەم چەند ساڵەی دواییدا ئەو جۆرە توێژینەوانە کۆ دەکەمەوە چەند جـار ڕووی دا کە شـتومەکێکی بەنـرخ بشـکێنم یـان دایـڕزێنم، بەڵام توێژینەوەی هەمـوو ئەو بوارانە پێـی پێشـان داوم ئەو کـارە ڕووداو یان کارێکی ناشیانە و بێئەنقەست نەبووە. بۆ نموونە ڕۆژێک سـەر لە بەیانی کاتێک خەریک بووم لە یەکێک لە دەرگاکانەوە تێپەڕ دەبووم و جلـی حەمـام لەبەر کردبـوو و نەعلـم لە پـێ کردبـوو گـوایە لە جووڵەیەکی لەناکاو فەرمانم وەرگرتووە و بە پێ یەکێک لە نەعلەکانم بەرەو لای دیوارەکە فڕێ دا. ئەنجامەکەی وابوو کە پەیکەری بچووک و جـوانی ڤینـۆس لە ڕەگەزی مەڕمەڕ لە تـاقەکە کەوتە خـوارەوە و بەسـەر زەویـیەکەدا کەوت. لە حاڵێکـدا پەیـکەرەکە دەشـکا بەبـێ

متمانەیی ئەو دێڕانەی (بۆش)م خوێندەوە:

Ach! Die Venus ist Perdü

Klickeradoms! – von Medici!

(ئاخ! ڤینۆس ون بوو -ترپە و زرمە- ڤینۆسی"مدیسی").

دۆخ و ورەم لەو چرکـانەدا جـوولەی ناشـیانە و بـێ متمـانەم لە بەرامبەر ئەو زیانە لەناکاوەدا شرۆڤەکەریەتی: ژنێکی خزممان لەو کاتەدا زۆر نەخۆش بوو و من وردە وردە بۆ چاکبوونەوەی ئومێدم لەدەست دا. ئەو ڕۆژە سەر لە بەیانییەکەی هەواڵیان پێ داین دۆخی باشتر بووەتەوە. بە بیرم دێت لەبەر خۆمەوە بیرم کردەوە: "کەواتە زینـدوو دەمێنێـتەوە". قەیرانـی تونـدوتیژی بـۆ ڕووخـان لەو کـاتەدا ئامرێک بوو تا سوپاسی خۆم لە بەرامبەر ژیاندا دەرببڕم و جۆرێک لە "قوربانی" بۆ دەربڕینی سوپاسـەکەم پێشکەش بکەم، گوایە نەزرم کردبـوو و جێبەجێکردنـی ئەو نەزرەیـش بەنـد بـوو بە هەواڵێکـی خۆشـەوە کە پێمگەیشـتبوو، بەڵام لە بـارەی هەڵبژاردنـی جـۆری شتومەک سزای لەناوچوونی هەبوو، واتە ڤینۆسی مدیسی ڕەنگە ئەو هەڵبـژاردنە ڕێـز و حەزی منی بـۆ ئەو ژنە گەنـجە پیشـان دابێت کە قۆناغی چاکبوونەوەی تێدەپەڕاند.

ئەمجارەیـان لە بڕیـاری خێـرای خـۆم و هەروەهـا کـارامەییم بـۆ قوربانیکردنی ئەو شتومەکەکە سەرم سوڕما، چونکە بە سەرپێییەوە لە هیچ شتومەکێکی تری نەدابوو کە لە تەنیشت پەیکەرە بچووکەکەدا دانرابوو.

جـارێکی تـر بە هانـدانێکی هاوشـێوە شـتومەکێکم خـراپ کـرد و سـەرەڕای ئەوەیـش کە ئەمجارەیـان سوپاسـکردن لە چـارەنووس نەبووە هۆی "قوربانی بوون"ی شتومەکەکە، بەڵکوو پەرچدانەوە بۆ



CamScanner

دوورەپەرێزیکردن لە ڕووداوی ناخۆش و گیانفیدایی دەگەڕایەوە بۆ لێکدانەوەی ئەو دەرکەوتانەی کە تەنها لە ویژدانی نەستەوە سەرچاوەیان دەگرت، لۆمەم کرد. لێم تۆرا و نامەیەکی بۆ نووسیم و تکای لێ کردم کە شیکردنەوەی هاوڕێکانی نەکەم. پاشان پەسندم دەکرد، حەق بەو بوو لەو ڕووەوە نامەیەکم بۆ ئاشتبوونەوە نووسی و لە کاتی نووسینی نامەکەدا لەناکاو جوولەیەکی خێرای پیشان دا. جوولەکە بووە هۆی ئەوەی کە قەڵەمەکە لەناو دەستم بخلیسکێت و لەسەر پەیکەری بریقەدار و زۆر جوانی میسری کە تازە کری بووم بکەوێتە خوارەوە و زیانێکی زۆری لێ بدات. خێرا پاش ئەو ڕووداوە ناخۆشە تێگەیشتم کە ئەو جوولەیەم پیشان داوە تا بەرگری بکەم لە ڕووداوە ناخۆشەکە. خوشبەختانە هاوڕێیەتیمان و پەیکەری بچووک نۆژەن کرایەوە بەبێ ئەوەی ئاسەوارێک لەو زیانانە بە سەریەوە مابێت.

لەم نموونەیەی لای خوارەوە تێکدانی شتومەکەکان هۆکارێکی بێبایەختری هەیە. "ت. ویشەر" وتەنی جۆرێک بوو لە "بە نهێنی لە سێدارەدانی" شتومەکەکە کە ئیتر بەلایشمەوە باش نییە. چەند ساڵ لەوەوپێش گۆچانێکم هەبوو دەسکەکەی زیو بوو، بەڵام ڕۆژێکیان ڕووپۆشی زیوی زیانی بەرکەوت، هەڵبەت من لە زیانی بەرکەوتوودا هیچ ڕۆڵێکم نەبوو. گۆچانەکەم بۆ چاککردنەوە دانا، بەڵام کاری نۆژەنکردنەوە باش دەرنەهات. پاش چەند ڕۆژ کاتێک لەگەڵ یەکێک لە ڕەفیقەکانمدا یاریم دەکرد بۆ گرتنی، قاچی ئەو گۆچانەکەم بەکار هێنا. ئنجا دەسکەی گۆچانەکە بوو بە دوو کەرتەوە و لە کۆڵم بووەوە.

ئەو ئارامی و نەبوونی کاریگەرییەی لە کاتی ڕوودانی زیانێکی وەهادا ڕوو لە خەڵک دەکات، دەربڕی ئەوەیە، کە مەبەستێکی نەست لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی دەبنە هۆی تێکدانی شتومەکەکان ڕێنوێنیمان

دەکات. هەندێک جار کاتێک بە دوای هاندەرەکانی هەڵەیەکی ڕەفتاریدا دەگەڕێین بە چەند هۆیەک تێدەگەین هەرچەند دەگەڕێینەوە بۆ سەردەمی کۆنمان، بەڵام پەیوەندن بە باروودۆخی ئێستامانەوە. شیکردنەوەکەی لای خوارەوە لە بارەی کاک ل. جێکێلس نموونەیەکی لەو جۆرەی خستە ڕوو.

"پزیشکێک ئنجانەیەکی گڵێنی هەبوو کە بە بەردی ڕەش ئینجانەکە ڕازابووەوە. ئینجانەکە بەنرخ نەبوو، بەڵام زۆر جوان دیار بوو. ئەو چەند ساڵ لەوەوپێش ئەو ئینجانە و زۆربەی شتومەکەکانی تر کە لە نەخۆشەکانی وەک دیاری پێی درابوو ئەمەیشیان لە ژنێکی خێزاندارەوە وەک دیاری وەرگرتبوو. کاتێک پزیشکەکە دڵنیا بوو نەخۆشەکە تووشی دەروونپەرێشانی بووە، خێرا ئەو هەموو شتومەکەی بە دیاری وەرگرتبوو، دایەوە بە بنەماڵەکەی و تەنها ئینجانە نرخ هەرزانەکەی نەیتوانی لە خۆی جیا بکاتەوە، ڕەنگە ئەوەیش بەهۆی جوانییەکەیەوە بوو بێت. بۆ ماوەیەک لە ناخیدا هەستی بە ئازار دەکرد، چونکە بە باشی دەیزانی ئەو کارەی ئەو بێئەدەبیە، بەڵام هەوڵی دەدا پەشیمانییەکەی سەرکوت بکات و لەو ڕووەوە بۆ مەسەلە جۆراوجۆرەکان و بەتایبەتی نرخی کەم و دژواربوونی خستنە ناو کارتۆنی ئینجانەکانی دەکردە بیانوو بە ڕادەیەک کە پێش گەیشتنی بە شوێنی مەبەست نەشکێت.

پاش چەند مانگ کاتێک ناچار بوو پارێزەرێک بگری تا بنەماڵەی ئەو ژنە کە نەیاندەویست حەقی زەحمەتەکەی پێ بدەن ناچار بن ئەوەی پێ بدەن، تووشی پەشیمانی بوو، چونکە دەترسا بنەماڵەی نەخۆشەکە تێبگات ئەو شتومەکێکی پیان نەداوەتەوە و ئەوسا لە بری وەڵامی ئەرێ بۆ داواکارییەکەی پەنا بەرنە بەر کاری یاسایی. هەندێک جار پەشمانییەکەی دەگەیشتە ئاستێک کە لە خۆیی دەپرسی: ئایا باشتر

نیبه پاشگەز ببیتەوە لە داوای مسافەکەی تەنانەت ئەگەر بایەخی گولدانەکە ١٪ی نرخی حەقی زەحمەتەکەی بێت؟ بەلام لە ناکامدا لەو بیرکردنەوە سەیرە بە راستی سەری سوورما. دۆخی دەروونی هەر بەو شێوەیە بوو، تا رۆژێکیان کاتی ئاوی ئینجانەکەی دەگۆڕی جوولەیەکی زۆر ناشیانەی ئەنجام دا، کە لەگەل ئەو کارەی دەبوا ئەنجامی بدابا هیچ پەیوەندییەکی جەستەیی نەبوو، بەهۆی ئەو جوولەیەوە، ئینجا بەسەر زەویدا کەوت و بوو بە پێنج یان شەش پارچەوە، بەلام ئەو پیاوێک بوو زاڵ بوو بەسەر هەموو ئەندامی لەشیدا و ڕێژەی ئەو شتومەکانەی تا ئەو کات شکابوون لە ڕێژەی پەنجەکانی دەست زیاتر نەبوو. سەیر لەوەدایە ئەو ڕووداوە سبەی شەوێک ڕووی دا کە چەند هاوڕێیەکی بۆ نانی شەو دەعوەت کردبوو و بۆ ئەو میوانییەیش پاش دوودڵییەکی زۆر بڕیاری دابوو ئینجانە پڕ لە گولەکەی لەسەر مێزی هۆلی نانخواردنەکە دابنێت. ئەو چەند خولەکێک پێش شکاندنی ئینجانەکە بە بیری هاتبووەوە ئەوە لەسەر مێزی نانخواردنەکە دابنێت و ڕۆیشتبوو بۆ هۆلی نانخواردنەکە، تا ئینجانەکە بۆ شوێنی هەمیشەیی واتە میوانخانەکە بگەڕێنێتەوە.

کاتێک یەکەمین چرکەکانی شلەژاوی تێپەڕ بوو، پزیشک دەستی کرد بە کۆکردنەوەی پارچەی ئینجانەکە، ئەوانەی لە پاڵ یەک دانا و تێگەیشت دەتوانێت ئینجانەکە بەبێ درزی دیاریکراو چاک بکاتەوە، بەلام لەگەل ئەوەی گەیشتە ئەو ئەنجامە دوو یان سێ پارچە لە گەورەترین پارچەکان لە دەستی خلیسکا و بەسەر زەوییەکەدا کەوت و ئەمجارەیان بە تەواوی ورد بوو، بۆیە ئیتر هیچ ئومێدێک نەما بۆ چاککردنەوەی ئینجانەکە.

بێگومان هاندەری ئەو هەڵە ڕەفتارییەی پزیشک ئارەزووی ئێستاکەی بوو بۆ وەرگرتنی ئاسان و ساکاری حەقی زەحمەتەکەی، چونکە لەو

ڕووەوە ئەو شتەی بە ناحەق ببووە خاوەنی لەناوی دەبرد. ئینجانەیەکی دەشکاند کە لەمپەڕ بوو لە بەردەم ئەوەی کە حەقی زەحمەتەکەی وەرنەگرتبوو -بنەماڵەی ئەو ژنەیش نارەزایەتییان لەسەری هەبوو-.

بەڵام جیا لە ناچارگەرایی ڕاستەوخۆ هەڵە ڕەفتارییەکەی هاندەرێکی تری هەبوو کە لە بواری دەروونیشکارییەوە گرنگتر و قووڵتر بوو. ئەو کارە پەرەسەندنێک بوو لە ناچارگەرایی سومبولیکی، چونکە ئینجانە سومبولی تەواوی "ژن"ە. قارەمانی ئەو چیرۆکە خێزاندار بوو و هاوسەرێکی جوان و گەنجی هەبووە و ئەوی زۆر خۆش ویستووە، بەڵام هاوسەرەکەی لە دۆخێکی زۆر خراپدا مردبوو. پاش ئەو کارەساتە ناخۆشە، مێردەکەی تووشی هیلاکییەکی دەروونی قووڵ ببوو کە بەهۆی هەستکردن بە تاوانەوە زۆر دەکرا، چونکە ئەو خۆی بە بەرپرسی مەرگی هاوسەرەکەی دەزانی (من ئینجانەیەکی جوانم شکاندووە). لەوە بە دواوە لە ژنەکان دوورەپەرێزی دەکرد و ملی نەدەدا بە دیسان هاوسەرگیری و پەیوەندیی خۆشەویستی، هەروەها ویژدانی نەستی ئەو کارانەی بە شێوەی جۆرێک بێوەفایی بەرامبەر بە هاوسەری کۆچکردوو و خۆشەویستی دەردەخست، بەڵام ویژدانی نەستی بەم هۆیەوە چاوپۆشی لە هاوسەرگیری و پەیوەندی ئاشقانە دەکرد کە گوایە ئەو بۆ ژنان شوومی خراپە و نالەبارە و نایەوێت ژنێکی تریش لەبەر ئەو خۆی بکوژێت و ئەمانە و... ( هەروەک دەبینین ئەو نەیدەتوانی بۆ ماوەیەک پارێزگاری لە گوڵدان بکات).

لێرەدا لەبەر ئەوەی مایەی ژینی ئەو بەهێز و کۆکراوە بوو، سەیر نەبوو کە پزیشکەکە پەوەندی کاتی هەڵدەبژێرێت. (بوون بە خاوەنی گوڵدانێک، کە موڵکی کەسێکی ترە، گوزارشت لەم خاڵە دەکات).

دوو ڕووداوی دوایی، جەختکردنەوەیەکی سەرنجڕاکێشە بۆ سەر

شیکردنەوەی نیشاندەر.

هەر قارەمانی ئەم ڕووداوە بۆ چارەسەری دەروون ئازارییەکەی ملکەچی دەرمانی دەروونشیکاری بوو. لە درێژەی دانیشتنی دەروونشیکاریدا، کاتێک کە باسی دەکرد چۆن گوڵدانە گڵێنەکەی شکاندووە، دووبارە کەوتەوە سەر باسکردنی ڕەفتاری خۆی لەگەڵ ژناندا و بانگەشەی کرد کە لەڕادەبەدەر و بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر پەسەندکردنی شتێک لای زەحمەتە. بۆ نموونە چاوەڕوانی دەکات کە جوانی ژنان حۆریئاسا بێت (قسەی ئەو ڕێک بەم جۆرە بوو: هیچ شتێکی لە خاک نەبێت). ئەو هەروەها دانی بەوەدا دەنا کە هێشتا گرێدراوی هاوسەرەکەیەتی (کە کۆچی دوایی کردبوو و لەسەر ئەو بنەمایە سیفەتی جەستەیی و خاکی نەبوو)، هیچ بەهایەک بە جوانی "ئەم جیهانە"ی ژنان نادات. هەر لەبەر ئەوەیش بوو کە گوڵدانە گڵێنەکەی لەناو بردبوو. کاتێک کە ئەو پیاوە چووە قۆناغی گواستنەوەوە، لە خەیاڵی خۆیدا نەخشەی ئەوەی داڕشت کە لەگەڵ کچی دکتۆرەکەی هاوسەرگیری بکات. گوڵدانێکی بە دیاری دا بە دکتۆرەکە، وەک بڵێی دەیویست نیشانی بدات کە چۆن دەیەوێت ڕووداوێکی ناخۆش کە بەسەری هاتووە، قەرەبوو بکاتەوە. ئەمە وەک هەڵەیەکی ڕەفتاری دەتوانێت بە لەبەرچاوگرتنی هەندێک وردەکاری تر، چەندین چەمکی نیشانەیی جیاواز لەخۆ بگرێت. بۆ نموونە دوودڵی دکتۆرەکە لە ئاودانی گوڵدانەکە و... هتد، بەڵام ئەوەی بە ڕای من سەرنجڕاکێشترە هەبوونی چەند مەیلێک، یان بە لایەنی کەمەوە دوو مەیلە کە لە ویژدانی نیوە بە ئاگا و نەستەوە سەرچاوە دەگرێت. لەوانەیە شیکردنەوەی واقیعی ئەوە بێت کە وا دابنێین هەر کامێک لەم مەیلانە بەجیا کار دەکات و ڕەنگدانەوەیان لە دوو لایەنی هەڵەی ڕەفتاریدا هەبووە: سەرەونخونکردنی گوڵدان و فڕێدانی لەتەکانی لەسەر زەوی.

٥- وا دەردەکەوێت کە فڕێدان، سەرەونخونکردن و تێکدانی کەلوپەلەکان زۆرتر بۆ گوزارەکردنی زنجیرە فکرێکی هەستیار بەکار دەهێنرێت. هەندێک جار دەتوانرێ بە هاوکاری لێکدانەوە لەو بابەتە دڵنیا ببینەوە، بەڵام زیاتر بە پشتبەستن بە شیکارییە گشتییەکان، خورافات یان گاڵتەجارێش بەم ئەنجامە بگەین. تێدەگەین کە لە سەرەونخونکردنی خوێدان یان ڕژاندنی پەرداخێک ئاو یان کەوتنی چەقۆ بەسەر زەویدا کە بە نووکەوە لە زەوییەکە بدات و... هتد، چ لێکدانەوەیەکی گشتگیر لە ئارادایە. من لە بەشەکانی تری کتێبەکەدا پێشانتان دەدەم ئەم جۆرە لێکدانەوە خورافیانە تا چ ڕادەیەک دەبێ بە هەند وەربگیرێت. لێرەدا تەنها باس لەو خاڵە دەکەین کە کردارێکی ناشیانە لە هەموو بوارەکاندا چەمکێکی یەکسانی نییە بە سەرنجدان لەسەر باروذۆخ دەکەوێتە خزمەتی دەربڕینی ئەم مەبەستە یان ئەو ئامانجەوە.

ماوەیەک لەمەوپێش بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لە ماڵی ئێمەدا قاپوقاچاغ و پەرداخی چینی زۆر دەشکا، منیش تاڕادەیەک پشکم هەبوو لە شکاندنیاندا، بەڵام نەمدەتوانی ئەم نەخۆشییە دەروون ئازارە شرۆڤە بکەم، لەو کاتەدا تەنها چەند ڕۆژێک مابوو لە نزیکبوونەوەی مەراسیمی زەماوەندی کچە گەورەکەم و لە وەها باروذۆخێکی گرنگدا خوومان بەوەوە گرتبوو شتومەکێکی شیشەیی یان چینی بشکێنین و لە هەمان کاتدا بۆ بووک و زاوا هیوای بەختەوەری بخوازین.

ئەم دابونەریتە دەتوانێ بە واتای "پێشکەش بە خواکان"بێت، یان چەمکێکی نموونەی تر لەخۆ بگرێت.

کاتێک خزمەتکارەکان شتومەکی شکاندن لە دەستیان دەکەوێت و دەشکێت، ئێمە خێرا ناگەڕێین بە دوای شرۆڤەکردنی دەروونی هۆکارەکانی ئەم ڕووداوەدا. هەرچەند ڕەنگە ئەو کارانە لانی کەم بە



CamScanner

گوێرەی مەبەستە نادیارەکان ئەنجام بدرێت. مرۆڤی بێکەلتوور هیچ حەز و هیوایەتێکی بەرامبەر بە هونەر و ئاسەواری هونەری نییە. خزمەتکارەکان بایەخی بەرهەمی هونەری نازانن و بەرامبەر بەم بەرهەمانە رقێکی توند لە دڵیاندا دروست دەبێت، بە تایبەت کاتێک بوونی ئەم بەرهەمانە هانیان دەدات بۆ ئەنجامدانی کاری زیاتر و جوانکاری. بە پێچەوانەوە خزمەتکاری دامەزراوە زانستییەکان لە حاڵێکدا پەیوەندە بە هەمان توێژەوە و هەمان کەلتوور لەخۆ دەگرێت، لەکاتی بەکارهێنانی شتومەکی شکاندنیدا کارامەیی و دڵنیاییەکی زیاتر لە خۆ نیشان دەدەن. ئەو کارامەیی و دڵنیابوونەوانە کاتێک بە دەست دێت کە خزمەتکار لەگەڵ بەرپرسەکەیدا وەک یەک بیر بکەنەوە، کە خۆیان بۆ هەمیشە بە گرێدراوی ئەو دامەزراوە بزانن کە تیایدا کار دەکەن.

لێرەدا باس لەسەر پسپۆرێکی گەنج دەکەم کە زانستێکی خستوتە بەر دەستم، ئەم نموونەیە میکانیزمێک ئاشکرا دەکات کە لە تێکدانی شتومەکێکدا رۆڵی سەرەکی هەبووە.

"من و چەند کەس لە هاوکارەکانم تایبەت بە خوێندنی باڵا مانگێک لەمەوپێش سەرقاڵی زنجیرە تاقیکردنەوەیەکی زۆر ئاڵۆز بووین لە بارەی [دۆخی نەگۆڕی تەنەکان]ـەوە. خۆبەخش ئەم کارەم قەبووڵ کرد، بەڵام ئەزموونەکان وردە وردە زۆر کاتیان لێ دەگرتین. رۆژێکیان لەگەڵ هاوکارەکەمدا کاک ف. رۆیشتین بۆ تاقیگە، ئەو لە رێگادا وتی: [بە داخەوە ئەمرۆ دەبێ کاتمان زۆر بەفیرۆ بڕوات، چونکە لە ماڵدا کارمان زۆرە] جەختم لەسەر قسەکەی کردەوە لە حاڵێکدا ئاماژەم بە ڕووداوێکی هەفتەی ڕابردوو دەکرد بە گاڵتەوە وتم: [هیوادارم ئەمرۆ ئامێرەکە تێک چووبێت ئینجا دەتوانین پشوو بە خۆمان بدەین و زوو بگەڕێینەوە]. لە کاتی دابەشکردنی کارەکاندا

هاوکارەکەم کاک ف. ئەرکی ڕێکخستنی سوپاپی ئامێرەکەی لە ئەستۆ گرت. واتە دەبوایە سوپاپەکەی بە وریاییەوە بکاتەوە تا شلەی گوشاری گێچی کارەباکە بە خاوی بڕواتە ناو سیلەندەری پەستانی هەڵمەکەوە. بەرپرسی تاقیکردنەوەکان دەبوایە لە پاڵ ئامێری تاقی کردنەوەی پەستانی هەڵمدا ڕاوەستایە و کاتێک پەستانەکە بگەیشتایەتە ئاستێکی باش بە دەنگی بەرز دەیوت: [ڕاوەستە!] کاتێک کاک ف. دەنگی بەرپرسەکەی بیست، سوپاپەکەی گرت و بە تەواوی هێزەوە بەرەو لای چەپ دایسوڕاند -هەموو سوپاپەکان بەبێ جیاوازی لە کاتی سوڕانەوە بۆ لای ڕاست دادەخرێت- لە ئەنجامدا هەموو پەستانی ناو گێچەکە چووە ناو ئامێری پەستانەکەوە، لە ئاستی ڕیزبەندیدا تێپەڕ بوو و بووە هۆی شکاندنی یەکێک لە لەحیمی بۆرییەکان. ئەم ڕووداوە ئەوەندە زیانبەخش نەبوو، بەڵام ناچار بووین دەست لە کارەکە بەردەین و بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە. سەیر لەوەدایە پاش ماوەیەک کاتێک باسی ئەو ڕووداوەم لەگەڵ کاک ف.دا هێنایە ئارا، ئەو وتی ڕووداوێکی وەهای بە بیر نایەتەوە لە حاڵێکدا ئەو ڕووداوەم بە باشی بە بیر دەهاتەوە.

کەوتن و خلیسکاندن و لەتردان و... هتد لە ڕیزی ئەو ڕووداوانەدان کە بەردەوام سەرچاوەیان ناگەڕێتەوە بۆ کەموکورتی بەرێکەوت و کاتی کارکردنی ئەندامانی جووڵەییمان. هەروەها دووجۆربوونی چەمکی ئەو دەستەواژانە لە زماندا پیشان دەدات کە چ بیرکردنەوەیەک لە پشت ئەم وشانەدا حەشار دراوە کە تێکچوونی هاوسەنگی جەستەیی دەتوانێ ئاشکرایان بکات. من چەند بوارێکی جیا جیا لە نەخۆشییە دەروونییە بێبایەخەکانم بە بیر دێت کە لە ژنان و کچانی گەنجدا بە دوای ڕووخانی جەستەییان بەبێ هیچ جۆرە شکستێکی جەستەیی ڕووی داوە. ئەو نەخۆشیانە وەک پەرەسەندنی هیستریای زیانبەخش کە لە ترسەوە دێت دەستنیشان کراوە. من لەو

کاتەدا بۆچوونم وا بوو کە مەسەلەکە بە گشتی وا نەبوو، زنجیرەی ڕووداوەکـان بە شـێوەیەکی تـر ڕووی دابـوو بەزەویـداکەوتن نمـوونەیەک بـوو لە دەروون ئـازاری و دەربڕینـی بیرکردنەوەکـانی نەست کە ناوەڕۆکی سێکسیان هەیە و ئێمە دەبێ لە نێوان هێمای نەخۆشییەکاندا ئەوانە بە خاوەن ڕۆڵی وزەی جووڵەیی دابنێین.

کەسێک کە لە بری دراوێکی برۆنزی یان دراوێکی بچووکی زێوی، دراوێکـی ئـالتوون بە سـوالکەرێک دەدات تووشـی هەڵە دەبێـت. شرۆڤەکردنی ئەم جۆرە هەڵانە ئاسانە. مرۆڤ دەست دەکات بە وەها خۆبەخشییەک تـا نەهامەتییەکانی لە خـۆی دوور بخـاتەوە و دیسـان چارەنووس زەردەخەنەی بۆ بکات و... هتد. کاتێک دایک یان پوور پـێش سـەیرانێک لە بـارەی دۆخـی تەندروسـتی منـداڵەکەیەوە قسـە دەکـات و نیگەرانـی دەردەبڕێـت، دەبینـین لە کـاتی سـەیرانەکەدا بە پـێچەوانەی حەز و ئـارەزوویەوە زۆر دەسـتی ئـاوەڵا بـووە. بە دڵنیاییەوە دەتوانین لە بارەی چەمکی هەڵەی دڵتەزێنی ئەو بۆچوونی خۆمـان دەبـبڕین. بـۆیە هەڵە ڕەفتارییەکانمـان هـۆیەکن تـا وابەسـتەی تەواوی دابونەریتە ئایینی و خورافییەکانی خۆمان بین لە پەنای ئەقڵی ناباوەڕماندا کە لە ویژدانی نەست دوور خراونەتەوە.

٦- بـواری چـالاکییە سێکسـییەکان زیـاتر لە بوارەکـانی تـر بەڵگەیەکی زیاتر بۆ سەلماندنی تایبەتمەندی بە ئەنقەستی جووڵەی هەڵکەوتیمان لە بەردەستدا دەبێت، چونکە لە ڕاستیدا لەم بوارەدا ئەو سنوورەی کە لە بوارەکانی تردا دەتوانێت لە نێوان شتی بە ئەنقەست و بێ ئەنقەسـتدا لە ئـارادا بێـت بە تەواوی لەنـاو دەچێـت. دەتـوانم نمـوونەی کەسـێکی زۆر سـەرنجڕاکێش بـاس بـکەم کە تیایـدا جووڵەیەکی ناشیانە دەکات، کە ڕەنگە وەڵامدەری مەبەستێکی تایبەت بێت.

چەند ساڵ لەمەوبەر لە ماڵی یەکێک لە خزمەکانماندا کچێکی گەنجم بینی ئەو هەست و ئارەزوویەکی لە ناخمدا دروست کرد کە پێم وا بوو ئەو هەستە ماوەیەکی زۆرە لە ناخمدا کوژاوەتەوە. لەگەڵیدا شاد بووم و بە جوانی قسەم دەکرد و بەئەدەب بووم و سەرەڕای ئەوەیش هەر ئەم کچە ساڵێک لەوەپێش هیچ حەزێکی لە مندا دروست نەکردبوو. کەواتە حەز و ئارەزووی من بەرامبەر بەو لە کوێوە سەرچاوەی دەگرت؟ هۆی ئەو کارە ئەوە بوو، کە ساڵی پار کاتێک لەگەڵیدا تەنها بووم، مامی کە پیاوێکی پیر بوو هاتە ناو ژوورەکەوە. کاتێک تێگەیشتین ئەو هاتۆتە ناو ژوورەکەوە هەردووکمان بەرەو لای قەنەفەیەک بەڕێ کەوتین کە لە سووچی ژوورەکەدا بوو تا پێی ڕابگەیەنین کە لەسەر قەنەفەکە دابنیشێت. کچە گەنجەکە زیرەکتر و جیا لەوەیش لە قەنەفەکەوە نزیکتر بوو، لەم ڕووەوە زووتر توانی بگاتە قەنەفەکە و بەرزی بکاتەوە، چونکە قەنەفەکە بەری لە دیوارەکە بوو. من بۆ یارمەتیدانی چوومە نزیکی و بەبێ ئەوەی تێبگەم ئەو کارەم چۆن ئەنجام دا لە چرکەیەکدا خۆم لە پشتیەوە بینی و قۆڵی خۆمم بینی کە لە جەستەی ئاڵا بوو. پێویست بە شرۆڤەکردن ناکات کە خێرا دۆخەکەم گۆڕی و هیچ کەس تێنەگەیشت چەندە ژیرانە کەڵکم لە جووڵەیەکی ناشیانە وەرگرت.

زۆر جار ڕوو دەدات لە شەقامێکدا کە دوو ڕێبوار لە دوو ڕێڕەوی پێچەوانەوە ڕووبەڕووی یەک دەبنەوە بۆ ئەوەی بەر یەک نەکەون و ڕێگا بە یەکتر بدەن بۆ چەند چرکەیەک هەنگاوەکان چەواشە دەکەن و هەردووکیان بە یەکەوە بە یەک ئاڕاستەدا هەنگاوێک بۆ لای ڕاست و هەندێک جار بۆ لای چەپ دەنێنەوە و لە ئاکامدا ڕووبەڕووی یەک ڕادەوەستن. ئەم جووڵانە دۆخێکی ناخۆش و بێزارکەر دێنێتە ئاراوە و زۆر جار هەموو کەس ئەو دۆخە بە دەرەنجامی ناشیانەی خۆنەویستی دادەنێت، بەڵام دەکرێ بسەلمێنرێت لە زۆر بواردا ئەو



CamScanner

جۆرە ناشێتییە مەبەستی سێکسی بشارێتەوە و ڕەفتاری نالەبار و شەرخوازانەی گەنجانە بەرامبەر بە بەساڵاچوان پەرچ دەداتەوە. من بەو شیکارییانەی لەسەر نەخۆشە دەروون ئازارەکان ئەنجامم داوە تێدەگەم کە ساویلکەیی گەنجەکان و منداڵان تەنها ڕواڵەتێکی هەڵخەڵەتێنەرە کە مۆڵەتیان دەدات بەبێ ئەوەی هەست بە نیگەرانی بکەن زۆر کاری ناشیرین ئەنجام بدەن، یان قسەی سووک بێننە سەر زمان.

کاک و. ئەشتیکەل هەندێک لەم بوارانەی لە بارەی خۆیەوە گێڕاوەتەوە:

"چوومەماڵەوە و دەستی ڕاستم بۆ تەوقەکردن بۆ لای هاوسەرەکەم ڕاکێشا. لە هەمان کاتدا بەبێ ئەوەی بزانم بە دەستی چەپم گرێی خاولی حەمامەکەی کە لە ناوقەدی بەستبووی کردمەوە. دڵنیام کە هیچ مەبەستێکی خراپم نەبوو، سەرەڕای ئەوەیش ئەو جووڵە ناشیانەم بە کارامەییەکی سیحربازانەوە ئەنجام دا".

من پێشتر نموونەی جۆراوجۆری لەم شێوەیەم باس کرد، کە پیشاندەری ئەوە بوو کە شاعیران و نووسەران وەک ئێمەی دەروونشیکاران هەڵە ڕەفتارییەکان دەگەڕێننەوە بۆ چەمک و مەبەستێک، بۆیە سەیر نییە ئەگەر لێرەدا دیسانەوە تێبینی بکەین لەسەر ئەوەی کە نووسەرێک وەک (تیۆدۆر فونتان) چەمکێکی قووڵ دەبەخشێتە جووڵەیەکی ناشیانە و ئەوە دەکاتە ئامرازێک بۆ ئاماژەپێدانی کارەساتەکانی دوایی چیرۆکەکەی. بەتایبەتی لە بەشی لای خوارەوەدا کە باس لە ڕۆمانی "خیانەت"ی ئەو دەکەین.

"ملانی لە ناکاو هەستا و بە هێمای ماڵئاواییکردن لە هاوسەرەکەی، تۆپێکی گەورەی بۆ لای مێردەکەی فڕێ دا، بەڵام بە باشی نەیپێکا و تۆپەکە لای دا و ڕێبەهێن تۆپەکەی گرتەوە." لە گەڕانەوەی لە

گەشـــتەکەیدا کە لەو مـــاوەیەدا ڕووداوێکـــی کەم بـــایەخ ڕووی دا، وتووێژێـک لە نێـوان ملانـی و ڕێبهـێن دەسـتی پـێ کـرد کە ئـێمە هەستمان بە یەکەمین هێماکانی مەیلی ڕوولەزیادبوونی ئەوان دەکرد.

ئەو حەز و ئـارەزووە وردە وردە بـوو بە ئەشـقێکی بەگـڕوتین کە ملانی لە ئاکامدا مێردەکەی جێ هێشت تـا لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بژی٭. (لە ڕاپۆرتی د. ساکس)دا هاتووە.

٧- دەرئەنجامی بەدەستهاتوو لە هەڵە ڕەفتارییەکانی کەسانی ئاسایی زۆر جار زیان و مەترسی لە ئارادا نییە. زانینی ئەم مەسەلەیە سەیر نییە کە ئایا دەتوانرێت هەڵە ڕەفتارییەکان گرنگتر و شایستەتر دەرەنجامێکی دڵتەزێن بێنێتە کایەوە، کە لەگەڵ ڕوانگەی ئێمەدا پێوانە بکرێت؟ بۆ نموونە ئایا هەڵەی پزیشکەکان یان دەرمانسازەکان لە هەندێ بواردا دەکرێ چەمکێکی لەم شێوەیە بێت؟

چونکە بە دەگمەن چارەسەری پزیشکی دەکەم، تەنها دەتوانن یەک نمـوونە لە هەڵەی پزیشـکی ئەزموونەکـانم بگێـڕمەوە. چەنـد سـاڵ لەمەوپـێش دوو جـار لە ڕۆژێکدا ڕۆیشـتم بـۆ بینینـی ژنێکـی پیـر و چاوپێکەوتنەکەیش لە کاتی بەیانیدا بوو، شێوەی چارەسەری پزیشکی من بە دوو شێوە بوو:

چەند دڵۆپ دەرمانی چاوم کردە ناو چاوەکانی و دەرزییەکی مۆرفینم لێ دا. دوو شووشەی دەرمان یەکێکیان ڕەنگی شین بوو کە شلەی دەرمانی چاوی تێدا بوو، ئەوی تر سپی بوو و شلەی مۆرفینی تێدا بوو کە بەردەوام بۆ چاوپێکەوتنی نەخۆشەکان ئامادەیە. کاتێک ئەو دوو کارە ئەنجام دەدەم زۆر جار بیر لە مەسەلەکانی تر دەکەمەوە. لە ڕاستیدا ئەوەندە ئەو کارانەم دووپات کردووەتەوە پێموایە دەتوانم بۆ چەند خولەکێک سەرنجی خۆم بخەمە سەر شتێک، بەڵام ڕۆژێک بەیـانییەکەی تێگەیشـتم دەرزییەکە بە ئاسـانی کـاریگەر نەبـووە: لـە

ڕاستیدا دڵۆپچکێنەکەم لە شووشـەیەکی سـپی کردبـوو و ڕادەیەک شلەی مۆرفینم کردبووە نـاو چاوی پیرەژنەکەوە. پاش چرکەیەک ترس و تۆقین ئارام بوومەوە، لەبەر خۆمەوە وتم بەهەرحاڵ، چەند دڵۆپێک لە شلەی مۆرفین ٢٪ کە بتکێتە ناو چاو ناتوانێت زیانێک بە چاو بگەیەنێت. بە دڵنیاییەوە ترسەکەم سەرچاوەیەکی تری هەیە.

هەوڵـم دا بە کـورتی ئەو هەڵە ڕەفتـارییە شـی بـکەمەوە و خێـرا ئەو ڕستەیەم بە بیر هـاتەوە: "بە پیس دانانی پیرەژنەکە". جۆریەتی ئەو ڕستەیە کورتترین ڕێگای لە بەردەستم دانا بۆ چارەسەری. هێشتا من لەژێر کاریگەری خەوێکدا بووم کە شـەوی ڕابـردوو گەنجێک بـۆی گێـڕامەوە و پێموابـوو دەتـوانم ئەوە بە پشتبەسـتن بە جۆرێـک پەیوەنـدی کە ئەو دەیویسـت لەگـەڵ دایکیـدا دروسـتی بکـات شـی بکەمەوە. مەسەلەی سەیر واتە ئەفسانەی یۆنانی، تەمەنی (ژۆکاست) بە هیچ شێوەیەک لەبەرچاو ناگرێت، بە بۆچوونی من بەو ئەنجامەی خۆم بە دەستم هێنا بوو پێوانەم کرد: لەو خۆشەویستییەی دایک لە کوڕەکەیدا دەیبزوێنێت کەسایەتی ئێستای دایک لەبەرچاو ناگیرێت، بەڵکوو وێنایەک لەوە گرنگە کە کوڕەکەی پاراستووە و دەگەڕێتەوە بـۆ سـاڵانی سـەرەتای منداڵیی. هەنـدێ پەیوەنـدی نەداری لەو جـۆرە کاتێـک دەردەکەوێت کە وێنـای نێوان دوو دەورانـی ژیـان دەکەوێتە گومان و لە ئاکامدا کاتێک بە شێوەی هەست دێتە ئارا بە شـێوەیەکی مسۆگەر دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لەو دوو چاخە و گرێ دەدرێت. من نـوقمی ئەو ئەندێشـانە گەڕامەوە بـۆ مـاڵی نەخۆشـی تەمەن نەوەد سـاڵانەکەم و بێگومـان دەمویسـت تایبەتمەنـدی گشـتی و مرۆیـی ئەفسانەی ئۆدیپ بە شێوەیەک لەبەرچاو بگرم بەو چارەنووسەی کە فاڵگرەکـان دەیخـوێننەوە لە گونجاندنـدا لـوژیکی بێـت، چـونکە خێـرا کارێکی هەڵەم ئەنجام نەدابوو کە "پیرەژنەکە تیایدا بوو بە قوربانی". جێی خۆشحاڵییە کە هەڵەکەم بێ زیان بوو، چونکە لەو دوو هەڵەیەی

ئەگەری تووش بوونیانم هەبوو دڵۆپەی مۆرفینەکە بکەمە چاوی ژنەکە یان دەرمانی چاوەکە وەک دەرزی لە ژێر پێستی بدەم، هەڵەیەکم هەڵبژارد کە مەترسییەک کەمتری هەبوو. نەزانینی خاڵێک دەمێنێتەوە، ئایا دەکرێ ئەو هەڵانەی کە دەتوانن زۆر زیانبەخش بن بە پشتبەستن بە شیکردنەوە مەبەست و ئامانجێکی نەست بدۆزرێتەوە؟

لەو بارەیەوە نموونەی زۆرمان لە بەردەستدا نییە، بۆیە ناچارین پەنا بەرینە بەر تیۆری و پێوانەکان. دەزانین لەو کەسانەی تووشی دەروون ئازارییەکی زۆر دەبن زۆر جار هێمای نەخۆشی بە شێوەیەکی مسۆگەری یەک یان چەند ئەندامی جەستە بە دەستی خودی نەخۆشەکە دەردەکەوێت و هەروەها دەتوانین چاوەڕێی بکەین کە دژایەتی دەروونی ئەنجامەکەی خۆکوشتنی لێ بکەوێتەوە. هەروەها من بینیومە کە ڕۆژی بڵاوکردنەوە نموونەی ڕوونتر کە بەڵگەیەک بخەمە ڕوو بۆ سەلماندنی ئەو تیۆرییە کە زۆربەی ئەو برینانەی بە هەڵکەوت لەم نەخۆشانەدا دەردەکەوێت خۆئازاری بە ئەنقەستە، چونکە ئاراستەی ئەو نەخۆشانە بەرەو لای خۆئازاردان بە شێوەیەکە گوایە دەیانەوێت بە سزای تاوانەکانیان بگەن. ئەم ئاراستەیە کە هەندێ جار بە شێوەی لۆمەکردنی خودی کەسەکە دەردەکەوێت و هەندێ جار یارمەتیدەرە بۆ پێکهاتنی هێمای نەخۆشییەکان، ئینجا بە کارامەییەوە دەتوانێت کەڵک لە بارودۆخە دەرەکییەکان وەربگرێت یان یارمەتیان بدات تا ئەنجامێکی باش، واتە برین یان بڕینەوەی ئەندامێکی لەش بێتە ئاراوە. ئەو ڕووداوانە تەنانەت لە کاتی ئەو دەروونئازاریانەی کە ئازاریان کەمترە دەگمەنن و دەستتێوەردانی مەبەستی نەست بە پێی ژمارەیەک تایبەتمەندی دیاریکراو ئاشکرا دەبێت، لەو ڕووەوە ئەم تایبەتمەندییانە ئارامییەکی سەیریان بەدواوەیە، کە نەخۆش لە کاتی دەرکەوتنی ڕووداوی



CamScanner

ناخۆش و لەپڕدا لە خۆی دەردەبڕێت.
بە تەنیا یەک نموونە لەو ئەزموونە تاکەکەسیانەی بە دەستم هێناوە، باسی لێوە دەکەم: ژنێکی گەنج لە شرۆڤەی وردەکارییەکان باسی لێوە دەکەم: ژنێکی گەنج لە گالیسکەکە کەوتە خوارەوە، ئێسکی قاچی شکا. چەند هەفتەیەک خەواندیان و هەموو کەس سەری سووڕما کە بۆچی هیچ گلەییەک لە ئازار و ڕەنجەکانی ناکات و خوێنساردی خۆی بە تەواوی پاراستووە. ئەم ڕووداوە بۆتە هۆی دەستپێکی دەروون ئازارییەکی درێژخایەن و توند و ژنەکە بە پشتبەستن بە دەروونشیکاری چاک بووەوە. من لە کاتی دەروونشیکاریدا هەندێ زانیاریم لە بارەی بارودۆخی کارەساتەکە و هەروەها هەندێ زانیاریم لە بارەی پێش کارەساتەکەوە لێ وەرگرت. ژنە گەنجەکە لەگەڵ مێردە زۆر بەئیرەییەکەی ڕۆیشتبوون بۆ شوێنێک کە هی خوشکەکەی بوو. خوشکەکەی خێزاندار بوو، چەند خوشک و برایەکی جۆراوجۆری هەبوو کە لەگەڵ مێرد و ژنەکانیاندا هاتبوون بۆ ئەوێ. شەوێکیان ژنە گەنجەکە نمایشێکی خێزانی پێشکەش کرد و ئەو هونەرەی کە بە باشی لێی دەزانی نمایش کرد. هەموو خێزانەکە خۆشحاڵ و شادومان بوون، بەڵام مێردەکەی زۆر نیگەران بوو، ئینجا بە چرپە پێی وت: دیسانەوە هەڵسوکەوتی کچێکی دڵتەڕ لە خۆی بنوێنێت". ئەم ڕستەیە کاریگەری دانا و ژنە گەنجەکە شەوەکەی زۆر لە قەلەقیدا بەسەر برد. کاتێک لەخەو هەستا بڕیاری دابوو سەرلەبەیانی هەمان ڕۆژ ئەو شوێنە بەجێ بهێڵێت، بەڵام دەیویست خۆی ئەسپەکان هەڵبژێرێت، ئەو جووت ئەسپەی هەڵنەبژارد و دوو ئەسپی دیکەی پەسند کرد. ئەو خوشکەی لە هەموویان گەنجتر بوو دەیویست کۆرپەکەی و مامانەکەی سواری گالیسکەکە بکات، بەڵام ژنە گەنجەکە بە شێلکاری ڕووبەڕووی ئەو پێشنیارە ڕاوەستا. لەناو ڕێدا زۆر تووڕە دیار بوو، چەند جار بە گالیسکەچییەکەی وت، وا دیارە ئەسپەکان دەترسن.

کاتێک ئەسپەکان ترسان و زاڵبوون بەسەریاندا دژوار بوو، ژنە گەنجەکە بە ترسەوە لە گالیسکەکە خۆی خستە خوارەوە و قاچێکی شکا، کەچی ئەوانی تر لە گالیسکەکەدا مانەوە و هیچ زیانێکیان پێ نەگەیشت. بە سەرنجدان لە هەموو ئەو وردەکارییانە، ئەگەر دیسان گومان بکەین ئەم کارەساتە پێشتر بەرنامەی بۆ دانراوە دەبێ لانی کەم قبووڵی بکەین رێک لە کاتی خۆیدا رووی دا. گوایە لە راستیدا سزای تاوانێک بوو، چونکە لەو رۆژە بە دواوە نەخۆش لە چەند هەفتەی درێژخایەندا ئیتر نەیدەتوانی نمایشێک بدات.

من بە بیرم نایەت لە دۆخی ئاسایی ژیانمدا خۆمم ئازار دابێت، بەڵام لە بارودۆخی ئاڵۆز و قەلەقهێنەردا ئەو کارە پشتراست ناکاتەوە. کاتێک یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەکەم لەوەی گازی لە زمانی خۆی گرتووە یان پەنجەی خۆی پان کردۆتەوە، گلەیی و سکاڵا دەردەبڕێت، من بەردەوام لێی دەپرسم: "بۆچی ئەو کارەت کرد؟"، بەڵام خۆم پەنجەی گەورەی خۆمم پان کردەوە و کارەساتەکە رۆژێک رووی دا کە یەکێک لە نەخۆشە گەنجەکانم لە کاتی دەروونشیکاریدا پێمی وت -هەڵبەت نابێ قسەکەی ئەو بە هەند وەربگرم- دەیەوێت لەگەڵ کچە گەورەکەمدا هاوسەرگیری بکات، کەچی رێک لەو کاتەدا کچە گەورەکەم لە نەخۆشخانە بوو، دۆخی تەندروستی بووە هۆی نیگەرانی زۆری من.

یەکێک لە کوڕەکانم بە رەفتاری توندوتیژەوە لە بەرامبەر چارەسەرییە پزیشکییەکانمدا خۆڕاگری نیشان دەدا. رۆژێکیان تووشی تووڕەییەکی زۆر بوو، چونکە پێیان وتبوو دەبێ سبەی سەرلەبەیانی لە نەخۆشخانە بخەوێنرێت. تەنانەت کوڕەکەم هەڕەشەی کرد کە وەک ئەو کەسانەی ناویان لە رۆژنامەکاندا هاتووە و خۆیانیان کوشتووە، خۆی دەکوژێت و شەوی هەمان رۆژ

ئاوسانێکی لەسەر سینگی بە من نیشان دا کە بەهۆی کەوتنی بەسەر دەستی دەرگاکەدا وای لێ هاتبوو. کاتێک بە زمانێکی گاڵتەجاڕی لێم پرسی بۆچی ئەو کارەی کردووە و ویستوویەتی چ ئەنجامێک بەدەست بێنێت، ئەو کوڕە پانزە ساڵانە گوایە لە ناکاو مەینییەکی دۆزیوەتەوە، وەڵامی دایەوە: 'بەو شێوەیە کە بەیانی پێیم وتی مەبەستی خۆکوشتنم هەیە'. با بڵێم من هەرگیز لە بەرچاوی منداڵەکانمدا باسی بۆچوونەکانم نەکردووە سەبارەت بە خۆئازاردانی بە ئەنقەست.

ئەگەر بتوانین ئەم دەستەواژەیە 'خۆئازاردانی بە ئەنقەست'، کە دەستەواژەیەکی دژبەرە، بەکار بهێنین، دەبێ بڵێین ئەو کەسانەی ئەو جۆرە خۆئازاردانە بە ڕاستی باوەڕ پێی دەکەن و بە تەواوی ئامادەن ئەو بۆچوونە قبووڵ بکەن، کە بڕوایان وایە لەپاڵ خۆکوشتنی بە ئەنقەست و وریایانەدا جۆرێک خۆکوژی بە ئەنقەستیان هەبووبێت، کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مەبەستی نەست و بە باشی دەتوانێت لەپاڵ کارەساتە ناخۆشەکاندا بیشارێتەوە. جیا لەوەیش ڕەنگە ئەو بوارە زۆر دەگمەن نەبێت، چونکە ئەو کەسانەی دەیانەوێت خۆیان لەناو بەرن زیاتر لەو کەسانەن کە کارەکە جێبەجێ دەکەن. بە گشتی خۆئازاردانی بە ئەنقەست بەرژەوەندییەکە لە نێوان ئەم ئاراستەیە و وزە ناکۆکەکاندا کە دەریدەخات ئەگەر لە هەندێ بواردا خۆکوژی ئەنجام بدرێت، مەیل بۆ ئەو کردارە دەبێت ماوەیەک لەوەوپێش بە سووکەهێزێک، یان بە دۆخێک لە ئاراستەی نەستی سەرکوتکراودا بوونی هەبووبێت.

ئەو کەسانەی بە مەبەستێکی وریاوە دەست بە خۆکوشتن دەکەن، ئامراز و کات و هەلومەرجەکانی خۆیان هەڵدەبژێرن، مەبەستی نەستیش، بەشبەحاڵی خۆی چاوەڕوانی بیانوویەک دەکات، واتە ئەو

بیـانووەی جێگـری بەشـێکە لە هۆکـاری ڕاسـتەقینە و پاشـان بە شڵەژاندنی هێزە ڕاگرەکانی ئەو کەسە ئەو بڕگار بکات لە دەستی ئەو گوشارانەی بەو هۆیە دەخرێتە سەری.

ئەو تێبینیانەی لێرەدا کردوومە، پووچ و بێ مانا نییە. زۆربەی ئەو ڕووداوانەی ناخۆش دیارن -وەک کەوتن لەسەر گالیسکە یان لەسەر ئەسپ- کاتێک لە نزیکەوە بە سەرنجدان لە باروودۆخە بەرچاوەکان شی دەکرێنەوە، تیۆری خۆکوشتنی ئەنقەست و پەستنکراو بە کارێکی ئاسایی دادەنێن. بۆ نموونەیە بەم شێوەیە بوو کە ئەفسەرێک لە کاتی پێشبڕکێی ئەسپسواریدا لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و ئەوەندە بریندار بوو کە پاش چەند ڕۆژێک گیانی لەدەست دا و مرد. ڕەفتاری ئەو پاش بەهۆشهاتنەوە زۆر سەیر بوو، بەلام پێش کەوتنە خوارەوە لە ئەسپەکە سەیرتر بوو. ئەو ئەفسەرە پاش مردنی دایکی کە بە لایەوە زۆر خۆشەویست بوو، تووشی خەمۆکییەکی زۆر ببوو، زۆر جار تەنانەت لەناو هاوڕێکانیدا لەپڕ هەنیسک دایگرت و دەگریا و دەیویست خزمەتی سەربازی بەجێ بهێڵێت و بڕوات بەشداری لە شەڕدا بکات، واتە ئەو شەڕەی کە لە ڕاستیدا بە لایەوە هەرگیز گرنگ نەبوو بەرەو ئەفریقیا بەڕێ بکەوێت.

ئەو کە سـوارکارێکی زۆر لێهـاتوو بـوو، مـاوەیەک لەمەوبـەریش دوورەپەرێزی دەکرد لە سواربوونی ئەسپ. لە ئاکامدا شەوی پێش پێشبڕکێکە کە چارەیەکی نەبوو جگە لە ئەنجامدانی ئەو کارە، دڵی هەواڵی کارەسـاتێکی ناخۆشـی پێ دەدا. ئێمە بە تێبینی لەسەر ئەو شێوەیەی کە بۆ سەرنجدانی ئەو چەشنە بوارانە هەڵمانبژاردووە هیچ سـەرمان سـووڕ نامێنێـت، کە ئەو پێشـگۆییە ناڵەبـارە بە ئەنجـام گەیشتبێت.

هەنـدێک کەس دەڵـێن: زۆر ئاسـاییە کە پیـاوێکی تووشـبوو بە

خەمۆکییەکی دەروونی نەتوانێت وەک جاران ئەسپەکەی ڕابگرێت. بەڵێ بێگومان، ئەو مەسەلەیە ڕاستە، بەڵام من بە دوای میکانیزمێکدام کە لە مەبەستی خۆ کوشتندا بێت بە پشتبەستن بە دەروون ئازاری جووڵەیەکی ڕاگر دێتە ئاراوە.

کاک س. فرنزی ڕێگەی داوە ئەم شیکردنەوەیەی لای خوارەوە بڵاو بکەمەوە، کە نموونەیەکە لە برینداربوونی بە هەڵکەوت، بەهۆی بەرکەوتنی فیشەکی دەمانچەوە. بە ڕای ئەو ئەم نموونەیە نموونەیەکە لە ئاراستەی نەست بۆ خۆکوشتن و من لەم بارەیەوە بە تەواوی لەگەڵیدام.

کاک ی. اد. کرێکاری دارتاشی بوو و تەمەنی ٢٢ ساڵ بوو، ڕۆژی ١٩٠٨/١/١٨ هاتبووە سەردانم. ئەو دەیویست بزانێت ئایا دەکرێ یان پێویستە ئەو فیشەکەی کە لە بەرواری ١٩٠٧/٣/٢٠ـی زایینییەوە لە لاجانگی مابۆوە دەری بهێنن. ئەو هەرگیز هەستی بە هیچ ئازارێک نەدەکرد، تەنها ئازاری دەگمەن و لاواز نەبێت، هەروەها تاقیکردنەوەی بەرچاو هیچ شتێکی ناسروشتی نیشان نەدەدا جگە لە شوێنی برینێکی ڕەش لە ناوچاوانی لای چەپیدا، کە دیار بوو شوێنی فیشەکی دەمانچەیە. لەو ڕووەوە نەشتەرگەرییەکەم بە باش نەزانی. ئینجا کاتێک سەبارەت بە هەلومەرجی کارەساتەکە داوای زانیاریم لێ کرد، نەخۆشەکە وەڵامی دایەوە کە مەسەلەکە زۆر بە هەڵکەوت بووە: ئەو بە دەمانچەی براکەی یاری دەکرد، چونکە وا بیری دەکردە دەمانچەکە بەتاڵە، بە دەستی چەپ ناویەتە سەر ناوچاوانی لای چەپیەوە ـئەو پیاوە چەپلەر بووە- پەنجەی خۆی لەسەر پەلەپیتکەکە داناوە و فیشەکەکە دەرچووە.

دەمانچەکە کە دەکرا شەش فیشەکی تێبخەیت، تەنها ٣ فیشەکی تێدا بێت. من پرسیم: بە چ مەبەستێک دەمانچەکەت هەڵگرتبوو؟ وەڵامی

دایەوە کە لەو کاتەدا دەبوایە لە بەردەم لیژنەی پزیشکی سەربازیدا ئامادە بوایە و شەوی پێش ئەوە، چونکە دەترسا شەڕێک ڕوو بدات لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ میوانخانە ئەو چەکەی لەگەڵ خۆی بردوو. لە لیژنەی پزیشکیدا بەهۆی تووشبوون بە نەخۆشی واریسەوە لە خزمەتی سەربازی بەخشرابوو و لەو ڕووەوە پەشیمان بوو لەو کارەی کردبووی. گەڕابۆوە بۆ ماڵ و بە دەمانچەکە یاری کردبوو، بەڵام هەرگیز نەیدەویست زیانێک بە خۆی بگەیەنێت، چونکە ئەو کارەساتە ناخۆشە بە هەڵکەوت ڕووی دابوو. من پرسیارم لێ کرد، ئایا لە ڕەوشی خۆی ڕازییە یان نا؟ هەناسەیەکی هەڵکێشا و بەسەرهاتی ئاشقانەی خۆی بۆ باس کردم: ئەو ئاشقی کچێکی گەنج بوو، کە بەشبەحاڵی خۆی خۆشی دەویست و سەرەڕای ئەوەیش بەجێی هێشتبوو و ڕۆیشتبوو بۆ ئەمریکا کە پارە پەیدا بکات. کرێکارە گەنجەکە دەیویست بەدوای کچە گەنجەکەدا بڕوات بۆ ئەو وڵاتە، بەڵام باوک و دایکی دژایەتیان نیشان دەدا. کچە گەنجەکە ڕۆژی ١٩٠٧/١/٢٠ واتە دوو مانگ پێش ئەو ڕووداوە چووبووە ئەمریکا و وێڕای هەموو ئەم وردەکارییانە، کە ناوەڕۆکیان دەبوایە مەسەلەکەی تێگەیاندبا، نەخۆشەکە پێداگر بوو لەسەر ئەوەی کە ڕووداوەکە وەک ڕێکەوت لە قەڵەم بدات، بەڵام من بڕوای تەواوم هەیە کە ئەو بە هۆکاری دەروونی فەرامۆشی کردبوو کە لە پڕ یان بەتاڵبوونی چەکەکە دڵنیا بێتەوە و بەم شێوەیە تووشی خۆئازاردانێکی بە ئەنقەست ببوو. ئەو لە کاتی کارەساتەکەدا هێشتایش لەژێر کاریگەری خەمۆکیدا بوو کە سەرچاوەکەی ئەو داستانە ئاشقانەیە بوو کە بێ ئەنجام مابوو، بێگومان ئومێدی هەبوو بەوەی کە ئەشقەکەی لە سەربازگە فەرامۆش بکات، بەڵام کاتێک کە خۆی بە ناچار بینی کە دەبێ چاوپۆشی لەو ئومێدەیش بکات، دەستی کرد بە یاریکردن بە دەمانچەکە و بە واتایەکی تر هەڵسا بە

خۆکوشتنێکی خۆ نەویست. ئەو دەمانچەکەی نەک بە دەستی ڕاست، بەڵکوو بە دەستی چەپ گرتووە و ئەم خاڵە نیشانمان دەدات کە تەنیا مەبەستی یاریکردن بوو، واتە مەبەستی خۆکوشتنی هەرگیز لە ڕووی ئەنقەستەوە نەبوو.

ئەمەیش لێکدانەوەیەکی تر کە ئامادەبوویەکی ڕووداوەکە بۆمی گێڕاوەتەوە. لێرەیشدا بابەتی خۆئازاردانی بە ئەنقەست، بەڵام لە ڕواڵەتدا بە هەڵکەوت، دەخرێتە ڕوو و بابەتی ئەم لێکدانەوەیە دەمانخاتەوە یادی ئەو پەندە: "چاڵهەڵکەن، لە ئاکامدا دەکەوێتە ناو چاڵەوە."

خاتوو X، لە توێژێکی تێر و بورژوایی بوو، شووی کردووە و خاوەنی سێ منداڵ بوو. ئەو گەرچی توورە دیار بوو، بەڵام هەرگیز پێویستی بە چارەسەری دەروونی نەبوو و خۆی تاڕادەیەکی باش لەگەڵ هەلومەرجی ژیان گونجاندبوو، بەڵام ڕۆژێک، کەوتە داوی کارەساتێکەوە کە لە ئەنجامدا دەموچاوی، بۆ ماوەیەکی کورت، بە شێوەیەکی دڵتەزێن زیانی بەرکەوت. لە شەقامێکدا کە کاری تێدا دەکرد، پێی خلیسکا، ژنەکە کەوتە سەر کۆمەڵە بەردێک و دەموچاوی بەر دیوار کەوت. پاشان لە ڕەوشێکدا کە دەموچاوی بە گشتی بریندار ببوو گەڕایەوە بۆ ماڵ، پشتچاوی ئاوسا و مۆر ببوو و لەبەر ئەوەی ڕەوشی چاوەکانی دەبووە هۆی نیگەرانی، داوای پزیشکێکی کرد. من، دوای ئەوەی کە دڵنیام کردەوە، پرسیم: "بەڵام چۆن بوو کە بەو شێوەیە کەوتیتە سەر زەوی؟"، جوابی دایەوە کە چەند ڕۆژ لەمەوبەر، بە مێردەکەی وتبوو لە کاتی پەڕینەوە لە جادەدا ئاگادار بێت، چونکە مێردەکەی تووشی نەخۆشی جومگە ببوو و قاچەکانی توندوتۆڵ نەبوون. ئەو ژنە پێشتریش چەند جارێک ئاگاداری ئەو مەسەلە سەیروسەمەرەیە بوو، کە کاتێک خەڵک لە مەترسییەک

ئاگادار دەکاتەوە، خودی خۆی دەکەوێتە داوی ڕووداوەکەوە. ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ من بەس نەبوو. کەوا بوو لێم پرسی: ئایا نایەوێت بابەتێکی ترم سەبارەت بە ڕووداوەکە بۆ باس بکات؟ ئینجا بە بیری هاتەوە، کە ڕێک بەر لە ڕووداوەکە، لە دوکانێک کە بەرامبەر ماڵەکەیان بوو تابلۆیەکی جوانی بینیوە و بە خۆی وتبوو کە ئەو تابلۆیە دەتوانێ ژووری منداڵەکانی بە جوانی بڕازێنێتەوە و بڕیاری کڕینی دابوو. کەوا بوو لە ماڵ دەرکەوتووە، بەبێ ئەوەی سەرنج بداتە سەر شەقام، ڕاستەوخۆ بەرەو دوکانەکە ڕۆیشتووە، پێی لەسەر چاڵێک خلیسکا بوو و بەبێ ئەوەی کە بە درێژکردنی دەستەکانی بچووکترین هەوڵی ئەوە بدات کە بە دەموچاودا نەکەوێت، ڕێک بەسەر دیوارەکەدا کەوتبوو. نەخشەی کڕینی تابلۆکەی یەکسەر فەرامۆش کردبوو و بەپەلە گەڕابووەوە بۆ ماڵەوە.

من لێم پرسی: بۆچی زیاتر وریا نەبوویت؟

وەڵامی دایەوە: لەوانەیە مەسەلەی سزاکارییەک بێت، سزادانی کرداری کە پێشتر بە نهێنی بۆم باس کردبووی.

- کەوا بوو ئەو ڕووداوە هێشتایش تووشی ئازار و نیگەرانیتان دەکات؟

- بەڵێ، من لە پاش ئەو ڕووداوەوە زۆر پەشیمان بوومەوە و خۆم بە ژنێکی نارەسەن، خراپکار و سەبارەت بە پێوانە ڕەوشتییەکان خەمسار دەزانی، بەڵام بەر لەوەیش ئەوەندە تووڕە بووم کە خەریک بوو شێت بم.

بەسەرهاتێک کە ژنە گەنجەکە ئاماژەی پێ دەکرد، بەسەرهاتی لەبارچوونی کۆرپەکەی بوو. کاتێک کە زانی بۆ جاری چوارەم دووگیان بووە، وێڕای گرفتە داراییەکان و نەگونجانی خانەوادە، بە

ڕەزامەندی هاوسەرەکەی چوو بۆ لای کەسێکی ناشارەزا و کۆتایی بە ڕەوشی دووگیانی خۆی هێنا -کۆرپەکەی لەبار برد- بەڵام ئەنجامی ئەو کارە دەستێوەردانی پزیشکێکی پسپۆری لێ کەوتەوە.

ئەو وتی: من خۆم بە تاوانبار دەزانم، چونکە بوومە هۆی مەرگی منداڵەکەم و فیکری ئەوەی کە وەها جەنایەتێک لەوانەیە کارەساتی بەدواوە بێت، دەبێتە هۆی دڵەڕاوکێ لای من. بەڵام ئێستا کە ئێوە دڵنیاتان کردمەوە کە هیچ مەترسییەک لەسەر چاوەکانم نییە، هێور بوومەوە. بەپێی پێویست سزاکەم چێشت.

کەوا بوو ئەو ڕووداوە تەنیا سزادانێک بوو، کە نەخۆش لە بەرامبەر ئەو تاوانەی کە کردبووی بۆ خۆی دانابوو و لەوانەیە لە هەمان کاتدا هۆیەک بووبێت تا ئەو لە سزایەکی نادیار و قورستر، کە چەند مانگێک پێش ئەوە لێی دەترسا، بپارێزێت. کاتێک کە بەپەلە بۆ کڕینی تابلۆ بەرەو دوکانەکە دەچوو، مەسەلەی لەبارچوونی کۆرپە بە هەموو ئەو ترسانەی کە لای دروست ببوو، کە پێدەچێت لە ویژدانی نەستیدا زۆر چالاک بووبێ، چونکە هەر کات کە بیتوانیبایە بە مێردەکەی ڕادەسپارد تا پێی دەکرێت لە کاتی پەڕینەوە لەو شەقامە ئاگادار بێت، بە خێراییەکی تایبەتی لە نێوان بیرەوەرییەکانیدا زیندوو بۆتەوە و باسکردنی تاڕادەیەک بەم جۆرە بووە: "چ پێویستییەکت بە ڕازاندنەوەی ژووری منداڵەکان هەیە؟ تۆ کە خۆت یەک لە منداڵەکانت کوشتووە! تۆ تاوانباری و سزایەکی قورس چاوەڕێت دەکات."

ئەو ئەم بیرکردنەوەیە، بەبێ ئەوەی کە بە شێوەی هەستێک لای دروست بێت، لە ساتێکدا کە من بە (ساتی دەروونی) ناوی دەبەم، کردبووی بە بیانوو تا بەبێ ئەوەی کە کەسێک لە مەبەستی ئاگادار بێتەوە، کەڵکی لەو خاکە هەڵڕێژراوە وەرگرت کە بە ڕای ئەو بۆ پێکاندنی ئامانج زۆر گونجاو بوو. ئەم وردەکاریانە نیشانی دەدات کە

بۆچی ئەو ژنە بیری لەوە نەکردبووەوە لە کاتی کەوتندا دەستەکانی بەرێتە پێش و نەهێڵێت دەموچاوی بەر دیوارەکە بکەوێت. ئەو کاتە ڕوودانی کەوتنەکەی نەبیوو بە مایەی سەرسوڕمانی. ئێمە بۆ ئەم ڕووداوە دەتوانین هۆکارێکی تریش بدۆزینەوە کە لەوانەیە کەم بایەختر بێت: ئەو ژنە مەیلێکی خۆنەویستیشی هەبوو سەبارەت بە سزادانی مێردەکەی، چونکە ئەو لە بەسەرهاتی لەبارچوونی کۆرپەکەدا پشکی هەبوو و ئینجا لەسەر یەک پێی ڕادەسپارد بە وریاییەوە لە شەقام بپەڕێتەوە، کەچی مێردەکەی بەهۆی لاوازی قاچییەوە، بەردەوام بە وریایی تەواوەوە هەنگاوی دەنا و ئەم ئاگادارکردنەوەیە زۆر نابەجێ بوو. ئەگەر هەلومەرجی ڕووداوی لای خوارەوە لە نزیکەوە سەیر بکەین، هۆگرییەک لامان دروست دەبێت تا بڵێین کە کاک (اشترکە) هەقیەتی سووتانی لە ڕواڵەت بە هەڵکەوت کە لە خوارەوە ئاماژەی پێ دراوە بە چەشنێک "قوربانی" لە قەڵەم بدات.

"خانمێک کە زاواکەی بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی سەربازی بانگهێشت کردبوو، دەبوایە بڕۆیشتبا بۆ ئەڵمانیا کە وەک هەلومەرجی لای خوارەوە کە ئێستا باسی دەکەین قاچی سووتا. کاتی زاوزێکردنی کچەکەی نزیک بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە کاتی شەڕدا لەبەرچاوگرتنی هەندێک پارێز پێویستە، لە ماڵەوە هیچ شادی و خۆشحاڵییەک لە ئارادا نەبوو. ئەو خانمە شەوی پێش ڕۆیشتنی زاواکەی ئەو و کچەکەی دەعوەت کردبوو بۆ نانی شەو. ڕۆیشتە ناو چێشتخانەکە تا نانی شەو ئامادە بکات، بەڵام بە پێچەوانەی ئەو کارانەی کە جاران دەیکرد لە بری ئەوەی ئەو نەعلانەی کە لە چەرم دروست کرابوو بەردەوام لە ماڵەوە لە پێی دەکرد و پێی تیایدا ئاسوودە بوو، بەڵام ئەمجارەیان نەعلێکی زۆر ئاوەڵا و ناشیرینی مێردەکەی لە پێ کرد. کاتێک مەنجەڵە گەورەکەی کە پڕ بوو لە سوپ هەڵدەگرت مەنجەڵەکە لە دەستی دەکەوتە خوارەوە و قاچی سووتاند

به تایبەت لەپی پێی. پێویست بە شرۆڤەکردن ناکات، کە هەموو ئەم ڕووداوانە سەرچاوەکەی دەگەڕێتە بۆ توورەبوون. لە ڕۆژانی یەکەمی پاش "قوربانی بوون" خانمی ناوبراو بە پارێزێکی تەواوەوە دەستی بۆ شتە گەرمەکان دەبرد و سەرەڕای هەموو ئەم پارێزانەیش نەیتوانی خۆی بپارێزێت لە دیسان سووتانەوەی دەستی بە ساسێکی زۆر گەرم".

ئەگەر ئەم ناشیبوونە بە هەڵکەوت و کەموکورتە جووڵەییانە، دەتوانن ببنە هۆی ئەوەی کە خەڵک بەو شێوازە توورەییان بەرامبەر بە جەستە و ژیان خۆیان دەربڕن، کەواتە هەر ئەوەندەی بەسە هەنگاوێکی زیاتر هەڵێنین تا هەڵسەنگاندنێکی بەم شێوەیە بدەینە پاڵ ڕەفتارێکی هەڵە، کە ژیان و تەندروستی کەسانی تر دەخاتە مەترسییەوە. چەند نموونەیەکی تر کە دەتوانین بۆ جەختکردنەوە لەسەر ئەم تیۆرییە بخەینە بەردەست لە هەندێ ئەزموونەوە وەرگیراوە، کە لە ڕەفتاری نەخۆشە دەروون ئازارەکان بە دەستمان هێناوە و لەم ڕووەوە لە چوارچێوەی مەبەستماندا واتە ژیانی ڕۆژانەمان دەردەکەوێت، کەواتە ئەو نموونەیەی بۆ ئەم بوارە دەیهێنمەوە بە کێشمەکێشمێکی دەروونی دەستنیشانم کردووە، هەڵبەت ئەم ئەنجاموەرگرتنە بەهۆی هەڵەیەکی ڕەفتارییەوە نەبوو، بەڵکوو دەکرێ ئەوە بە کردارێکی هێمادار یان بە هەڵکەوت ناوی ببەین.

جارێکیان هەولم دا ژیانی ژنومێردایەتی پیاوێکی زۆر زیرەک ڕزگار بکەم. هاوسەرەکەی ئەوی زۆر خۆش دەویست، بەڵام لێک تێنەگەیشتنەکانی نێوانیان هەرچەند هۆکاری ڕاستەقینەی هەبوو بەڵام ئەو شرۆڤەکردنەی هەموو ئەو لێتێنەگەیشتنانە بەس نەبوو -مێردەکە دانی بەم خاڵەدا دەنا- ئەو بەردەوام بیری لە جیابوونەوە دەکردەوە،

بەڵام چونکە دوو منداڵی وردی هەبوو هەردووکیانی دەپەرست، نەیدەتوانی بڕیارێکی یەکلاییکەرەوە بدات، سەرباڵی ئەمەیش بەبێ ئەوەی هەوڵ بدات کە هەڵگری ئەم بارودۆخە بێت بەردەوام بیری لە جیابوونەوە دەکردەوە. کەمتوانایی ئەو بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشمەکێشمانە بە بۆچوونی من پیشانت دەدات مەبەستی ئەست و دوورخراوەی لە خزمەتی مەبەستی هەستیدایە، کە دژی یەکتر کار دەکەن و لەم جۆرە بووارەدا من هەوڵ دەدەم بە شیکردنەوەی دەروونی کۆتایی بە کێشمەکێشمەکە بێنم. ئەو پیاوە ڕۆژێکیان ڕووداوێکی بچووکی بۆ گێڕامەوە کە بە توندی ببووە هۆی ترس و تۆقینی. ئەو لەگەڵ منداڵە گەورەکەیدا کە خۆشەویستتر بوو، منداڵەکەی هەڵدەدا و دەیگرتەوە و لە چرکەیەکدا لەژێر سورەیایەکی غازیدا ئەوەندە منداڵەکەی بە توندی هەڵدا، کە نزیک بوو سەری بەر سوورەیاکە بکەوێت. نزیک بوو... بەڵام هیچ شتێک ڕووی نەدا. زیانێکیش بەر منداڵەکە نەکەوت، بەڵام لە ترساندا سەری گێژ بوو. باوکی بە ترسێکی زۆرەوە لە شوێنی خۆیدا وشک بوو و منداڵەکەی لە باوەشیدا دەگوشی، دایکی منداڵەکەیش تووشی قەیرانی هیستریا بوو. کارامەیی تایبەتی ئەو جووڵە نەخوازراوە و توندی پەرچدانەوەی باوک و دایکی وای لە من کرد تا ئەم کارەساتە بە کردارێکی هێمادار ناو بەرین، کە مەبەستێکی خراپی بەرامبەر بە منداڵە خۆشەویستەکەی دەردەخات، بەڵام لە بارەی دژایەتیکردنی ئەم بۆچوونەوە لەگەڵ حەزی ئێستای باوکی بۆ منداڵەکەی توانیم ئەو دژایەتییە بسڕمەوە، بەڵام لەو ڕووەوە تەکانەی نەشیاوی باوکی ئەو منداڵەم گەڕاندەوە بۆ قۆناغێک، کە منداڵەکەی هێشتا تاقانە بووە و ئەوەندە بچووک بووە کە هیچ هەستێکی حەز و خۆشەویستیی لە باوکیدا نەبزواندبوو. ئینجا بە ئاسانی بەو تیۆرییە گەیشتم کە ئەو پیاوە لە هاوسەرەکەی ڕازی نەبوو، ڕەنگە لە قۆناغی کۆرپەبوونی

منداڵەکەیدا ئەندێشە، یان بەرنامەیەکی لە مێشکدا هەبوو بێت: "ئەگەر ئەم بوونەوەرە بچووکە بە هیچ شێوەیەک خۆشی ناوێت، بمرێت من ڕزگارم بێت و دەتوانم لە هاوسەرەکەم جیا ببمەوە". مەیلی بۆ مردنی ئەو منداڵەی کە ئێستا زۆر بە لایەوە خۆشەویستە، ڕەنگە هەر لەو سەردەمەوە لە ویژدانی نەستی باوکیدا ماوەتەوە و بەم کارە دەتوانین بە ئاسانی جەخت بکەینەوە لەسەر سەلماندنی نەستی ئەو حەزە. لە ڕاستیدا توانیم لە بیرەوەرییەکانی منداڵی ئەو نەخۆشەدا بیرەوەری مردنی یەکێک لە برا بچووکەکانی خۆم ببینمەوە، ئەو مردنەی کە دایکی نەخۆشەکەم دەیدایە پاڵ باوکی و بووە هۆی دەمەقاڵەیەکی توند، کە هەڕەشەی جیابوونەوەی لێ کەوتەوە. ئاڵوگۆڕی دوایی ژیانی ژنومێردایەتی پیاوە نەخۆشەکە جەختی لەسەر ئەو تیۆرییە کردەوە، چونکە ئەو چارەسەریانەی دەستم پێ کردبوون بە سەرکەوتن کۆتاییان پێ هات.

کاک ی. ئەشتەرکە، نموونەیەکی هێناوەتەوە، کە پیشانی دەدات نووسەران بۆ جێگیرکردنی کردارێکی بە ئەنقەست لەگەڵ هەڵەیەکدا، کە دەتوانێت ببێتە دەرئەنجامێکی خراپ، هیچ گومانێک ناخاتە بەردەمی خۆی.

"هێرمان بۆ پلانی یەکەمی یەکێک لە چیرۆکەکانی، هەڵە، یان باشتر بڵێم هەڵەیەکی ڕەفتاری شرۆڤە دەکات و هەموو نمایشنامەکە لەسەر ئەو بنەمایە دادەنێت. ناوی ئەو چیرۆکە "تۆم و تێدی"یە.

تۆم و تێدی ژنومێردێکی مەلەوانن، کە لە نمایشێکی سێرکدا کار دەکەن. ئەوان لە یەکێک لە بەرنامەکانیاندا لەناو حەوزێکدا کە دیواری حەوزەکەیش لە شووشەیە کاری زۆر سەرنجڕاکێش ئەنجام دەدەن. ژنەکە لەگەڵ پیاوێکی تردا کە ئیشی ماڵیکردنی ئاژەڵەکانە پلانی هاوڕێیەتی لەگەڵیاندا دادەڕێژێت و مێردەکەیشی پێش دەستپێکردنی

نمایشەکە بەسەر ئەو دوانەدا دەچێت لەناو شوێنی خۆگۆڕیندا. وێنەی بێدەنگ و نیگاکان هەرەشەئامێزە. پیاوە مەلەوانەکە دەڵێت: "پاشان دەیبینمەوە". نمایشەکە دەست پێ دەکات، پیاوە مەلەوانەکە دەست دەکات بە ئەنجامدانی سەیرترین و دژوارترین نمایش. ئەو بۆ ماوەی دوو خولەک و سێ چرکە لەژێر ئاوەوە لەناو سندووقێک کە بە تەواوی داخراوە دەمێنێتەوە. ژنومێردەکە پێشتر چەندین جار ئەو ئازایەتییەیان لە خۆیاندا نیشان داوە. کاتێک دەرگای سندووقەکە دادەخرێت تێدی ئاماژە دەکات بە کلیلی سندووقەکە کە بینەران سەیری کاتژمێرەکە دەکەن. جارێک، دوو جار بە تایبەتی کلیلەکە دەخاتە نێو حەوزەکەوە پاشان خێرا دەڕواتە ژێر ئاوەکە و لە کاتی خۆیدا، واتە پێش وادەی کردنەوەی دەرگای سندووقەکە کلیلەکە هەڵدەگرێت. شەوی ١/٣١، تۆم وەک جاران بە دەستە لێهاتووەکانی هاوسەرەکەی دەرگای سندووقەکە دەکاتەوە. ئەو لە پشت کونە بچووکەکەی سندووقەکەوە زەردەخەنە دەکات، تێدی بە کلیلەکە یاری دەکات و چاوەڕێی هێمای تایبەت دەبێ تا دەرگای سندووقەکە بکاتەوە. خاوەنی ئاژەڵەکان بە جلی زۆر ڕازاوە و بۆینباخی سپییەوە شولکەکە بە دەستەوە دەگرێت و لەسەر سەکۆکە ڕاوەستاوە و بۆ ئەوەی سەرنجی تێدی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت بە هێواشی فیکە دەکات. ژنەکەیش سەیری دەکات و زەردەخەنەی بۆ دەکات بە جووڵەی ناشیانەی ئەو کەسەی سەرنجی ڕاکێشاوە ئەوەندە کلیلەکەی فڕێ دایە سەرەوە کە لە گنجی پەردەکانی سەرەوەی سەکۆکە دەمێنێتەوە و ون دەبێت. ڕێک دوو خولەک و بیست چرکە لەو کاتەوە، کە تۆم لەناو سندووقەکەدا ماوەتەوە تێپەڕ دەبێت. هیچ کەس ئاگای لە کەوتنی کلیلەکە نابێت. واتە هیچ کەس نەیبینی، لە هۆڵی نمایشەکەدا هەڵەی چاو ئەوەندە بوو، کە هەموو کەس گریمانەیان کرد کلیلەکە کەوتۆتە ناو ئاوەکەوە و هەروەها ئەو کەسانەی لە

شانۆشدا کاریان دەکرد تووشی هەمان هەڵە بوون، چونکە پەردەکە دەنگی کەوتنی کلیلەکەی لاواز کردبوو.

تیدی لە حاڵێکدا پێدەکەنی تەنانەت یەک چرکەی بە فیڕۆ نەدا. لە لێواری حەوزەکەوە تێپەڕ بوو و بە پێکەنینەوە لە پەیژەکە چووە خوارەوە و لەبەر ئەوەی دڵنیا بوو کە تۆم ئەم چەند چرکەیەی کە وەدرەنگ کەوتووە، کاری تێ ناکات. دیسانەوە لە حاڵێکدا پێدەکەنی لەژێر ئاوەکەدا ون بوو تا کلیلەکە بدۆزێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خێرا نەیدۆزییەوە بە ئەدایەک کە لاسایی ناکرێتەوە و شێوە ڕووخسارێک کە گوایە دەڵێت: "خوایە، چ ڕووداوێکی ترسهێنەرە!" هاتە سەر سەکۆکە و خۆی چەماندەوە بۆ لای پەردەکە.

لەو ماوەیەدا کە تۆم لە پشت کونی سندووقەکەوە ئەدای دەردەهێنا و دیار بوو کە ئەویش تووشی نیگەرانی بووە. سپێتی ددانەکانی دەبینرا، هەموو کەس دەیبینی کە لەژێر سمێڵە زەردەکانیەوە لێوی خۆی دەگەزێت، بڵقە بڵقێک لەژێر ئاوەکەوە دروست دەبێت کە بە هەناسەدانی جێگۆڕکێ دەکەن، ئەو ڕەوشانە کاریگەرییەکی پێکەنینهێنی هەبوو، چونکە بینەران پێشتر بڵقەی وایان بینیبوو کە لەژێر ئاوەکەوە سێوی دەخوارد. هەموو دەیانبینی کە تۆم لەژێر ئاوەکەوە دەجووڵێت و پەنجە لاوازەکانی گرژ دەبن، هەموو پێدەکەنین، بەو شێوەیە کە لەکاتی نمایشی ئەو شەوەدا چەند جار پێکەنیبوون.

دوو خولەک و پەنجاوهەشت چرکە... سێ خولەک و حەوت چرکە... دوانزە چرکە...

بژی! بژی! بژی!

لەپڕ دەنگی قاچ و جووڵەی خێرا لە هۆڵەکەدا دەنگی دایەوە: لەبەر

ئەوەی خزمەتکار و خاوەن ئاژەڵەکان دەستیان بە گەڕان کردبوو، پێش ئەوەی دەرگای سندووقەکە بکرێتەوە پەردەکە دادرایەوە. شەش هەڵپەرکێکەری بەریتانی ڕۆیشتنە سەر سەکۆکە. پاشان مێردێک لەگەڵ ئەسپ و سەگ و مەیموونەکانیدا هاتە ناوەوە و بەرنامەکە درێژەی پێ درا. سبەی سەر لەبەیانیەکەی بینەران زانییان چ کارەساتێک ڕوویداوە و تیدی بووەتە بیوەژن".

بەم شێوەیە لەم چیرۆکەدا دەبنین هونەرمەندەکە تێگەیشتنێکی زۆر ڕاستی لە جۆریەتی کاری بەهەڵکەوتدا هەبووە، چونکە ئەو بەدواداچوونی بۆ هۆکاری قووڵی ناشیبوونێکی جنایەتکارانە لە سەرەتاوە تا کۆتایی کردووە.

بەشی نۆهەم

کاری هێمادار و بە هەڵکەوت

ئەو کارانەی تا ئێستا شرۆڤەمان کرد و تیایاندا بەدەستهێنانی مەبەستی نەستیمان ناسییەوە، وەک شێوە تێکەڵبووەکانی کردارێکی بە ئەنقەستی تر دەردەکەون و پاش دەرکەوتنی ناشیبوونەکان دەشاردرێنەوە، بەڵام خاڵی جیاوازی کردارە بە هەڵکەوتەکان، کە لەم بەشەدا کاریان لەسەر دەکەین، لەگەڵ هەڵەکاندا تەنها لەوەدایە کە کردارەکانی ئەم دواییەی مەبەستی نەست ناکاتە خاڵی پشتبەستن و پێویستی بە بیانوهێنانەوە نییە. ئەوان بەو شێوەیە کە هەن ئاشکرا

دەبن، چونکە هیچ کەس ئامانج و مەبەستەکانیان گریمانە ناکات. ئێمە ئەم کارانە بە " شێوەی تەواو هەڵکەوت" وەک بڵێی تەنها دەمانەوێت دەستمان بە شتێکەوە خەریک بێت و بەبێ ئەوەی بیر لە شتێک بکەینەوە ئەنجامی دەدەین و پێمان وایە ئەم شرۆڤەکردنە کردارێکی بەم شێوەیە بێ نیاز دەکات لە هەر جۆرە شیکردنەوە و پیاچوونەوەیەکی دووبارە. ئەو کارانە، کە ناشیگەری ناکەنە بیانوو و پاساو ناهێننەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بارودۆخێکی تایبەت، دەبێ خاوەنی هەلومەرجێکی دیاریکراو بێت، واتە وەک شتێکی سەیر نەیەنە بەرچاو و ئەنجامگەلێکی گرنگیان بەدواوە نەبێت.

من نموونەگەلێکی فراوانم کۆکردۆتەوە لە کرداری هەڵکەوت و کەسانێکی تر، پاشان لەسەر هەر بوارێک بە قووڵی خوێندنەوە و لێکدانەوەم کردووە و بەم ئەنجامە گەیشتووم کە دەکرێ ئەم کارانە بە "کردارە هێمادارەکان" ناوی لێ بنێین، لەبەر ئەوە ئەو کارانە دەربڕی مەسەلەیەکن کە خودی کەسەکە بێئاگایە لێی، زۆر جار دەیەوێت بیشارێتەوە و لە لای هیچ کەسێک نەیدرکێنێت.

هەروەها دەرەنجامی چارەسەری دەروونشیکاری نەخۆشە دەروون ئازارەکان زیاترین بواری کرداری هەڵکەوت یان هێمادارمان دەخاتە بەر دەست. ئێستا دەمەوێت لە بارەی دوو نموونەوە کە تێکهەڵکێشم کردووە پیشانی دەدەم، کە ئەندێشەی نەست تا چ ڕادەیەک و بە چ وەستاییەک ئەو کارە هەستپێنەکراوانە دەستنیشان دەکات. سنووری نێوان کردارە هێمادارەکان و هەڵەکان ئەوەندە نادیارن کە دەتوانێ ئەم دوو نموونەیە لە بەشی پێشوودا وەک نموونە بهێنینەوە.

١- لە درێژەی دانیشتنی دەروونشیکاریدا، ژنێکی گەنج بیرکردنەوەیەک، کە بە مێشکیدا هاتبوو شرۆڤەی کرد: ئەو شەوی ڕابردوو لە کاتی کورتکردنەوەی نینۆکەکانیدا کاتێک سەرقاڵی

جیاکردنەوەی پێستی ناسکی بەشی خوارەوەی نینۆکی بوو، نەختێ لە گۆشتەکەی هەڵکەندبوو. ئەو مەسەلەیە ئەوەندە کەم بایەخە کە پزیشک دەتوانێت لە خۆی بپرسێ بۆچی نەخۆشەکە بیری لەوە کردۆتەوە و ئەوەی گێڕاوەتەوە، لەم ڕووەوە دەتوانین گریمانە بکەین کە مەسەلەی کرداری هێمادار لە ئارادایە. کارەساتێکی ئازاردەر بۆ پەنجەی ڕووی دابوو کە مستیلەی تێدەکەن. جیا لەوەیش کاتێک ئەو کارە ڕووی دا، ساڵرۆژی هاوسەرگیری نەخۆشەکە بوو و هەروەها ئەو کارە چەمکێکی ئاشکرا بە برینەکە دەبەخشێت، کە دۆزینەوەی بە ئاسانی ئاشکرا دەکات. لەو کاتەدا ژنە نەخۆشەکە خەونێکی بۆ گێڕامەوە کە لە بارەی ناشیگەری مێردەکەی و ساردوسڕی خۆیەوە بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پەنجەی ئەڵقەی هاوسەری برینداری کردبوو ئێستاش بۆچی ئەڵقەکە دەکاتە پەنجەی دەستی ڕاستی؟ مێردی ئەو ژنە پارێزەر بوو و دکتۆرای لە یاسادا وەرگرتبوو، ژنەکە لە کاتی کچێنیدا حەزی لە پزیشکێک کردبوو –بەو شێوەیەی کە خۆی بە گاڵتەوە دەیگێڕایەوە "دکتۆر لای چەپ"– لەو ڕووەوە هاوسەرگیری بە دەستی چەپ چەمکێکی دیاریکراوی ڕوون دەکردەوە.

کچێکی گەنج بەم شێوە دەیگێڕایەوە: "دوێنێ بە هەڵکەوت پارەیەکی کاغەزی سەد "فلۆریەنی"م دڕاند و نیوێکیم دا بە ژنێک کە هاتبوو بۆ سەردانم. ئایا منیش تووشی کردارێکی هێمادار بوومەتەوە؟" شیکردنەوەیەکی ورد وردەکارییەکانی لای خوارەوەی ئاشکرا کرد: ئەو کچە گەنجە بەشێک لە کات و سامانەکەی بۆ خێرخوازی تەرخان دەکرد و بە یارمەتی ژنێکی تر پەروەردە و سەرپەرشتی منداڵێکی هەتیوی لە ئەستۆ گرتبوو. پارە کاغەزینە سەد فلۆرینییەکەی باسمان کرد هەر ئەو ژنە بۆی ناردبوو. کاتێک پارەکەی بە دەست گەیشت ئەوەی نایە ناو پاکەتێک و بە شێوەیەکی کاتی لەسەر مێزی نووسینەکەی داینا. ئەو ژنەی ڕۆیشتبوو بۆ بینینی، ژنێکی خاوەن

کەسایەتی بوو و کاروباری خێرخوازی تری دەکرد و هاتبوو تا لیستی ئەو کەسانەی دەتوانن لە کاری خێرخوازیدا بەشدار بن لە نەخۆشەکە وەربگرێت. ژنە سەڵتەکە هیچ کاغەزێکی نەدۆزییەوە تا ناوەکانی لەسەر بنووسێت، زەرفی نامەکەی لەسەر مێزەکەی هەڵگرت، چونکە دەیویست یەک لەوەیش لەبەری بگرێت و لە لای خۆی راگرێت بەبێ ئەوەی بیر لە ناوەڕۆکی زەرفەکە بکاتەوە ئەوەی کرد بە دوو لەتەوە. ئێمە دەبێ لایەنی بێ زیانی ئەو کردارە بیمانایە لە بەرچاو بگرین. بە باشی تێدەگەین کە پارە سەد فلۆرینییەکە کاتێک بکرێت بە دوو بەشەوە ئەگەر بتوانین بەشەکانی بە وردی بە یەکەوە بلکێنین گرنگیی خۆی لەدەست نادات. کەواتە چونکە ئەو کاغەزە گرنگییەکی تایبەتی هەبوو بە دڵنیاییەوە ژنە میوانەکە ئەوەی دەپاراست و بێگومان لەگەڵ ئەوەی لە ناوەڕۆکی بەبایەخی ئاگادار دەبووەوە، نیوەی بەتاڵی زەرفەکەی بۆ ژنە سەڵتەکە دەناردەوە.

بەڵام ئەو کارە بە هەڵکەوتە، کە لەبیرچوونەوەیش ئاسانکاری پێ بەخشیبوو چ بیرکردنەوەیەکی نەستی دەردەبڕی؟ ژنە میوانەکە یەکێک بوو لە لایەنگرانی پێداگری شێوازی چارەسەرکردنمان. هەر ئەم ژنە پێشنیاری بە نەخۆشەکەم کردبوو بێت بۆ لای من و ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبم نەخۆشەکەیش زۆر سوپاسی کردبوو. ئایا نیوەی پارەیەکی کاغەزی سەد فلۆرینی حەقدەستێک بوو کە نەخۆشەکەم دەیویست بۆ ئەو پێشنیارە هاوڕێیانەی پێی کردبوو، بیدات بە میوانەکەی؟ هۆی سەرسووڕمانە! بەڵام وردەکارییەکی تریش لە ئارادا بوو. شەوی پێش ئەو رووداوە کچە گەنجە سەڵتەکە لە میوانیی یەکێک لە خزمەکانیدا لەگەڵ ناوبژێوانێکی تردا یەکتریان بینی بوو. واتە دەڵاڵێکی خۆشەویستی لێی پرسیبوو: ئایا ئامادەیە لەگەڵ پیاوێکدا یەکتر بناسن. چەند کاتژمێر پێش گەیشتنی خانمی میوان نەخۆشەکەم نامەیەکی پێگەیشتبوو، کە تیایدا ئەو پیاوە خوازبینیی لێ

دەکرد. ئەو ڕووداوە ببووە هۆی پێکەنین و سەرقاڵیی نەخۆشەکە. کاتێک میوانەکە دەستی بە قسەکردن کردبوو و هەواڵی تەندروستیی پرسیبوو، ژنە گەنجەکە لەبەر خۆیەوە وتبووی: "تۆ ناونیشانی پزیشکێکت پێ داوم کە بە کەڵکم هات، بەڵام بە ڕاستی سوپاست دەکەم ئەگەر یارمەتیم بدەیت کە هاوسەرێکی باشیش بدۆزمەوە." (پاشان بە بیرکردنەوە لە مەسەلەی هاوسەرگیری بە دڵنیاییەوە بیری لە منداڵیش کردبووەوە). ئنجا ئەو بیرکردنەوە سەرکوتکراوەی بە سەرەتا و پرەنسیبێک دانابوو و پاشان دوو نێوانجییەکەی بە هەڵە دانابوو و لە یەکتری جیا نەکردبووەوە و حەقدەستێکی بە میوانەکە دابوو، کە لە دنیای خەیاڵدا ئامادە بوو قسە لەگەڵ دەلالی خۆشەویستیدا بکات. ئەو شتەی ئەم شرۆڤەیە شیاوی پەسندکردن دەکات، ئەوەیە کە ڕێک من شەوی پێش ڕووداوەکە باسی کرداری هێمادار و بەهەڵکەوتم بۆ نەخۆشەکە کردبوو و ئەوەیش یەکەم دەرفەتی قۆستبووەوە تا کردارێکی لەو شێوەیە دەرببڕێت.

دەکرێ کردارە هێمادار و بەهەڵکەوتە زۆر باوەکان بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی بوون بە خوو و لە هەندێ هەلومەرجدا زۆر جار دەردەکەون، یان ئەوەی بە شێوەیەکی جیاواز و تاقانە دەردەکەون، بە دوو گرووپ دابەش بکەین. گرووپی یەکەم: (بۆ نموونە یاریکردن بە دەسکی کاتژمێر یان دەستهێنان بە ڕیش و...) بە ئەگەرێکی زۆر لە خزمەتی وەسفکردنی کەسایەتیی کەسانێکەوەن، کە خوویەکی وەهایان هەیە. ئەو کردارانە بە جووڵەی خۆنەویست و خووگرتن بە شێوەیەکی یەکسان دەردەکەوێت و دەتوانن وەک ئەوانە توێژینەوەیان لەسەر بکرێت. ئەو جووڵانەی کە کەسەکە گۆچانێکی بە دەستەوە گرتووە و ئەنجامی دەدات یان ئەو وێنانەی بە قەڵەمێک لەناو پەنجەیدایە دەینەخشێنێت، لە ڕیزی گرووپی دووهەمدا دایاندەنین. لەو ڕووەوە خووگرتن بە هەویرکردنی وردەنان و

تەنەکەی شـێوە مـۆمی، زرینگەزرینگـی ئەو پـارە وردانەی کە لە گیرفاندایە، یـان ڕاکێشانی سـووچێکی جلوبەرگ و... هتد لە ڕیزی گرووپـی دووهەمـدان. چارەسـەرکردنی دەروونـی، واتـا و چەمکـی هەمـوو ئەو کـردارانە کە بـە جۆرێـک لە یـاریکردن دەژمێـردرێن، دەدۆزێـتەوە، ئەو چەمکـانەی کە بە شـێوەیەکی تـر نەیـادەتوانی دەرببڕدرێن. بە گشتی کەسێک کە ئەو کارانە ئەنجام دەدات ئاگای لە کارەکانی خۆی یان ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە بەو کردارانە دەیدات نییە و لە بەرامبەر دەرەئەنجـامی بەدەسـتهاتوو لەو کـارانە بە نابینـا و بە کەڕی دەمێنێتەوە، بەڵام کاتێک ئەو دراوانەی لە گیرفاندایە و تەکانی دەدات خۆی دەنگی لێکخشانیان نابیستێت و کاتێک سەرنجی بۆ ئەو وردەکاریـانە ڕادەکێشین، ڕووخسارێکی بڕواپێنەکراو و سەیر لەخۆ دەگرێت. لەو ڕووەوە هەندێ کەس بەبێ ئەوەی ئاگادار بن بەردەوام بە جلەکانیـان یـاری دەکەن، ئاڵوگۆڕگەلێک تیایانـدا پێک دێنن و ئەو جووڵانە واتای هەیە و شیاوی سەنجدانی پزیشکە. هەر ئاڵوگۆڕێک بۆ جـل لەبەرکـردن و هەمـوو کەمتەرخەمییەکـان -بـۆ نمـوونە قۆپچەبەسـتن بە پـێچەوانەی یەکتـرەوە- هەر قـۆپچەیەک لە ئاسـتی کونی خۆیـدا نەبێت، یـان هەر کارێک ببێتە هـۆی ئەوەی بەشـێک لە جەستەی ڕووت بێت، واتایەکی هەیە کە کەسەکە نایەوێت بیگێڕێتەوە یان زۆر جار بە تەواوی لێـی بێئاگـایە. هەلـومەرجی دەرکەوتنـی ئەو جووڵەیە و ئەو قسانەی لەم دواییانەدا لەگەڵ نەخۆشەکەمدا هەمبووە، وتووێژ لە کاتی دەروونشیکاری و ئەو بیرکردنەوانەی کاتێک نەخۆش ئاگای لە تایبەتمەندییەکانی بە ڕواڵەت بە هەڵکەوتی کردارەکان دەبێت بە مێشـکیدا دێـت، ئاڕاسـتەمان دەکـات بەرەو هەنـدێ لێکـدانەوە. هەروەهـا هەر جـارەو بە وردی لەو بارەیـەوە دەتـوانین بەڵـگەی پێویست بۆ سەلماندنی ڕاستییەکانی لێکدانەوە لەو جۆرە کردارە ورد و بە هەڵکەوتانە بەدەست دێنین.

سەرەڕای ئەوەیش لەبەر ئەوەی سەبارەت بەوەی شرۆڤەمان کرد، بە تایبەتی کرداری نەخۆشە دەروونییەکانمان چاودێری کردووە دوورەپەرێزی دەکەم لە هێنانەوەی چەند نموونەیەک کە بنەمای بیروبۆچوونمن و شیکردنەوە لەسەریان ڕاستە. ئەم بابەتەیش دێنمە ئارا، چونکە بڕوام وایە کرداری مەبەستمان لە کەسی تەندروستدا وەک کەسانی نەخۆش هەر ئەو واتایەی هەیە.

تەنها نموونەیەک دێنمەوە تا پیشان بدەم کردارێکی نموونەیی، کە بووەتە خوو تا چ ڕادەیەک دەتوانێت بەند بێت بە تایبەترین مەسەلەکانی ژیانی مرۆڤەوە. "ئەرنێست جۆن" دەنووسێت: "ئەو شتانەی پرۆفیسۆر فرۆید فێری کردووین، نموونەیی بوون لە سەردەمی منداڵیدا ڕۆڵێکی گرنگتر دەگێڕێت وەک لەوەی کۆنترین ئەزموونە دەروونشیکارییەکان بە دەستی هێنابوو. لەم بارەیەوە ڕەنگە باش بێت ئەم شیکردنەوەیەی لای خوارەوە بگێڕمەوە، چونکە ئاسۆیەکی نوێ لە بواری پزیشکییەوە لە بەردەمماندا دەکاتەوە.

ئەو پزیشکەی کە تازە کەلوپەلەکەی هێنابووە شوقەیەکی نوێوە، یەک "ئەستتۆسکۆپ"ێکی سادەی لە ڕەگەزی دارین دۆزییەوە و پاشان، چونکە بە دوای شوێنێک بۆ دانانی تەنەکەکە دەگەڕا هەستی کرد ناچارە ئەوە لەسەر مێزی نووسینەکەی لە نێوان کورسییەکەی خۆی و کورسییەکی تردا کە زۆر جار نەخۆشەکانیان لەسەری دادەنا، داینا. ئەو کارە بە دوو هۆکار سەیر دەهاتە بەرچاو: یەکەم/ چونکە ئەو پزیشکە عەسەبناس بوو و بە دەگمەن کەڵکی لە ئەستتۆسکۆپ وەردەگرت و لە زۆر بواری دەگمەندا کە پێویستی بە ئامێرێکی بەم شێوەیە هەبوو لە ئەستتۆسکۆپی دوانە (واتە بە دوو بیستەنی) کەڵکی وەردەگرت. دووهەم/ ئەو هەموو ئامراز و کەرەستە پزیشکیەی لەناو چەکمەجەکەیدا دادەنا و لەو ڕووەوە بەو ئەستتۆسکۆپە گرنگیەکی

تـايبەتی دابـوو. پـاش چەنـد ڕۆژ کاتێـک ئیتـر بیـری لەو مەسـەلەیە نەدەکردەوە، نەخۆشێک هات بۆ عیادەکەی کە هەرگیز ئەستتۆسکۆپی سـادەی نەبینیبـوو. ئەو لە پزیشـکەکەی پرسـی ئەو تەنەکەیە چییە؟ پاش شرۆڤەکردنی پزیشک دیسانەوە نەخۆشـەکە پرسـی: "بۆچی ئەو ئامێرەت لێرەدا داناوە و لە شوێنێکی تر داتنەناوە؟" پزیشک بە توندی وەڵامی دایەوە، لێرە یان لەوێ هیچ فەرق ناکات. بەڵام ئەو پرسیارانە بیـری لە مێشـکی پزیشـکەکەدا دروسـت کـرد و پزیشـکەکە لە خـۆی پرسـی: ئایا مەبەسـتە نەسـتەکان بوونەتە هـۆی کردارەکەی یـان نـا؟ ئینجـا چـونکە شـێوازەکانی دەروونشـیکاری دەناسـی بڕیـاری دا مەسـەلەکە ڕوون بکاتەوە. سـەرەتا بیـری هـاتەوە کاتێـک خوێنـدکاری بەشی پزیشـکی بـوو بەرپرسی بەشـەکەیان هەڵسـوکەوتی وا بـووە لە کـاتی سـەردانی نەخۆشـەکانی هـۆڵی نەخۆشـخانەدا ئەسـتتۆسـکۆپێکی سادە بە دەسـتیەوە بگرێت کە هەرگیز کەڵکی لـێ وەرنەگرتووە. ئەو بەرپرسەی بە لاوە باش بووە و پاشان کاتێک ئەو بـووە بـە پزیشـکی نەخۆشـخانە، هەمـان هەڵسـوکەوتی ئەوی دەکردەوە بە شـێوەیەک کە ئەگەر ڕۆژێـک لە مـاڵ دەچێتە دەرەوە و بە هەڵە ئەسـتتۆسـکۆپەکەی بەجـێ دەهێشـت و بە دەسـتیەوە نەیدەسـوڕاند، هەسـتی بە نیگەرانـی دەکـرد. ئەو شـتەی دەبـووە هـۆی بێهوودەبـوونی ئەوە بـوو کە بە ڕاسـتی لە ئەسـتتۆسـکۆپی دوانە کەڵکـی وەردەگـرت و ئەوەی دەنایـە گیرفانی. خاڵێکی سەیری تر ئەوە بـوو کە پزیشـک ئەو خووەی پـاش ڕۆیشتنی بۆ بەشی نەشتەرگەریش هەر دووپات دەکردەوە لە حاڵێکدا لە بەشـی نەشـتەرگەریدا ئەسـتتۆسـکۆپ هـیچ کەڵکـی لـێ وەرنـاگرن. واتای ئەو تێبینیانە بە لەبەرچاوگرتنی جۆریەتی نێرینەی ئەو کردارە نموونەییە ئاشکرا دەبێت.

ئەو ڕووداوێکی تـری بە بیر هـاتەوە: کاتێـک منداڵ بـوو سـەیری لـێ دەهـات بـۆ ئەوەی پزیشـکی بنەماڵەیـان ئەسـتتۆسـکۆپەکەی لەنـاو

کڵاوەکەی دادەنا، بە لایەوە سەیر بوو کاتێک پزیشکەکە بۆ لای نەخۆشەکانی دەڕۆیشت بەردەوام ئامرازی کارەکەی لە بەردەستدا بوو و هەر ئەوەندەی دەویست کە کڵاوەکەی لا ببات و تەنەکەکەی دەربهێنێت. کاتێک زۆر منداڵ بوو ئەو پزیشکەی زۆر خۆش دەویست و لەم دواییانەدا کاتی شیکردنەوەی دەروونی خۆی بە بیر هاتبووەوە کە لە ماوەی سێ ساڵ و نیودا دوو خەیاڵی لە بارەی لەدایکبوونی بچووکترین خوشکیەوە هەبووە: یەکەم/ خوشکەکەی، هەم کچیەتی و هەم دایکیەتی. دووهەم/ خوشکەکەی، کچی ئەو و کچی ئەو پزیشکەیە. لەو خەیاڵەدا ئەو هەم ڕۆڵی پیاو و هەم ڕۆڵی ژنی دەگێڕا. پاشان بە بیری هاتەوە لە شەش ساڵاندا هەمان پزیشک چارەسەری کردووە و ڕێک بە بیری دەهاتەوە کاتێک سەری پزیشکەکە لەسەر سنگی لکابوو بە ئەستتۆسکۆپەکەوە و هەستی بە ڕیتمی هەناسەی پزیشکەکە کردووە چ هەستێکی خۆش هەبووە. ئەو لە تەمەنی سێ ساڵیدا تووشی نەخۆشییەکی بەردەوامی سی بووەتەوە کە تاقیکردنەوەی دووپاتکەرەوەی بە پێویست دەزانی، بەڵام هیچ بیرەوەرییەکی لەو بارەیەوە نەبوو. لە تەمەنی هەشت ساڵییدا لە یەکێک لە هاوپۆلەکانیی بیستبوو کە پزیشکی بنەماڵەییان هەڵسوکەوتی سەیری هەیە و ئەو مەسەلەیەش کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر دانابوو. ئەو پزیشکەی خۆی شی دەکردەوە دیسانەوە نەخۆشەکانی خۆش ویستووە و لە ئاکامدا لەگەڵ یەکێک لەوانەدا هاوسەرگیری کردبوو. تاڕادەیەک دڵنیا بوو یەک جۆر بیرکردنەوەی لەگەڵ پزیشکی بنەماڵەییەکاندا بووە هۆی ئەوەی بەشی پزیشکی بۆ خوێندن هەڵبژێرێت. هەروەها دەرەنجامی ئەو شیکردنەوانەی لەسەر پزیشکەکان ئەنجامی گرتووە، پیشانی دەدات بە گشتی ئەو هۆکارە یەکێکە لە باوترین هۆکارەکانی هەڵبژاردنی بەشی پزیشکی (هەڵبەت بە سەختی سەرژمێرییەکی وردی بەدەست هێنا). لەو بوارە تایبەتەدا

دوو مەسەلە گرنگییەکی زۆریان هەیە. یەکەم/ ئەو پزیشکە دێرینە لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا گەورەبوونی خۆی بەسەر باوکیدا دەسەپاند کە باوکی ئیرەیی پێ دەبرد و دووهەم/ ئەو بابەتە قەدەغەکراوەکانی دەزانی و بارودۆخی بیئەژماری بۆ بەدەستهێنانی غەریزەکانی خۆی هەبوو.

پاش ئەو کەسەی شیکردنەوەی لەسەر کرا، بیرەوەریی خەونێکی دۆزییەوە (خەیاڵ جۆریەتییەکی دیاریکراوی هاورەگەزگەرا و بەرامبەر ئازاردەری (مازۆخیسم) هەبوو. لە خەونەکەیدا پیاوێک بە شێوەی پزیشک بە خەنجەرێکەوە هەڕەشەی لە خەوبینەرەکەی دەکرد) و ئەو کارەیش چیرۆکێکی بە بیر هێنایەوە کە لە گۆرانییە کۆن و شۆڕشگێڕییەکانی ئەڵمانیادا خوێندبووەوە. لەو چیرۆکەدا "زیگورد" شمشێرێک لە نێوان خۆی و "بدانهیلد"دا کە خەوتووە دادەنێت. هەر ئەم چیرۆکە لە ئەفسانەی "ئارتور"دا، کە پزیشک بە باشی دەیناسی بوونی هەیە.

لەو ڕووەوە چەمکی کرداری نموونەیی شیاوی تێگەیشتنە. پزیشک ئامرازی ئەستتۆسکۆپەکەی لە نێوان خۆی و نەخۆشەکانیدا دانابوو و بەو شێوەیەی کە -زیگورد- شمشێرەکەی لە نێوان خۆی و ئەو ژنەی کە نەدەبوا داگیری بکردبا، دانابوو. ئەو کردارە کردارێکی بەرژەوەندیانە بوو و دوو ئامانجی بە دواوە بوو: یەکەم/ یەکەم ئارەزووە سەرکوتکراوەکانی وریا بکاتەوە و لە هەمان کاتدا پێی بڵێت ئەو ئارەزوانە ناتوانن تێر بن. بە واتایەکی تر ئەو ئەستتۆسکۆپە وەک تەلەسمێک بوو، دەبوایە لە بەرامبەر هێرشی ڕاڕابوونەکاندا بیپاراستایە. با باسی ئەمەیش بکەم لە ژێر کاریگەریی چەند هۆنراوەیەکدا بوو کە "لۆرد لیتۆن" لە ڕۆمانێکدا دەڵێت هی "ڕیشۆلیۆ"یە:

Beneath the rule of men entirely great.

The pen is mightier than the sword.

(لە سەردەمی حکومڕانی مرۆڤە زۆر ڕاستەقینەکاندا، قەڵەم بەهێزترە لە شمشێر). ئەو دەرەنجامە بووە هۆی ئەوەی نووسەر کتێبێکی زۆر و قەڵەمێکی زۆر درێژی بە دەستەوە گرت و وەڵامی دایەوە: "من قسەی زۆرم بۆ وتن هەیە".

ئەو شیکردنەوەیە پیشانمان دەدات کە کردارە بە ڕواڵەت (بێ ئازارەکان کە چەمکێکیان لە ئارادا نییە) تا چ ڕادەیەک دەتوانن قووڵایی ژیانی دەروونی بدرکێنن و ئارەزوو بۆ نموونەبوون بە چ شێوەیەک لە ژیاندا گەشە دەکات و پەرە دەستێنێت".

دەتوانم نموونەیەکی تر لە ئەزموونی شێوازی چارەسەرکردنی دەروونیم بگێڕمەوە. لێرەدا ئەو دەستەی کە یاری بە قوڕقاڵێکی هەویری نان دەکرد، بابەتی زۆر سەیر و شاراوەی ئاشکرا کرد. نەخۆشەکەم نەوجەوانێک بوو، ئەوپەڕی سیانزە ساڵ تەمەنی بوو و لە دوو ساڵ لەوەوپێشەوە تووشی هیستریایەکی توند بووە. پاش نیشتەجێبوونێکی درێژخایەن لە ڕێکخراوەیەکی چارەسەرکردن بە ئاو ڕایانسپاردە دەستم تا بە دەروونشیکاری چارەسەر بکرێت.

بە بۆچوونی من ڕەنگە ئەو ئەزموونی سێکسی هەبوو بێت و بە گوێرەی تەمەنی ئازاری لە مەسەلەی سێکسی دەبینی. بەڵام لەبەر ئەوەی من یارمەتیم دا بۆ خستنەڕووی شرۆڤەکردنەکان دوورم خستەوە، چونکە دەمویست جارێکی تر دروستی و سەلماندنی تیۆرییەکان تاقی بکەمەوە. لەو ڕووەوە دەبوایە بە دوای ڕێگایەکدا بگەڕابام تا بتوانم جارێکی تر تاقی بکەمەوە. ڕۆژێکیان لە بینینی چەند جووڵەیەک سەرم سووڕما، کوڕە گەنجەکە شتێکی لە ناو پەنجەی

دەستی ڕاستیدا دەسوڕاند، دەستی دەنایە گیرفانی و پەنجەکانیشی لە گیرفانیدا یارییان دەکرد، دیسانەوە دەستی لە گیرفانی دەردەهێنا و درێژەی بە یاریکردن دەدا. من پرسیم: -چیت لەناو دەستدایە؟

کوڕە گەنجەکە لە بری وەڵامدانەوە پەنجەکانی کردەوە. ئەو وردە نانەکانی بە شێوەی قوپقەڵەیەکی بچووک دروست دەکرد. لە دووهەم جاردا دیسانەوە نەختێ هەویری نانی لەگەڵ خۆی هێنابوو و لە کاتی قسەکردندا بە چاوی نوقێنراو و بە خێراییەکی سەرسووڕهێنەرەوە چەند پەیکەرێکی سەیری دروست کرد کە سەرنجیان ڕاکێشام. پەیکەرەکان بە شێوەی مرۆڤی پێش سەرەتایی بوون. سەرێک و دوو قۆڵ و دوو پێ و گونێکیان هەبوو کە بە نووکێکی درێژ گرێ دەدرا. لەگەڵ ئەوەی مانکنەکە دروست دەبوو، دیسانەوە نەخۆشەکە هەویری نانەکەی لەناو پەنجەکانیدا دەسوڕاند و دەیکردەوە بە تۆپقەڵە. هەندێک جار مانکنەکەی خراپ نەدەکرد، بەڵام ڕێژەی گونەکانی زیاتر دەکردەوە تا واتای ئەو گونەی دروستی کردبوو بشارێتەوە. من ویستم تێیبگەیەنم کە لە واتای پەیکەر دروستکردنەکەی تێگەیشتووم، بەڵام لە هەمان کاتدا حەزم نەکرد بیانوویەکی بخەمە بەر دەست تا نەڵێت بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک مانکینەکانی دروست کردووە. بەو مەبەستە لەناکاو پرسیارم لێ کرد ئایا چیرۆکی ئەو پاشا ڕۆمییە کە لەناو باخەکەدا بە جووڵەی بێدەنگ وەڵامی کوڕەکەی داوەتەوە بە بیر دێتەوە؟ کوڕە گەنجەکە هەرچەند لەم دواییانە ئەو چیرۆکەی بیستبوو وتی لەو بارەیەوە بە بیری نایەت و لێی پرسیم: ئایا ئاماژە بەو چیرۆکە دەدات، کە وەڵامەکە لەسەر سەری سفرکراوی کۆیلەیەک نووسرابوو؟ من وتم: "-نا، ئەوە دوایین ڕووداوە لە بارەی مێژووی یۆنان و چیرۆکی مەبەستم بۆ گێڕایەوە. پاشا "تارکەن"ـی گەورە فەرمانی بە کوڕەکەی دابوو بڕواتە ناو یەکێک لە شارەکانی دوژمنەوە. کوڕەکەی توانی چەند هاوڕێیەکی

وریا لەناو شاردا بدۆزێتەوە و پاشان نامەبەرێکی بەرەو لای باوکی بەڕێ کرد تا پرسیاری لێ بکات، پاش ئەو کارە چ ئەرکێکی لەسەر شانە؟ پاشا هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، بەڵام کاتێک چووە ناو باخەکەوە ویستی دیسانەوە پرسیاری کوڕەکەی دووپات بکاتەوە، پاشان بەبێ ئەوەی وشەیەک بهێنێتە سەر زاری سەری جوانترین و بەرزترین گوڵە خەشخاشەکانی ناو باخەکەی لێکردەوە. لەو ڕووەوە نامەبەرەکە هیچ ڕێگە چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای سکستیۆسی کوڕی پاشا و ئەو شتەی بینیبووی بیگێڕێتەوە. کوڕەکە لەو واتایە تێگەیشت و بەهێزترین و کاریگەرترین خەڵکی ئەو شارەی کوشت و شاری لەو جۆرە کەسانە سڕییەوە.

لە حاڵێکدا قسەم دەکرد کوڕە گەنجەکە ئیتر یاری بە هەویری نانەکە نەدەکرد، کاتێک گەیشتمە بەشێک کە شرۆڤەی کردارەکانی پاشای لەناو باخەکەدا ڕاڤە دەکرد و بە تایبەتی کاتێک ڕستەی: "بەبێ ئەوەی وشەیەک بهێنێتە سەر زار... سەری گوڵە خەشخاشەکانی بڕی"م هێنایە سەر زار، نەخۆشەکە بەشبەحاڵی خۆی خێرا سەری مانکێنەکەی لێکردەوە. کەواتە لە واتای قسەکانم تێگەیشتووە و دەزانێت منیش لە مەبەستەکانی تێدەگەم. پاشان توانیم بە ئاشکرایی پرسیاری لێ بکەم ئەو زانیاریانەی کە دەیویست لە بەردەستی دابینێم پاش ماوەیەکی کورت نەخۆشە دەروون ئازارەکە دۆخی باش بووەوە.

کردارە هێماداره‌کان کە جۆرە بێئەژمارەکانی لە کەسانی تەندروست و هەروەها نەخۆشەکاندا دەبینم بە چەند هۆیەکی زۆر بەرز دەبێ سەرنجیان بدرێتێ. ئەو کردارانە زانیاریی بەبایەخ لە بەردەستی پزیشکدا دادەنێن و لە هەلومەرجی نوێ و نەناسراودا ڕێنوێنیی دەکەن، ئەو کەسانەی لە دەروونناسی دەزانن دەتوانن لە ڕێگای

لیوردبـووونەوە لەو جـۆرە کـردارانەدا ئەو شـتانەیان کە دەویست بدۆزنەوە. ئەو کەسانەی کە دەتوانن لەو جۆر تایبەتمەندیانە کەلک وەربگـرن لە زۆر کاتـدا هاوشـێوەی حەزرەتـی سـلیمانن کە وەک گیراویانەتەوە زمانی ئاژەڵەکانی دەزانی. ڕۆژێکیان دایکم داوای لێ کـردم تـا پیاوێکی گەنج کە لە ماڵی ئەودا کرێچییە تـاقی بکەمـەوە. کاتێک گەنجەکە بەرەو پیریم هات، یەکەم خاڵ کە سەرنجی ڕاکێشام پەڵەیەکی سپی و گەورە بوو، کە بەسەر پانتۆڵەکەیەوە بوو، کە ئەگەر سـەرنجی ڕواڵەتـی تایبەتیمـان بـدابا هاوشـێوەی پەڵەی سـپیی هێلکە بـوو. پـاش چەنـد چرکەیـەک لـە شـڵەژاوی پیـاوە گەنـجەکە، داوای لێبووردنی کرد و وتی: چونکە دەنگی نوسا بوو هێلکەیەکی نەکوڵاوی خـوارد و نەختێ سـپێنەی هێلکە بەسـەر پانتۆڵەکەیدا ڕژاوە. ئەو بـۆ جەختکردنەوە بۆ سەر قسەکانی قاپێکی پیشان دام، کە هێشتا توێکڵی هێلکەی بەسەرەوە دیار بوو. لەو ڕووەوە وا دیار بوو کە سەرچاوەی ئەو پەڵە گوماناوییە بە سروشتیترین شێوە شیاوی شرۆڤە بێت. بەڵام کاتێک دایکم منی بەجێ هێشت من سوپاسی پیاوە گەنجەکەم کرد، کە دەستنیشـانکردنی ئاسـان کـردمەوە و بەبـێ هـیچ کێشـەیەک تـوانیم دانپیادانانی لێ وەربگرم کە دەستپەڕی کردووە. جارێکی تر ئەرکم لەسـەر شـان بـوو، خـاتوونێکی زۆر دەوڵەمەند و لە هەمـان کاتـدا لە خۆبـایی و گەمـژە تـاقی بـکەمەوە. ئەو ڕەفتـاری وا بـوو وەڵامـی پرسـیاری پزیشـکەکان بە کۆمەڵێـک وشـەی ناپەیوەندیـدار و پـڕ لە گلەیی و سکاڵا بداتەوە و قسەکانی دەستنیشانی نەخۆشییەکەی دژوار دەکردەوە. کاتێک ڕۆیشتمە ناوەوە ئەو لە بەرامبەر مێزێکی خڕی سێ پـایە دانیشـتبوو و دراوێکی زۆری زیو بەسـەر یەکدا ڕیز دەکات و بەرزی دەکـاتەوە. ژنەکە لە کـاتی هەسـتاندا چەنـد دراوێکـی بەسـەر زەوییەکەدا خست، یارمەتیم دا تـا دراوەکان کۆ بکاتەوە. پاش چەند خولەکێک دەستی کرد بە شرۆڤەی چارەرەشییەکانی ژیانی، قسەکەیم

پێ بڕی و وتم: 'ئایا بە ڕاستی زاوا لەخۆباییەکەی بووە هۆی ئەوەی کە پارەکانت ئەوەندە لەکیس بچێت؟' بە تووڕەییەوە وەڵامی دایەوە: نا، بەڵام پاش چرکەیەک بۆی گێرامەوە کە دەستکراوەیی زاواکەی زۆر تووڕەی دەکات. با بڵێم تا ئێستا من هەرگیز ئەو ژنەم نەبینی، چونکە کاتێک کرداری هێماداری کەسەکان ئاشکرا دەکەین زۆر جار پیان خۆشە و لە هاوڕێیەتی لەگەڵماندا دوورەپەرێزی دەکەن.

دکتـۆر (ئـی. ژ. فەن ئێمـدین) لە شـاری لاهە نمـوونەیەکی تـر لە دانپیادانان لەگەڵ کرداری هێماداردا شرۆڤە دەکات: 'لە کاتی پارەدانی پسولەکەدا خزمەتکاری ڕیستورانتێکی بچووک لە بەرلیندا وتی نرخی یەکێک لە خواردنەکان دە پێنی زیادی کردووە. کاتێک پرسیارم لێی کرد بۆچی ئەم زیادبوونە لەسەر لیستی خواردنەکان نەنووسراوە؟ وەڵامی دایەوە بە دڵنیاییەوە ئەو مەسەلەیەیان لەبیر کردووە، بەڵام ئەو دڵنیایە کە قسەکانی ڕاستە. کاتێک خزمەتکارەکە دەیویست پارەکە بنێتە گیرفانییەوە، دراوێکی دە پێنی لەسەر مێزەکە ڕێک لە بەردەممدا کەوتە سەر زەوییەکە. وتم: ئێستا تێدەگەم نرخی خواردنەکەت زیاد حساب کردووە. دەتەوێ بڕۆم و پرسیار لە سندووقی پارەوەرگرتن بکەم؟ وتی: ببوورە، مۆڵەتم بەرێ... چرکەیەک... ئینجا ون بوو.

پێویست بە شـرۆڤە ناکات، نەبوومە ڕێگر لە بەردەم ڕۆیشتنەکەیدا. پـاش دوو خـولەک گەڕایەوە داوای لێبـووردنی کـرد و وتـی تووشـی هەڵەیەکی بڕواپێنەکراو بووە و ئەو خواردنەی لەگەڵ خواردنێکی تردا بە هەڵە داینـاوە. من دراوە دە پێنییەکەم وەک بەخشش پێی بەخشـی، چونکە خزمەتکارەکە بۆ جەختکردنەوە لەسەر تیۆرییەکانی زیانناسیی دەروونی لە ژیانیدا کاریگەر بوو.'

کاتێـک چـاودێریی خەڵـک دەکەم لە کـاتی نانخواردنـدا، هەڵـومەرج دەدۆزینەوە تـا سـەیرترین و فێرکـاریترین کـردارە هێمادارەکانیان بە

چاو ببینین.
دکتور هانس ساکس بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە: "جارێکیان لە کاتی خواردنی نانی شەودا لای دوو هاوسەری بەساڵاچوو بووم کە خزمم بوون. ژنەکە نەخۆشی جەرگی هەبوو و لەژێر چاودێرییەکی سەختدا بوو. کاتێک گۆشتی کەبابکراویان هێنایە سەر مێزەکە، مێردەکە داوای لە هاوسەرەکەی کرد تا قاپی خەردەلەکەی پێ بدات. ژنەکە کە مافی ئەوەی نەبوو لە خواردنەکە بخوات دەرگای کافتریاکەی کردەوە و شووشەیەکی بچووکی شروبی هێنایە دەرەوە کە بۆ نەخۆشییەکەی پێیان دابوو و نایە بەردەمی مێردەکەی. هەڵبەت لە نێوان قاپە خەردەلەکە -بە شێوەی بەرمیلێکی بچووک- و شووشەی دەرمانەکەدا هیچ جۆرە هاوشێوەییەک لە ئارادا نەبوو تا بتوانێت پاساوی هەڵەکانی بدەنەوە. سەرەڕای ئەوە ژنەکە تەنها کاتێک ئاگاداری هەڵەکەی بووەوە کە مێردەکەی بە پێکەنینەوە سەرنجی ئەوی بۆ لای ئەو کارەی ئەنجامی دابوو، ڕاکێشا".

چەمکی ئەو کردارە هێمادارە بە ڕادەیەک بەرجەستەیە کە پێویست بە شرۆڤە ناکات. دکتۆر (داتنەر) خەڵکی ڤیەننا بوو، بوارێکی زۆر سەیر و بەئەزموونی لەم جۆرە هەڵانەی پێ وتم و ئەو کەسەی ڕووداوەکەی بینیوە بە کارامەییەوە کەڵکی لە هەڵەکە وەرگرتووە.

"لە ڕێستۆرانتێکدا لەگەڵ هاوکارە فەیلەسوفەکەمدا دکتۆر (ە) نانی نیوەڕۆمان دەخوارد. بۆی گێڕامەوە بارودۆخی فێرخوازێک زۆر دژوارە و لەو بارەیەوە وتی: پێش تەواوبوونی خوێندنەکەی وەک سکرتێر لە لای وەزیری ناوخۆی وڵاتی شیلی کاری کردووە. "پاشان وەزیر گۆڕا و من خۆمم بە وەزیری تازە نەناساند". ئەو لە کاتی دەربڕینی دوایین ڕستەدا لەتە شیرینییەکی برد بۆ دەمی، بەڵام بەشێک لە شیرینییەکە، کە گوایە بەهۆی ناشیبوونەوە لە بەین چەتاڵ

و چەقۆکەدا کەوتە خوارەوە. من خێرا لە چەمکی شاراوەی ئەو کردارە هێمادارە تێگەیشتم و بە شێوەیەک گوایە مەبەستێکی تایبەتم نییە، بە هاوکارەکەم کە تارادەیەکی کەم دەروونشیکاری دەناسێت وتم: "تۆ پارووەیەکی چەورت لەدەست چووا" ئەو تێنەگەیشت کە ئەو ڕستەیە دەتوانێت پەیوەند بێت بە کرداری هێمادار و بە گرووتینەوە وشەکانی دووپات کردەوە: "بەڵێ، لە ڕاستیدا پارووەیەکی چەورم لەدەست دا." پاشان وەک دەردەدڵکردن بە وردەکاریی زۆرەوە بۆم شرۆڤە کرد، بە چ شێوەیەک بە ناشیگەری ئەو پیشە پڕ داهاتەی لەدەست دابوو. ئەگەر بە باشی بیری لێ بکەمەوە کە کاک ە. بەهۆی قسەکردنی سەبارەت بە بارودۆخی شڵەژاوی سامانەکەیەوە لەگەڵ مندا –واتە ئەو کەسەی بە باشی دەیناسی– تارادەیەک هەستی بە نیگەرانی دەکرد، چەمکی کرداری هێمادارەکەی بە باشی تێدەگەین، بەڵام ئەو بیرکردنەوەیەی کە دەیویست لە خۆی دوور بخاتەوە بووە هۆی کردارێکی هێمادار و بە شێوەی نموونەیی ئەو شتەی دەبوایە بە نهێنی بمایابا، پیشانی دەدا. لەو ڕووەوە کەسی بەرامبەرم پاڵپشتێکی دۆزییەوە تا دەردەدڵ بکات و نەختێ ئارام ببێتەوە و ئەو پاڵپشتییەیشی لە ویژانی نەستییەوە سەرچاوەی دەگرت".

نموونەکانی لای خوارەوە پیشانی دەدات کاتێک بێ ئەنقەست تەنەکەیەک، کە هی کەسێکی ترە، هەڵیدەگرین و لەگەڵ خۆماندا دەیبەین کردارەکانمان چ واتایەکی دەبێت.

١- دکتۆر ب. داتنەر دەنووسێت: "یەکێک لە هاوکارەکانم بۆ بینینی کچێک ڕۆیشت کە هاوڕێی سەردەمی منداڵیی بوو. ئەو چاوپێکەوتنە یەکەم بینینیان بوو پاش هاوسەرگیریی کچە گەنجەکە. هاوکارەکەم شتێکی بۆ گێرامەوە و سەرسوورمانی خۆی دەربڕی لەبەر ئەوەی ناچار ببوو بە پێچەوانەی حەزی خۆیەوە ماوەیەکی

زۆر لەو خـانووەدا بمێنێـتەوە. جیـا لەوەیـش گێـڕایەوە کە بە چ شێوەیەک لە کاتی چاوپێکەوتندا تووشی هەڵەیەکی ڕەفتاری سەیر بووە.

مێـردی ژنەکەیـش کە لە وتوویژەکەیانـدا بەشـداری کردبـوو بـۆ چـرکەیەک بەدوای قـاوغە شـقارتەدا گەڕا، کە لەسـەر مێـزەکە بـوو. هاوکارەکەم بە باشی بە بیری دەهاتەوە کاتی هاتنە ناوەوە قاوغە شقارتەی بینیوە. هاوکارەکەیشم گیرفانەکانی دەگەڕا، چونکە بە خۆی دەوت بەهەرحاڵ، ئەگەری هەیە بە هەڵە ئەوم بەدەست هێنابێت، بەڵام گەڕان بە دوایدا بێ فایدە بوو. ئەو پاش ماوەیەک هەر ئەو قاوغە شقارتەیەی لەناو یەکێک لە گیرفانەکانیدا بینیەوە و لەوەی قاوغەکە تەنهـا یەک دانە چـیلکەی تیـایە سـەری سـوورما. پـاش دوو ڕۆژ خەونێکـی بینـی کە قـاوغە شـقارتەکە بە شـێوەیەکی نمـوونەیی دەرکەوتـووە و هـاوڕێی دەورانـی منداڵیی کەسایەتیی سـەرەکی ئەو خەونە بوو. ئەو خەونە جەختی لەسـەر ئەو شـرۆڤەیە دەکـردەوە کە من پێمدابوو، لە ڕاستیدا دەیویست بەو هەڵە ڕەفتارییە (بەدەستهێنانی بێ ئەنقەسـتی قـاوخە شـقارتەکە) مـافی ئەولەویـەتی تـایبەتی خـۆی ڕابگەیـەنێ، (چـونکە لە قـاوغە شـقارتەکەدا تەنهـا یەک دانـە چـیلکە هەبوو).

٢- دکتـۆر "هـانس سـاکس" دەنووسـێت: "خزمەتکارەکەمـان زۆر حەزێکی تایبەتی هەیە بۆ جۆرە کێکێک. ئەو لە هیچ بارودۆخێکدا لە خواردنی ئەو کێکە تایبەتە خۆی دوور ناخاتەوە. ڕۆژێکی یەکشـەممە، یەکێـک لەو کێکـانەی لەسـەر ڕەفەی چێشـتخانەکە دانـابوو. قـاپی خواردنەکـانی پێشـووی کـۆ کـردەوە و نـایە سـەر ئەو سـینییەی کە کێکەکەی تێدا هێنـابوو، بەڵام لە بـری ئەوەی پێمـان بڵێت فەرمـوون کێکەکە بخۆن، ئەوەی نایە سەر قاپە ڕیزکراوەکان و هەمـوو قاپ و

قاچاخەکانی لەگەڵ خۆی بردە ناو چێشتخانەکەوە. سەرەتا واماندەزانی دەیەوێت کێکەکە برازێنێتەوە، بەڵام چونکە نەگەڕایەوە هاوسەرەکەم بڕیاری دا بانگی لێ بکات، پرسی: "بتی، کێکەکەت چی لێ کرد؟" ناچار بووین وەبیری بهێنینەوە کە کێکەکەی گەڕاندوەتەوە بۆ چێشتخانەکە. لەبەر ئەوە بەبێ ئەوەی خزمەتکارەکە ئاگادار بێت چ کارێک ئەنجام دەدات، کێکەکەی نایە سەر سینی و بردیە چێشتخانەکە و لەسەر مێز یان شوێنێکی تر داینا.

سبەی بەیانییەکەی کاتێک دەمویست باقی کێکەکەیش بخۆم هاوسەرەکەم تێگەیشت ژنە خزمەتکارەکە دەستی لە بەشەکەی خۆی نەداوە. ئێمە هۆی دوورەپەرێزییەکەیمان پرسی. بە گومانەوە وەڵامی دایەوە ئارەزووی خواردنی ئەوەی نەبووە. هەموو ئەو رووداوە رەفتاری منداڵانەی خزمەتکارە گەنجەکە دەستنیشان دەکات: سەرەتا ئێرەیی و تەماعی منداڵێک کە نایەوێت خۆراکی حەزلێکراوی لەگەڵ کەسێکی تردا دابەش بکات، پاشان پەرچەکرداری منداڵانەی رق و کین: "ئێستا کە ناتوانم بە تەنهایی ببمە خاوەنی کێکەکە وای بە باش دەزانم قەد لێوی لێ نەدەم، هەمووی بۆ خۆتان".

کرداری بەهەڵکەوت یان هێمادار لە بارەی ژیانی ژنومێردایەتییەوە زۆر جار واتایەکی گرنگیان هەیە و دەتوانن ئەو کەسانەی لەگەڵ دەروونناسیی ویژدانی نەستدا ناسراو نین بڕوایان پێ بهێنن هەندێ رووداو شانسیان لەگەڵدایە و هەندێکیان وا نین. بۆ نموونە کاتێک ژنێکی گەنج ئەڵقەی هاوسەرگیرییەکەی لە کاتی مانگی هەنگوینیدا ون دەکات خەڵک بڕوایان وایە ئەوە دەسپێکی ژیانێکی نابەختەوەرییە. هەڵبەت زۆر جار بووکە تازەکە ئەڵقەکەی بەبێ تەرکیزی لە شوێنێکی نەشیاودا داناوە و لە ئاکامدا ئەڵقەکە دەدۆزرێتەوە، من بێوەژنێکم دەناسی ماوەیەک پێش تەڵاقوەرگرتن لە مێردەکەی زۆر جار لە کاتی

واژۆکردنی بەڵگەکانی لە بارەی ماڵوحاڵیەوە هەڵەی دەکرد و ناوی سیانی خۆی دەنووسی (ناوی بنەماڵەیی). ڕۆژێکیان ڕۆیشتم بۆ بینینی هاوسەرێکی گەنج کە تازە هاوسەرگیرییان کردبوو. بووکە تازەکە بە پێکەنینەوە دەیوت کاتی گەڕانەوەیان لە مانگی هەنگوینی ڕۆیشت بۆ بینینی خوشکەکەی و بە پێشنیاری ئەو بۆ کڕین ڕۆیشتوونەتە دوکانێکەوە لە حاڵێکدا مێردەکەی سەرقاڵی کاری تایبەتی خۆی بووە. بووکە تازەکە لە شەقامدا ڕێک بەرامبەر خۆی لە شوستەکەدا پیاوێکی بینیبوو کە ئامادەبوونی ئەو پیاوە لەوێ ببووە هۆی سەرسوڕمانی. بە خوشکەکەی وتبوو: "سەیرکە پێموایە کاک لیە". ئەو لەبیری کردبوو کە کاک ل. چەند هەفتەیەک دەبێت بووەتە مێردی خۆی. من کاتی بیستنی ئەو هەواڵە نیگەران بووم، بەڵام خۆم دوورخستەوە لە هەر جۆرە ئەنجاموەرگرتنێک لەو کارە، بەڵام دوای چەند ساڵ کاتێک هاوسەرگیرییەکەیان ئاکامێکی خراپی لێ کەوتەوە ئەو ڕووداوەم بە بیر هاتەوە.

تێبینییەکانی لای خوارەوە لە ڕاپۆرتێکی زۆر بەبایەخی کاک (ئا. میدەر)دا، کە بە زمانی فەرەنسی چاپ کراوە، تێهەڵکێش دەکەم. دەمتوانی ئەو نموونانە لە بەشی لەبیرچوونەوەکاندا لەبیر بکەم.

"خانمێک بۆی دەگێڕاینەوە لە بیری چووبووەوە جلی بووکێنییەکەی تاقی بکاتەوە و ڕێک لە کاتژمێر ٨ی شەودا پێش زەماوەندەکەی ئەو بابەتەی بیر هاتەوە لە حاڵێکدا بەردوورەکە لە بینینی مشتەرییەکەی نائومێد ببوو. ئەو خاڵە پیشاندەری ئەوەیە کە کچە گەنجەکە لەوەی جلی بووکێنییەکەی لەبەر بکات هەستی بە بەختەوەری نەدەکرد و هەوڵی دەدا ئەو بیرکردنەوە ئازاردەرە لە بیر بکات. ئێستا ئەو تەڵاقی وەرگرتووە".

یەکێک لە هاوڕێیانم کە زۆر ورد بووە و دەتوانێت هێماکان لێک

بداتەوە، بۆم گێڕایەوە، کە ئەکتەری بەناوبانگی نمایشنامەی تراژیدیا، (ئەلئۆنۆرا دیس) لە کاتی ڕۆلگێڕانی یەکێک لە ڕۆڵەکاندا تووشی هەڵەیەکی ڕەفتاری بوو، کە قووڵایی ڕۆلیگێڕانەکەی پیشان دەدات. ئەو لە درامایەکدا ڕۆلی دەگێڕا کە ناخی بێوەفایی و خیانەتی پیشان دەدا. ژنەکە پاش دەمەقاڵەیەک لەگەل مێردەکەیدا نوقمی بیرکردنەوەکانی خۆی بوو و خۆشەویستەکەی وردە وردە نزیکی دەبووەوە. لەو ماوە کورتەدا ئەلئۆنۆرا بە ئەلقەکەی کە لە پەنجەیدا بوو یاری دەکرد، ئەوەی لە پەنجەی هێنایە دەرەوە و دیسان لە پەنجەی کردەوە. ئەو بەو شێوەیە پیشانی دەدا ئامادەیە تا لە مێردەکەی جیا ببێتەوە و داببڕێت.

ئەو شتەی (ت. ڕیک) لە بارەی کردارە هێمادارەکانی ترەوە سەبارەت بە ئەلقە دەینووسێت لەگەل مەسەلەکەماندا پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی هەیە.

"ئەو کردارە هێمادارەی ژن و مێردەکان پیشانی دەدەن بەو شێوەیەی ئەلقەکەیان لە پەنجەیان بەبێ بیرکردنەوە دەردێنن دەناسین. هاوکارەکەم کاک ک. زنجیرە کردارێکی هێماداری ئەو بابەتەی ئەنجام داوە. یەکێک لەو کچانەی حەزی لێبوو مستیلەیەکی بە دیاری پێ دا و پێی ڕاسپارد ئەوە ون نەکات، چونکە ئەگەر ونی بکردایە بەو واتایە بوو کە ئیتر ئەوی خۆش ناوێت. پاش ئەوە بەردەوام هاوکارەکەم دەترسا نەکا مستیلەکەی ون بێت. کاتێک مستیلەکەی دەردەهێنا تا دەستی بشوات بەردەوام لەبیری دەکرد ئەوەی لە کوێ داناوە و زۆر جار پاش گەڕانێکی زۆر بە دوایدا مستیلەکەی دەدۆزییەوە. کاتێک نامەیەکی پۆست دەکرد دەترسا نەکا بە جووڵەیەکی ناشیانە دەستی بەر لێواری سندووقەکە بکەوێت و مستیلەکە لە پەنجەی بکەوێت، بیری لە نامەکە دەرکردەوە کە بکەوێتە بنی سندووقەکەوە. ڕۆژێکیان

ئەوەندە بە وردی جوولایەوە هەمان ڕووداو کە لێی دەترسا ڕووی دا. ئەو ڕۆژە ئەو خەریکی پۆستکردنی نامەیەک بوو بۆ یەکێک لە هاوڕێ دێرینەکانی، دەیویست پەیوەندیی لەگەڵ بپچڕێت، چونکە لە بەرامبەر ئەودا هەستی بە تاوان دەکرد. لە کاتی پۆستکردنی نامەکەدا لەپڕ دیسان حەزێکی تیا دروست بوو بۆ بینینی ئەو ژنە و ئەو حەزەیش کەوتە ململانێ بەرامبەر بە خۆشەویستە تازەکەی لە ناخی خۆیدا.

لە بارەی کردارە هێمادارەکانەوە کە مەسەلەی ئەڵقە یان مستیلەیە جارێکی تر جەختی لەسەر دەکەینەوە کە هەڵبەستوانان و نووسەران ئەو شتانەی کە دەروونشیکاری ئێستا دۆزیویەتیەوە ئەوان ماوەیەک لەوەوپێش هەستیان پێ کردووە و گریمانەیان کردووە. لە چیرۆکی "پێش لیزمەباران"دا بەرهەمی فونتان، تیرگانی، کە ڕاوێژکاری دادگایە لە کاتی مەرجێکدا دەڵێت: "ژنەکان بڕوا بکەن مەرجکردن هەندێک جار قووڵتر نهێنییەکان ئاشکرا دەکات". لە نێوان ئەو نموونانەیدا کە بۆ سەلماندنی کارەکانی خۆی دەیهێنێتەوە نموونەیەک لە ئارادایە کە شیاوی سەرنجدانە. دەڵێت: "بە بیرم دێت کە هاوسەری پرۆفیسۆرێک کاتێک قەڵەو بووە خووی بەوەوە گرتبوو هەموو جارێک مستیلەکەی لە دەستی دەربهێنێت و بۆ مەرجکردن بارمتە دابنێت، ڕەنگە خۆتان ئاگادار بن کە ئەو و مێردەکەی تا چ ڕادەیەک لە بەختەوەری خێزانی بێبەری بوون." هەروەها دەڵێت: "هەر لەو کۆڕەدا پیاوێک بەردەوام چەقۆیەکی دە کارەی هەبوو کە قوتووهەڵپچڕ و چەرخیشی هەبوو لەسەر ئەژنۆی ژنەکە دایدەنا تاکو لە ئاکامدا چەقۆ تیژەکە پاش چەند جار دڕینی تەنوورە ئاوریشمییەکەی لەناو دڕینی جلەکەیدا ون بوو و هەموو ئامادەبوان زۆر نیگەران و نائومێد بوون".

سەیر نییە کە مستیلەکە تەنانەت ئەو کاتانەیش کە چەمکی عاشقانە

نابەخشێت، واتە ئەڵقەی هاوسەرگیری، دەسگیرانی یان ئەڵقە نییە، دیسانەوە واتایەکی قووڵی هەبێت. دکتۆر کاردۆس نموونەیەکی زۆر سەیری پێ وتووم.

## هەڵەی ڕەفتاری یان دانپیادانانی خۆنەویست

چەند ساڵ لەوەوپێش ئەو پیاوەی لە من گەنجتر بوو و بیروبۆچوونەکانی قبوول دەکردم لە توێژینەوەکانمدا بەشداری دەکرد و بەرامبەر بە من هەڵوێستێکی نواند، کە هاوشێوەی ڕەفتاری شوێنکەوتوویەک بوو. من بە بۆنەیەکەوە مستیلەکەم بە دیاری پێدا و ئەو پێشکەشییە هەموو جارێک پەیوەندیمان بەهۆی لێک تێنەگەیشتنەوە تێک دەچووو دەبووە هۆی دەرکەوتنی ڕێژەیەکی زۆری کرداری هێمادار و هەڵەی ڕەفتاری. ماوەیەک لەوەوپێش ئەو ڕووداوێکی بۆ گێڕامەوە کە بە ڕاستی سەرنجڕاکێشە و چەمکێکی بەرجەستەی هەیە: ڕۆژێکیان ئەو بیانوویەکی دۆزییەوە و نەهات بۆ ئەو شوێنەی کە وادەی هەفتانەمان دانابوو، ئێمە لەو چاوپێکەوتنانەدا زۆر جار بە ئازادانە وتوویژمان دەکرد. لە ڕاستیدا ئەو وای بە باش زانیبوو بڕوات بۆ بینینی ژنێکی گەنج کە لە هەمان کاتدا وادەی چاوپێکەوتنی هەبوو. سبەی بەیانییەکەی ماوەیەک پاش دەرکەوتنی لە ماڵ تێگەیشت لە بیری کردووە مستیلەکەی پێ بدات. زۆر نیگەران بوو و لەبەر خۆیەوە وتی بێگومان ئەوەی لەسەر مێزی تەنیشت قەرەوێڵەکە، واتە ئەو شوێنەی زۆربەی شەوان لەوێ دایدەنا، دایناوبوو و دڵنیابوو کاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە دەیدۆزێتەوە. کاتێک گەیشتە ماڵەوە خێرا دەستی کرد بە گەڕان بە دوای مستیلەکەیدا، بەڵام سوودێکی نەبوو. مستیلەکە لەسەر مێزی تەنیشت قەرەوێڵەکە یان شوێنێکی تردا نەبوو. لە ئاکامدا بە بیری هاتەوە لانی کەم لە ساڵێک

لەوەوپێشــەوە ویســتوویەتی مســتیلەکە لەســەر مێــزی تەنیشــت قەرەوێلەکە لە لای چەقۆیەکی گیرفانیدا دابنێت لەو ڕووەوە وایزانی ڕەنگــە بە بێتەرکیــزی مســتلەکەی هاوکــات لەگــەڵ چەقــۆکەدا نــاوەتە گیرفانی. ئەوسا دەستی کرد بە گیرفانی هێلەکەکەیدا و مستیلەکەیشی لەوێدا دۆزییەوە.

پەندێکی پێشینیان و گشتی، بە پیاوێک کە دەیەوێت تووشی خیانەتێک بەرامبــەر بە هاوســەرەکەی ببێت پێشــنیار دەکــات: "ئەڵــقەکەت بنــێ گیرفــانی هێلــەکەکەت". لەو ڕووەوە ئەو گەنــجە چــونکە ئاگــاداری تاوانەکەی بــوو، گــوایە بە خــۆیی وتبوو: "تۆ شیاو نیت ئەو مستلەیە بکەیتە پەنــجەت"، پاشــان بە ئەنجامدانی هەڵەیەکــی ڕەفتــاری دانــی بە بێوەفاییــدا نــابوو. هەرچەنــد ئەو ڕووداوە شــایەتحاڵێکی نەبــوو، بەڵام ئەو بە ڕەفتارێکی ناڕاستەوخۆ، واتە بە شرۆڤەکردنی چیرۆک دانی بە بێوەفاییدا نابوو و (ئەو کارەیش پێشبینی نەدەکرا).

پیاوێکی بەساڵاچوو دەناسم لەگەڵ کچێکی زۆر گەنجدا هاوسەرگیری کردووە و لە بری ئەوەی هەر ئەو شەوە بڕوات بۆ مــانگی هەنگوێنی بڕیــاری دا شــەوی یەکەم لە ئوتێلێکدا لە پایتەخت بەســەر بەرێت. لە کــاتی گەشــتنیدا بــۆ ئــوتێلەکە بە نیگەرانییــەوە تێگەیشــت، کە جزدانــی ســەفەرەکەی لەگــەڵ خــۆی نەهێنــاوە. کــاتی هەبــوو تەلەفــۆن بــۆ خزمەتکــارەکەی بکــات، خزمەتکــارەکەیش جانتــاکەی لە گیرفــانی ئەو جلەی کە تــازە زاواکە کــاتی گەڕانەوەی لە بــۆنەی زەماوەندەکەیانــدا دەریهێنــابوو دۆزییەوە. پیاوە بەســاڵاچووەکە کە دیســانەوە پــارەکەی بەدەســت هێنــابووەوە ســبەی شــەو لەگــەڵ هاوســەرە گەنجەکەیــدا ڕۆیشت بۆ مانگی هەنگوێنی، بەڵام هەمان کێشەی بەسەر هات کە لێی دەترســا: ئەو شــەوی زەماوەنــدەکەی نەیتوانیبــوو کــاری جووتبــوون ئەنجام بدات. هۆی دڵگەرمییە ئەگەر وا بیر بکەینەوە زۆر جار کاتێک

کەسێک تەنەکەیەک ون دەکات تووشی کردارێکی هێمادار دەبێت، چونکە لەو ڕووەوە ونکردنی تەنەکەکە وەلامدەرەوەی نیازی نهێنی کەسەکەیە کە ببێتە قوربانی ڕووداوەکە. ونکردنی تەنەکەکە زۆر جار تەنها پێشاندەری ئەوەیە کەسەکە گرنگی و بایەخێکی زۆر دانانێت بۆ ئەو تەنەکە یان بۆ ئەو کەسەی دیاریەکەی پێ داوە. یان کە مەیل بۆ لەدەستدانی تەنەکەی تایبەت سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وەبیرهێنانەوەی بیرکردنەوەی نموونەیی لە نێوان تەنەکەیەک و تەنەکەکانی تر و زۆر گرنگتر، چونکە ئەو مەیلە دەتوانێت لە تەنەکەیەکی گرنگترەوە بگوازرێتەوە بۆ تەنەکەیەکی تایبەت. ونکردنی تەنەکەی بەنرخ لە خزمەتی دەربڕینی هەستە جۆراوجۆرەکاندایە. ئەو کارە دەتوانێت پەرچدانەوەی نموونەیەک لە بیرکردنەوەی نموونەیی سەرکوتکراوەوە بێت، تا ببێتە ئاگادارییەک کە کەسەکە ئامادە نییە گوێی پێ بدات یان (پێش هەر شتێکی تر) ئێمە دەبێ ونکردنی تەنەکە وەک "پێشکەشکەلێک" لە بەر چاوی بگرین کە دابەش دەبن بەسەر هێزی شاراوە و نەناسراودا، ئەو هێزانەی چارەنووسمان دیاری دەکەن و هێشتا فەرمانبردن لەوانە لەناو مرۆڤەکانی سەردەمماندا باوە.

لێرەدا بۆ یارمەتیدانی تیۆرییە گرێدراوەکان بە ونبوونی تەنەکەکان چەند نموونەیەکی تر دێنینەوە. دکتۆر ب. داتنەر دەنووسێت: "یەکێک لە هاوکارەکانم دەیگێڕایەوە بە هەڵکەوت سۆفتێکی ون کرد کە دوو ساڵ هەیبوو و بەهۆی ڕەواننووسینیەوە زۆر خۆشی دەویست. شیکردنەوە بارودۆخی لای خوارەوەی ئاشکرا کرد: شەوی پێش ڕووداوەکە هاوکارەکەم نامەیەکی زۆر نیگەرانکەری لە ژنبراکەیەوە بەدەست گەیشتبوو کە بەم ڕستەیە کۆتایی پێ دەهات: "هەروەها نە کاتم هەیە و نە حەزیشم لێیە کە ببمە هاندەری کەمتەرخەمی و تەمەڵیت." ئەو وورووژاویەی ئەم نامەیە لە بوونی ئەودا هەڵیدەخراند

بووە هۆی ئەوەی سبەی بەیانییەکەی سۆفتەکەی ون بکات، ئەو سۆفتەکەی لە هەمان ژنبرایەوە بە دیاری وەرگرتبوو. لەو ڕووەوە هاوکارەکەم سۆفتەکەی "قوربانی" کرد تا ئیتر هیچ جۆرە قەرزێکی بەسەر ژنبراکەیەوە نەبووبێت.

ژنێکی ناسیاوم دایکی مردبوو و ئیتر نەدەچوو بۆ شانۆ، چونکە ساڵرۆژی مردنەکەی دایکی نزیک بوو، بە پێداگری و پێشنیاری هاورێیانی وەڵامی ئەرێی دایەوە و بلیتێکی بڕی تا بۆ سەیرکردنی نمایشنامەیەکی سەیر بڕوات، بەڵام کاتێک گەیشتە بەردەمی بینای شانۆکە تێگەیشت بلیتەکەی ون کردووە و وای بیر کردەوە بەبێ ئەرکیزی بلیتی شانۆکەی لەگەڵ بلیتی تراماوکەدا لە کاتی دابەزین لە واگۆنەکەوە فڕێ داوە. یەکێک لە شانازییەکانی ئەو ژنە ئەوە بوو هەرگیز شتێک بەهۆی کەمتەرخەمییەوە ون نەکات. دەکرێ قبوڵ بکرێت ونکردنی تەنەکەیەکی تر بە دەستی هەمان ژن هۆکارگەلێکی هەبووبێت.

ئەو ڕۆیشتبووە شوێنی ئاوە گەرمەکە و بڕیاری دابوو بڕوات بۆ شوێنێکی خێزانی کە پێشتر تیایدا بوو و دیسانەوە یەکتر ببیننەوە. لەوێ بە گەرمی بەرەو پیریی چوون و دەعوەتیان کرد بۆ نانی شەو و کاتێک ویستی پسووڵەی مێزی نانخواردنەکەی خۆی بدات، پارەیان لێ وەرنەگرت و ئەویش کەمێ نیگەران بوو. تەنها مۆڵەتیان پێ دا بەخششێک بە خزمەتکارەکە بدات. ژنەکە جانتاکەی کردەوە و پارەیەکی یەک مارکی دەرهێنا. هەر ئەو شەوە خزمەتکاری خانووەکە پارەیەکی ٥ مارکی بۆ برد کە لەژێر مێزەکەدا دۆزیبوویەوە و بە بۆچوونی خاوەنماڵەکە تەنها دەبێت هی خانمە میوانەکە بێت. لەو ڕووەوە کاتێک جزدانی پارەکەی کردبووەوە تا بەخششێک بە خزمەتکارەکە بدات پارە ٥ مارکیەکە کەوتبووە سەر زەوییەکە. ڕەنگە

ئەو ژنە ویستبێتی بە پێداگرییەوە پارەی نانی شەوەکەی بدات.

لە راپۆرتێکی درێژدا کە وەک "چەمکی هێماداری ونکردنی تەنەکەکان" بڵاو کرایەوە کاک ئەتو رانک بۆ پیشاندانی تایبەتمەندیی "قوربانیبوون" یان "پیشکەشکردن"، کە لە ناخی ئەو کردارەدا حەشار دراوە و بۆ دیاریکردنی هۆکاری قووڵی ئەو کردارە هێماداره پارمەتی لە شیکردنەوەی خەونەکان وەرگرتووە. سەیرترین خاڵی بابەتەکە ئەوەیە کە نووسەر پیشانی دەدات نەک هەر ونکردنی تەنەکەکان هۆکاری شاراوەی هەیە، بەڵکوو دۆزینەوەیان زۆر جار لێکدانەوەیەکی بەم شێوەیە پەسەند دەکات. ئەم توێژینەوەیەی لای خوارەوە چەمکی تیۆرییەکە دەردەخات. دیارە کاتێک مەسەلەی ونبوونی تەنەکەکان لە ئارادایە تەنەکەیەک دەستنیشان کراوە لە حاڵێکدا لە کاتی "دۆزینەوە"دا دەبێ بە دوایدا بگەڕێیت.

کچێکی گەنج کە هێشتا باوک و دایکی مەسرەفیان دەکێشا دەیویست ئاڵتوونێکی هەرزان بکڕێت. نرخی ئەو تەنەکەیەی پرسی کە حەزی لێ دەکرد و زانی پارەی ئەوەی نییە. پاشەکەوتەکەشی دوو کورۆن لە نرخی ئەو ئاڵتۆنە شادیبەخشە کەمتر بوو. بە نیگەرانییەوە بەرەو ماڵ بەڕێ کەوت، لە کاتی رۆیشتنیدا بە ناو شەقامەکاندا کە لەو کات و ساتەدا زۆر قەرەباڵغ بوو لە فولکەیەکی زۆر قەرەباڵغدا، کە هاتوچۆ زۆر بوو و سەرەڕای ئەوەیش بە قووڵی نوقمی ئەندێشەکانی بوو، کاغەزێکی دڕاوی لەسەر زەوییەکە بینی و نزیک بوو بێ ئەوەی سەرنجی بدات ویستی بە ڕێی خۆیدا، بەڵام بیروڕای گۆڕی، چەمایەوە و کاغەزەکەی هەڵگرت و بە سەرسوورمانێکی زۆرەوە بینی پارەیەکی کاغەزی دوو کورۆنییە. لەبەر خۆیەوە وتی: "شانس و هەڵکەوت بووە هۆی دۆزینەوەی ئەم پارەیە تا من ئەو ئاڵتوونە بکڕم." ویستی ئەو ڕێگایەی لێوەی هاتووە پیایدا بگەڕێتەوە و

مەبەستەکەی جێبەجێ بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا بیری لێ کردەوە کە دۆزینەوەی پارەکەی پێوە نایەت و باشتر وایە پارەکە مەسرەف نەکات.

شیکردنەوەیەک کە دەتوانێت ئەو "شانسە" شیاوی تێگەیشتن بکات لە خۆڕا لە بارودۆخی باسکراوەوە سەرچاوە وەردەگرێت و پێویست بە پرسیار و وەڵام لە کەسی مەبەست ناکات. لە نێوان ئەو بیرکردنەوانەی لە کاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە مێشکی کچە نەوجەوانەکەی سەرقاڵ دەکرد بە دڵنیاییەوە لە قۆناغی یەکەمدا بیرکردنەوە لە هەژاری و کێشەی سەروەت و سامان بوو، ئێمەیش دەتوانین وا گریمانە بکەین مەیل بۆ لەناوبردنی خێرای کێشە ماڵییەکان بەندە بەم بیرکردنانەوە. بە ئەگەرێکی زۆر ئەو لە حاڵێکدا خۆشحاڵ بوو بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئاڵتوونە شازە، لە خۆی دەپرسی ئاسانترین ڕێگا بۆ تەواوکردنی بڕی پارەی پێویست چییە و زۆر سروشتییە کە لەبەر خۆیەوە وتبێتی: "ئەگەر ئەو دوو کورۆنەم، کە ئێستا نیمە، بمدۆزیبایەتەوە سەرنجی ئەو بە تەواوی بۆ سەر شتێکی تر دەڕۆیشت و بیرکردنەوەی هەڵێکی بەم شێوەیە نەگەیشتبێتە ویژدانی نەستی، دەتوانین بڵێین ویژدانی نەستی (یان ویژدانی نیوە وریا)ی ئەوی بۆ لای "کاری بەهەڵکەوت و شانس" ڕێنوێنی دەکرد، بۆیە ئەگەر نموونەی وام بە بیر بێتەوە کە شیکراونەتەوە دەتوانین بڵێین "ئارەزوو بۆ گەڕان" بە شێوەی نەست ئاسانتر لە سەرنجی وریایانە و ڕێنوێنیکراو دەتوانێ بگاتە دەرەنجامێکی پۆزەتیڤ. جیا لەوە بە دژواری دەکرێ شرۆڤە بکرێت بە چ شێوەیەک لە نێوان سەد کەسدا کە هەر ئەو ڕێگایە دەبڕن ڕێک هەر ئەو کچە بەو دۆزینەوەیە گەیشت. ئەو دۆزینەوەیەی کە بەهۆی تاریکی کەشوهەوای ئێوارە و فشار و شان لەیەکدانی هاتوچووی خەڵکی بەپەلەوە بەلایەوە سەرسووڕهێنەر بوو. بۆ پیشاندانی هێزی ئەو ئاراستەیە یان نیوە

وریایانە دەبێ ئەو خاڵە سەرنجراکێشەی پێ زیاد بکەین: ئەو کچە پاش یەکەمین دۆزینەوە، دۆزینەوەیەکی تری کرد. ئەو لە سووچی چۆڵ و تاریکی ئەو گەڕەکەدا دەسماڵێکی دۆزییەوە. هەرچەند دۆزینەوەی پارەی دوو کوڕۆنی بەو شێوەیەی ئەو دەیویست بووەتە هۆی خوشحاڵیی و لەو ڕووەوە بە دڵنیاییەوە ئارەزوو بۆ دۆزینەوەی تەنەکەیەکی تر لە ویژدانی نەستدا بە تەواوی دوور خرابووەوە و بەهەرحاڵ، نەیدەتوانی سەرنجی وریایانەی ئەو ڕێنوێنی و ئاراستە بدات. با بڵێم ئەو جۆرە کردارە هێمادارانە لە ڕاستیدا باشترین ڕێگایە بۆ ناسینی ژیانی دەروونی و هەروەها دەروونی مرۆڤمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

بەشی دەیەم

هەڵەکان

جیاوازی لە نێوان هەڵەی زەین و لەبیرچوونەوەی هاوڕا لەگەڵ بیرەوەرییە درۆینەکاندا زۆر کەمە. تەنها جیاوازییان ئەوەیە مرۆڤ هەڵەکانی زەین بە هەڵە دانانێت و بڕوایان پێ دەکات. وا دیارە کەڵکوەرگرتن لە وشەی "هەڵە" بەندە بە مەرجێکی ترەوە، ئێمە کاتێک وشەی "هەڵە" لە بری دەستەواژەی "بیرەوەرییە درۆینەکان" بەکار دێنین، کە لە نۆژەنکردنەوەی بوارە دەروونییەکاندا پێداگر بین و پشت بە "ڕاستییە بەرچاوەکان" ببەستین، واتە کاتێک بمانەوێت شتێکی تر لە بری ڕاستییەک لە ژویانی دەروونی کەسێک کە هەوڵ دەدات مەسەلەکان بە بیری خۆی بهێێتەوە و بیری بێتەوە، ئەو شتەی کە بتوانێ بە گوێرەی بیرەوەرییەکانی کەسانی تر جەختی لەسەر

بکرێتەوە یان حاشای لێ بکرێت. بە پێی ئەو لێکدانەوەیە، هەڵەی زەین دژە لەگەڵ نادانی و نائاگاییدا.

لە کتێبێکدا بە ناوی "لێکدانەوەی خەونەکان"، کە لەساڵی ١٩٠٠ـی زاینی بە چاپم گەیاند، لە بارەی ڕووداوە مێژوویی و... هتد، تووشی هەڵەیەکی زۆر بووم، کاتێک پاش بڵاوبوونەوەی کتێبەکە ئەوەم خوێندەوە لەو هەموو هەڵەیە سەیرم لێ هات و سەرم سووڕما. ئەوەندەی پێنەچوو کە بە خوێندنەوەیەکی قووڵ تێگەیشتم کە هەڵەکان بە هیچ شێوەیەک بەهۆی نادانی منەوە نەبووە، بەڵکوو زەین بووە کە بە شیکردنەوە بە ئاسانی ڕاڤە دەکرێت.

١- لە لاپەڕەی ٢٦٦دا لە شاری "ماربۆرگ" کە لە "ستیری"دا بوو، وەک شوێنی لەدایکبوونی "شیلێر" ناوی لێ هێناوە. هۆکاری ئەو هەڵەیە لە شیکردنەوەی خەوندا دەدۆزینەوە کە لە ماوەی گەشتێکی شەوانەدا بینیم. من لەناکاو بە دەنگی شۆفێرێک کە گەیشتن لە وێستگەی ماربۆرگی ڕادەگەیاند خەبەرم بووەوە و خەونەکەیش لە بارەی یەکێک لە بەرهەمەکانی شیلێرەوە بوو. هەرچەند شیلێر لە شاری ماربۆرگ کە زانکۆی تیایە لەدایک بووە، بەڵکوو لەشاری "ماربــاخ" لە نــاوچەی "سوئاب" لەدایک بووە. من جەختی لەسەر دەکەمەوە ئەو مەسەلەیەم دەزانی.

٢- لە لاپەڕەی ١٣٥دا من ناوی باوکی "هانیباڵ"م بە ناوی "هاسدێربیاڵ"ەوە هێناوە. ئەم هەڵەیە زۆر ئازاردەرە لەسەر ڕوانگەی من، سەبارەت بەم جۆرە هەڵانە. خوێنەرانێکی دەگمەن باشتر لە من چیرۆکی "بارکیدەکان" دەزانن، بەهەرحاڵ، من تووشی هەڵەیەکی وەها بووم و سێ بەرگم لە بەرهەمەکەم بینی بێ ئەوەی بە هەڵەکەمدا بچمەوە. باوکی هانیباڵ ناوی "هامیکار بارکاس"ە و هاسدێربیاڵ ناوی براکەی هانیباڵە و هەروەها ناوی مێردی خوشکەکەی و فەرماندەی

پێشووی سوپایەکە کە هانیبال فەرماندەیی ئەو سوپایەی لە ئەستۆدا بوو.

لە لاپەڕەی ١٧٧ و ٣٧٠ـی کتێبەکەدا، نووسیومە کە "زئوس" تەختی پاشایەتی "کرۆنۆس"ـی ڕووخاند و ئینجا ئەوی خەساندووە. من بە هەڵە ئەو جینایەتە سامناکەم پەیوەند کرد بە یەک نەوە دواترەوە، چونکە لە ئەفسانەکانی یۆناندا ئەو کەسەی کە تەختی پاشایەتی باوکی ڕووخاند و ئەوی خەساند "ئۆرانۆس" بوو.

بەڵام بۆچی زەینم لە بارەی ئەو خاڵانەوە تووشی بۆشایی بووە لە حاڵێکدا، کە (هیوادارم خوێنەران حاشا لەو وتەیە نەکەن)، زۆر جار دوورترین و نائاساییترین بابەتەکان بە ئاسانی بەبیر دەهێنمەوە، بۆچی سەرەڕای ئەوەی سێ جار پیاچوونەوەی بەڵگەکانم کردبوو، ئەو هەڵەیەم لەبەرچاو نەگرتبوو بە شێوەیەک کە دەتوت ئایا چاوم نابینا بووە؟ گوتە لە بارەی "لیشتێنبێرگ"ـەوە دەڵێت: "لە هەموو گاڵتەجارییەکاندا نهێنییەک شاردراوەتەوە" لە بارەی بەشە باسکراوەکانی کتێبەکەمەوە دەبێ هەر ئەو ڕستەیە بوترێت. لە پشت هەموو هەڵەیەکەوە، مەسەلەیەک ماوەتەوە یان بە وردی بڵێین نەبوونی ڕاستگۆیی یان ئاڵوگۆڕێک لەسەر بنەمای مەسەلە سەرکوتکراوەکان بوونی هەیە. لە شیکردنەوەی ئەو خەونانەی بەندە بەو بەشانەوە ناچار بووم بەهۆی چۆنیەتی ئەو مەسەلانەی کە ئەندێشەی خەونەکانی پێوە بەند بوو، شیکردنەوەکە پێش کۆتاییپێهاتن، لە قۆناغێکدا ڕایوەستێنم و هەروەها بە نەختێ ئاڵوگۆڕەوە لە گرنگی چەند خاڵێکی نەوتراو کەم بکەنەوە. بە گشتی ئەگەر بمویستایە چەند نموونە و بەڵگەیەک بێنمەوە هەڵبژاردن و چارەسەرێکم جگە لەوە نەبوو، بۆیە لە بارودۆخێکی دژواردا بووم کە لە چۆنێتی خەونەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە خەون بەیانکەری

مەسەلەی سەرکوتکراوە، واتە ئەو مەسەلەیە کە ئەستمان بەوانە ناگات. هەرچەند حەساس، سەرسووڕهێنەرتر و نیگەرانکەرتر دەکات. ئاڵوگۆڕ یان بەڵاوەنانی هەندێ لە ئەندێشەکان، کە بە باشی دەمناسی و بەربڵاوی تەواویان هەبوو، نەیدەتوانی بەبێ ئەوەی شوێنپێیەک لە خۆی بەجێ بهێڵێت، ئەنجام بدات. لەم ڕووەوە ئەو شتانەی دەمویست بەلاوەی بنێم، هەندێک جار بەبێ ئەوەی بزانم لەو شتانەی کە دەمنووسی شوێنێکی بۆ خۆی دەکردەوە و بە شێوەی هەڵە خۆی دەردەخست. جیا لەوەیش لە سێ نموونەی لای سەرەوە کە باسمان کرد، مەسەلەکە یەکسان بوو، ئەو ئەندێشە سەرکوتکراوانەی کە لە بارەی باوکی کۆچکردوومەوە بوو، بووە هۆی دەرکەوتنی هەڵەکان. ئێستایش دیسانەوە سەرنج دەخەمە سەر ئەو هەڵانە.

ئەگەر دیسانەوە ئەو خەونەی لە لاپەڕەی ٢٦٦ـی کتێبەکەمدا شیم کردووەتەوە بیخوێننەوە، ڕاستەوخۆ یان لەملا و لەولای هەندێ لە ئاماژەکان تێدەگەن باسەکەم بە ناتەواوی هێشتۆتەوە، چونکە کەمێکی مابوو بیر لە ئەندێشەیەک بکەمەوە کە دەیتوانی ڕەخنەیەکی توند لە بەرامبەر باوکم لەخۆ بگرێت. بە دوای ئەو زنجیرە ئەندێشە و بیرەوەرییانەدا، ڕووداوێکی ناخۆشم دەدۆزییەوە کە تیایدا، کتێبەکە ڕۆڵی هەبوو و یەکێک لە هاوڕێکان و شەریکەکانی باوکم بە ناوی ماربۆرگەوە، واتە ناوی ئەو وێستگەیە کە شۆفێری شەمەندەفەرەکە لەوێ بەخەبەر بوو و بووە بەربەست بۆ درێژپێدان بە خەوەکەم بەوێ ئامادە بوو. من لە کاتی شیکردنەوەدا دەمویست ئامادەبوونی کاک ماربۆرگ لە خۆم و خوێنەران بشارمەوە، بەڵام ئەو تۆڵەی خۆی کردەوە و بە نهێنی چووە بەشێک لە کتێبەکە کە هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵیدا نەبوو و وشەی مارباخ، واتە شاری لەدایکبوونی شیلی، ڕیگۆری و وەک ماربۆرگی لێ کرد.

ئەو هەڵەیەی بووە هۆی ئەوەی لە بری هامیکار ناوی هاسدیربباڵ

بەرم، واتە براکەی، لە بری ئەوەی ناو باوکی دابنێم، بەندە بەو کۆمەڵە ئەندێشانەی پەیوەندە بە حەز و ئارەزووومەوە بۆ هانیباڵ لە دەورانی دواناوەندیدا و هەروەها بۆ خۆشحاڵنەبوونم لە ڕەفتار و ڕوانگەی باوکم لە بەرامبەر ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە کە بە وتەی ئەو "دوژمنەکانی نەتەوەی ئێمە بوون" هەڵبەت دەمتوانی بە دوای ڕەوتی ئەو بیرکردنەوانەدا بڕۆم و ڕاڤەی بکەم، کە بە چ شێوەیەک پاش گەشتێک بۆ بەریتانیا، ڕوانگەی من بەرمبەر بە باوکم گۆڕا، لە ڕاستیدا لەو وڵاتە زڕبراکەم ناسی، باوکم لە یەکەمین هاوسەرگیریدا ئەو منداڵەی بە یادگاری هەبوو. زڕبراکەشم کوڕێکی هەبوو هاوشێوەی من بوو. بۆیە ڕەنگە بە شێوازێکی پەسەندکراو دەرەنجامەکانی ئەو ئەگەرەم لە بەرچاو گرتبێت، کە دەمتوانی کوڕی باوکم نەبم، بەڵکوو کوڕی براکەم بم. ئینجا ڕێک لەو حاڵەتەدا کە شیکردنەوەکەم ڕاگرتبوو ئەو خەونانە بووە هۆی هەڵەیەک لە بابەتەکەدا کە دەمنووسی و منیش لە بابەتەکەدا بە هەڵە ناوی براکەیم لە بری ناوی باوکی دانا و جێگیرم کرد.

٣- به بۆچوونی من ئەو هەڵەیەی بووە هۆی ئەوەی خیابانی سامناکی ئەفسانەکانی "ئۆلیمپ"ـی یۆنان یەک نەوە بخەمە پێشەوە، لەژێر کاریگەری ئەو بیرەوەرییەی براکەمدا ڕووی دا. یەکێک لەو پەندانەی پێی وتبووم بۆ ماوەیەکی زۆر لە مێشکمدا مایەوە. براکەم وتبووی: "لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتی ژیانتدا شتێک لەبیر مەکە، ئەگەر یەکەمین جیلی بنەماڵەکەمان باوکمان بێت، تۆ هی دووەمین جیل نیت، بەڵکوو هی سێیەمین جیلیت."

جیا لەوەیش باوکمان دوایی بۆ جاری سێیەم هاوسەرگیری کرد لە حاڵێکدا مناڵەکانی هاوسەری دووەمی تاڕادەیەک تەمەنیان گەورە بوو. من ڕێک لە سوچێک لە کتێبەکەدا تووشی هەڵەیەک بووم و

باسم لە ڕێزگرتنی منداڵان بەرامبەر بە باوک و دایکان دەکرد.

چەندین جار ڕووی دا کە هاوڕێیانیان ئەو نەخۆشانەی شرۆڤەی خەونەکانیانم بڵاو دەکردەوە، یان لە شیکردنەوەکانمدا ئاماژەم پێیان دەدا، سەرنجیان ڕادەکێشا بۆ لای ئەو هەڵانەی لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکەکەدا لە بارەی هەر ڕووداوێکەوە هاتبووە ئارا. لەم بوارانەدا مەسەلەی هەڵەی مێژوویی لە ئارادایە. من پاش پیاچوونەوەی هەموو بوارە باسکراوەکان دیسانەوە شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن، دڵنیا بوومەوە بیرەوەرییەکانم لە بارەی ڕووداوە ڕاستییەکانەوە تەنها لەو شوێنانەیدا کە پێم وابووە دەبێ لە کاتی شیکردنەوەدا خاڵێک بشارمەوە یان شێوازەکەی بگۆڕم، لێی ورد نەبوومەتەوە و ڕاست نەبوون. لەم ڕووەوە لێرەدا مەسەلەکە لە بارەی هەڵەیەکەوەیە کە نادیار دەمێنێتەوە، چونکە دەڵێی سزادانی سەرکوتکردنێکە لەگەڵ بەلاوەنانی بەئەنقەست.

ئەو هەڵانەی لە سەرکوتبوونەوە سەرچاوە دەگرن دەبێ لەو هەڵانەی کە سەرچاوەکەی نائاگایی ڕاستەقینەیە بە وردی جیابکرێنەوە. بۆ نموونە ڕۆژێکیان کە لە "واخا"دا ڕۆیشتبووم بۆ گونی "ئەمێرس دۆرف"، بەهۆی نادانی و نائاگاییەوە وامزانی چوومەتە شوێنی لەدایکبوونی شۆڕشگێڕی بەناوبانگ "فشیهۆف"، لە حاڵێکدا تەنها هاوشێوەی نێوان ئەو دوو گوندە، هاوشێوەبوونی تەواوی ناوەکانە. ئەمێرس دۆرف گوندی لەدایکبووی فشیهۆفە لە "کۆرێنسی"دا و منیش ئەو بابەتەم نەدەزانی.

لێرەدا هەڵەیەکی فێرکاری شرۆڤە دەکەم، کە بووە هۆی شەرمەزاریم و لە ڕاستیدا نموونەیەکە لە بێئاگایی کاتی. ڕۆژێکیان نەخۆشێک تکای لێ کردم تا ئەو دوو کتێبەی لە بارەی "ڤنیز"ـەوە هەمبوو بە قەرز بیدەمێ، تا پێش گەشتەکەی بۆ "ڤنیز" بۆ تێپەڕکردنی پشووی جەژنی

پاک سەیریکیان بکات. من وتم: "ئەو دوو کتێبەم ئامادە کردووە". ڕۆیشتم بۆ ژووری تەنیشت و بەرەو کتێبخانە ڕۆیشتم، بەلام لە ڕاستیدا بە تەواوی لەبیرم کردبوو کتێبەکان ئامادە بکەم، چونکە گەشتکردنی نەخۆشەکەم بەدڵم نەبوو و ئەو گەشتەم بە ڕاوەستاندنێکی بێهوودە دەزانی لە ڕەوتی چارەسەرکردندا، جیا لەوەیش لە بواری ئابوورییەوە زیانم پێ دەگەیشت. خێرا سەیرێکی کتێبخانەکەم کرد تا ئەو دوو کتێبەی بەڵێنم دابوو بیدۆزمەوە. یەکێک لەوانە کە "ڤنیز" ناوەندی هونەری بوو دۆزیمەوە، بەلام بە ئەگەری زۆر کتێبێکی مێژوویيم لە بارەی ڤینیزەوە هەبوو، کە هی ئەو کوڵکیشنە بوو. ئەو کتێبەیشم دۆزییەوە. ناوی کتێبەکە "بنەماڵەی مدیسی" بوو. هەردوو کتێبەکەم بۆ نەخۆشەکە برد، بەلام خێرا بە شەرمەزارییەوە تێگەیشتم تووشی هەڵەیەک بووم. من بە باشی دەمزانی بنەماڵەی مدسیی پەیوەندییان بە شاری ڤینیزەوە نییە، بەلام لە کاتی هەڵگرتنی کتێبەکەدا هیچ بیرم لەوە نەدەکردەوە کتێبێک لە بارەی بنەماڵەی مدیسیەوە سوودی بۆ کەسێک نییە، کە دەیەوێت بچێت بۆ ڤینیز. چەندین جار نەخۆشەکەم بەهۆی هێما جەستەییەکانییەوە لۆمە کردبوو، تەنها ڕێگەچارە بۆ ڕاگرتنی ڕێز و باروردۆخەکە ئەوە بوو، کە بەڕاستی و بەبێ دوورکەوتنەوە لە مەسەلەکە دانی پێدا بنێم؛ چ هاندانێکی شاراوە دژی گەشتکردنەکەی لە مێشکمدا هەبووە.

کاتێک دەبینین ئاراستە بەرەو درکاندنی ڕاستییەکان زۆر بەهێزترە لەوەی کە بیری لێ دەکەینەوە سەرمان سووڕ دەمێنێت. ڕەنگە خودی من لە دەرەنجامی توێژینەوەکانم لە بارەی دەروونشیکارییەوە بەڕادەیەک گەیشتبم کە نەتوانم درۆ بکەم، هەر کات دەمەوێ ڕووداوێک بە شێوەیەکی تر پیشان بدەم تووشی هەڵە یان هەڵەی ڕەفتارێکی تر دەبم کە لە بارەی مەسەلەی پێشوتر یان لەو بوارانەی

باس کرا، نەبوونی ڕاستیم ئاشکرا دەکات.

میکانیزمی هەڵە لە میکانیزمی هەموو هەڵە ڕەفتارییەکانی تر سستترە، مەبەستم لە درکاندنی ئەو خاڵە ئەوەیە بە شێوەیەکی گشتی کاتێک چالاکی دەروونی بە گوێرەی هەڵە دەبێ لە کێشمەکێشدا بە کاریگەری دانانی شڵەژەندن دابنرێت، هەڵە ڕوو دەدا. بەو لێکدانەوەیە جۆری هەڵە بەهۆی چۆنیەتی ئەندێشەی شڵەژاندنەوە کە لە قووڵایی زەمینەی دەروونی شاردراوەتەوە دەستنیشان ناکرێت. سەرباری ئەوەیش دەبێ درێژەی پێ بدەین کە دەتوانین هەر ئە و بارودۆخانە لە زۆربەی نموونەکانی هەڵەی زمانەوانی یان هەڵەی نووسین ببیستین.

هەر جارە و تووشی یەکێک لەو هەڵانە دەبین و دەبێ ئەنجام وەربگرین، کە تێکچوون لەو دەرەنجامانەی لە چوارچێوەی مەبەست و ئامانجەکانمان نەناسراون پێکهاتوون، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ قبووڵی بکەین هەڵەی زمانەوانی یان نووسین لە یاسای هاوشێوەیی پەیڕەو دەکەن، یان مەیلەو ئاسانکردن یان مەیلەو خێرایی گرێدراون و کەسی "هەڵەکار" لە هەڵەکەیدا یەکێک لە تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکانی نادرکێنێت. نەرمی و سووری زمان دەتوانێ هەڵەکان دیاری بکات و هەندێ سنووری بۆ دابنێت.

لەبەر ئەوەی تەنها باس لە هەڵەکانی خۆمان نەکەین، دەمەوێت نموونەیەکی تر باس بکەم، کە لە هەمان کاتدا دەیانتوانی بچنە ڕیزی هەڵەی زمانەوانییەوە یان هەڵەکان (جیا لەوەیش ئەو مەسەلەیە هیچ گرنگییەکی نییە، چونکە هەموو جۆرە هەڵەیەکی ڕەفتاری بە تەواوی هاوشێوەی یەکترن).

١- یەکێک لە نەخۆشەکانم دەیویست پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەو ژنەی حەزی لێی بوو بپچڕێنێت، خووی بە ژنەکەوە گرتبوو و منیش

دەمزانی هەر جۆرە قسە و باسێک، دژوەستان بەو خووە، دژوارتری دەکات. لەم ڕووەوە وتم تەلەفۆن بۆ ئەو ژنە نەکات و پێشنیارم بۆ کرد سەرباری کێشەکانی ناردنی نامە، نامەیەکی بۆ بنووسێت و بڕیاری خۆی پێ ڕابگەیەنێت. کاتژمێر یەکی پاش نیوەڕۆ نەخۆشەکە هات بۆ لام و وتی ڕێگەچارەیەکی بۆ دوورخستنەوە لە کێشەی گەیاندنی نامە بە دەستی ئەو ژنە دۆزیوەتەوە. ئەو لە کاتی قسەکردندا لێی پرسیم ئایا دەتوانێ لە دەسەڵاتی پزیشکیی من لەو بارەوە کەڵک وەربگرێت یان نا؟ نزیکەی کاتژمێر دوو لە حاڵێکدا خەریکی نووسینی نامەی باسکراو بوو، لەپڕ دەستی لە نووسین هەڵگرت و بە دایکی کە لەوێ بوو، وت: سەیرە لەبیرم کرد لە پزیشکەکە بپرسم ئایا دەتوانم ناوی بێنمە سەر زار یان نا؟ پاشان خێرا بەرەو لای تەلەفۆنەکە ڕایکرد، ژمارەکەی ویست و پرسی: "ئایا دەتوانم پاش خواردنی نانی شەو چاوپێکەوتنم هەبێت لەگەڵ جەنابی پرۆفیسۆردا؟ لەوبەر تەلەوە ئەو دەنگەی کە بە پێشنیاری من ئیتر نەگەیشتبایە گوێی نەخۆشەکە بە زارێکی سەیر پرسی: "ئادۆلف، ئایا شێت بووی؟". نەخۆشەکە تەنها تووشی "هەڵە"یەک ببوو و لەبری ژمارە تەلەفۆنەکەم، داوای ژمارە تەلەفۆنی ئەو ژنەی کردبوو.

٢- ژنێکی گەنج بڕیاری دا بڕوات و سەردانی یەکێک لە هاوڕێکانی بکات، کە تازە زەماوەندی کردبوو و هاوسەرگیری کردبوو و لە "هابس بۆ گێرشتراسێ" نیشتەجێ بوو و لەوێدا دەژیا. لە کاتی نانخواردندا باسی لەو چاوپێکەوتنە کرد، بەڵام بە هەڵە وتی دەبێ بڕوات بۆ کۆڵانی "با بێن بورگێرشتراسێ"، ئەو کەسانەی لەسەر مێزی نانخواردنەکەدا بوون، پێکەنین و سەرنجیان ڕاکێشا بۆ لای هەڵەکەی، یان بە وتەی خۆیان بۆ لای هەڵەی زمانەوانییەکەی. ژنە گەنجەکە بەبێ ئەوەی ئاگادار بێت تووشی ئەو هەڵەیە ببوو. لە ڕاستیدا دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕووداوە لە شاری ڤیەننادا کۆماری

ڕاگەیەندرابوو و ئالای ڕەش و زەرد لەناو چووبوو و گۆڕا بوو بە ئالای کۆن زەویوزاری خۆرهەلات بە ڕەنگی سوور و سپی و سوور، بنەماڵەی "هابس بۆرگ"یش پاشایەتییەکەیان ڕووخا. لەم ڕووەوە ژنە گەنجەکە بەشبەحاڵی خۆی ناوی "هابس بۆرگ"ی لەسەر ئەو کۆلانەی کە هێشتا بە ناوی ئەو بنەماڵەیەوە ناوبانگی هەبوو سڕیبووەوە. هەروەها لە ڤیەننا "بابێن بورگێر شتراسێ" ناوێکی بەناوبانگە، بەلام ناوی کۆلانێک نییە، بەڵکوو ناوی شەقامێکە.

٣- مامۆستایەکی گەنج و زۆر هەژار، کە ڕواڵەتێکی کەشخەی هەبوو لە کاتی گەشتەکەیدا بۆ تێپەڕاندنی پشوو، حەزی دەربڕی بەرامبەر کچی یەکێک لە خاوەن ڤیلاکان کە زستانان لە پایتەختدا کاتیان بەسەر دەبرد. لە ئاکامدا خۆشەویستییەکی ئاگرینی وەها لە دڵیدا داگیرسا کە سەرەڕای ناکۆکی چینایەتی و نەتەوەیی، بەهەرحاڵ کچەکە توانی ڕێکەوتن و هاوڕابوونی باوک و دایکی بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو مامۆستایەدا بەدەست بهێنێت. ڕۆژێکیان پیاوە گەنجەکە نامەیەکی بۆ براکەی نووسی و دەریبڕی: "ئەو کچە جوان نییە، بەلام زۆر میهرەبانە و لەو بارەیەشەوە هیچ گومانێک لە ئارادا نییە، بەڵکوو ئایا من بڕیار دەدەم لەگەڵ کچێکی جوولەکەدا هاوسەرگیری بکەم؟ لەو بارەیەوە هێشتا ناتوانم وەلامێکی ڕاشکاوتان پێ بدەم." نامەکە گەیشتە دەستی کچە گەنجەکە و کۆتایی بەو خۆشەویستییە ئاگرینە هێنا. لە حاڵێکدا برای مامۆستا گەنجەکە لە هەمان کاتدا نامەیەکی بەدەست گەیشت و لە ناوەڕۆکەکەی سەری سوڕما: نووسەری نامەکە دانی بەخۆشەویستی پڕ گڕوتینی خۆیدا دانا. ئەو کەسەی ئەو ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە دڵنیای کردمەوە مەسەلەکە تەنها بەهۆی هەڵەیەکەوە بووە و مامۆستایش مەبەستی فرتوفێڵ نەبووە. بوارێکی تریش بەو شێوەیە دەناسم: ژنێک لە پزیشکەکەی ناڕازی بوو و زاتی نەبوو بە ڕاشکاوی مەسەلەکە بگێڕێتەوە، بەهەرحاڵ ئەو

بە جێبەجێکردنی نامەکان بە ئاماجی خۆی گەیشت. لانی کەم لێرەدا دەتوانم گەرەنتی بکەم هەڵەیەک لە ئارادا بووە و ئەو ژنەیش لە شێوازی کلاسیک و میلۆدراماتیک کەڵکی وەرنەگرتووە و فرتوفێل و هەست (خۆئاگایی) بوونی نەبووە.

٤- جەنابی "بریل" دەیگێڕایەوە ژنێک کاتێک دەیویست لە بارەی هاوڕێی هاوبەشیان هەواڵێک بزانێت، هەر بە ناوی بنەماڵەیی دەورانی سەڵتبوونی ناوی هاوڕێیەکەی دەبرد کاتێک سەرنجیان بۆ لای ئەو هەڵەیە راکێشا، دانی پیادا نا کە تەحەمولی هاوڕێکەی ناکات و ئەو هەڵەیە هەرگیز بە دڵی ئەو نەبووە.

٥- ئەمەیش هەڵەیەکە کە لە هەمان کاتدا دەنگدانەوەی هەڵەیەکی زمانەوانییە:

پیاوێکی گەنج بۆ راگەیاندنی لەدایکبوونی دووهەمین کچی رۆیشت بۆ دایرەی رەگەزنامە، کاتێ ناوی منداڵەکەیان لێ پرسی، وەلامی دایەوە "هانا"، بەرپرسی دەرهێنانی ناسنامە جەختی لەسەر کردەوە ئەو منداڵێکی تری هەر بەم ناوەوە هەیە. لەم هەڵەیە دەکرێ دەرەئەنجام وەربگیردرێت کە باوک و دایکەکە زیاتر لەدایکبوونی کچی یەکەمیان بە لاوە چێژبەخشە تاوەکو لەدایکبوونی کچی دووهەمیان.

٦- چەند شیکردنەوەیەکی تر لە بارەی بەهەڵەداچوونی ناوەکان بۆ سەر ئەم پێرستە زیاد دەکەم. ئاسان بوو دەمتوانی ئەو نموونانە لە بەشەکانی تری کتێبەکەدا بخەمە روو.

ژنێک سێ کچی هەبوو، دوو کچی یەکەمیان هاوسەرگیرییان کردبوو و کچی سێیەم چاوەڕێی چارەنووسی داهاتووی بوو. یەکێک لە هاوڕێیان شتێکی چاخواردنی زۆر جوانی زیوی بە دیاری دایە هەردوو تازەبووکەکە. دایکی هەر جارەو لە بارەی ئەو سێتی

ته‌نیـــاحـــاجی

Tanya Haji | ته‌نیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چه‌ناڵێک تایبه‌ت به کتێب و بابه‌تی جیاواز🤍

**ئه‌م کتێبه له‌لایه‌ن خاتوون " ئاڤان به‌هجه‌ت " کراوه به دیاری بۆ خوێنه‌ران**

چه‌ناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مه‌ینێره↓
@tanyahaji22

ئه‌کاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link



چاخواردنەوە قسەی دەکرد، بە هەڵە ئەوەی بە کچی سێیەمی گری دەدا و بە هی ئەوی دەزانی. ئاشکرایە بە پەنابردن بۆ ئەو هەڵەیە حەزی خۆی بۆ هاوسەرگیری کچی سێیەمی دەردەبڕی و لە هەمان کاتیشدا پێی وابوو ئەو دیارییەکی وەها وەردەگرێت.

هەر بەو ئاسانییە دەکرێ شرۆڤە بکرێت، بۆچی دایکێک لە بارەی ناوی کچ و کوڕ و زاواکانییەوە هەڵە دەکات.

ئەوەیش نموونەیەکی زۆر جوانە لە هەڵەکردنی نێوان ناوەکان، کە شرۆڤەیەکی سادەی هەیە. ئەو نموونەیە پەیوەند بە کاک (ی.ک) و خۆی ئەو ڕاپۆرتەی داوە، ڕووداوەکە لە ئارایشتگادا ڕووی داوە.

"لەسەر مێزی خانەخوێی ئارایشتگە، لە کاتی وتوێژێکدا کە بە لامەوە زۆر سەیر بوو و بە شێوەیەکی زۆر کلاسیکی درێژەی هەبوو، ڕووم لە ژنێک کرد، کە لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو و ڕستەیەکی زۆر هاوڕێیانەم پێوت. کچەکە کە زۆر گەنج نەبوو نەیتوانی دوورەپەرێزی بکات لە باسنەکردنی ئەو خاڵە کە من ئەو خووەم نەبووە ئەوەندە بەئەدەب و نزیکی بم. ئەو ئاگادارکردنەوەیە لە لایەکەوە جۆرێک دەربڕینی داخ و خەفەت و لە لایەکی تریشەوە ئاماژەیەکی ڕاشکاو بوو بۆ خاتوو ئازەب، کە هەردووکمان دەمانناسی و من خووم دابوو بەوەی سەرنجی بدەم و ئارەزووی بۆ دەرببڕم. بە ئاسانی لە مەبەستی تێگەیشتم. لە وتووێژی داوییدا من چەندین جار و بە شێلکاری هەر ئەو کچەی لە تەنیشتم دانیشتبوو بە ناوی ئەو ئازەبەوە بانگم لێ کرد، کە بە بۆچوونی ئەو ڕکابەری بەختەوەری بوو و هەر جارە و مەسەلەکە ئازاردەر دەبوو کە بە هەڵەکانمدا دەچوومەوە.

٧- ڕووداوی خوارەوە بە جۆرێک لە هەڵە دادەنێم و جددیتر دێتەر بەرچاو، شایەتحاڵێکی ڕاستەقینە ئەو ڕووداوەی بۆ شرۆڤە کردووە.

ژنێک دوای نیوەڕۆی ڕۆژێک لەگەڵ دوو پیاوی بێگانە و مێردەکەیدا لە سەیرانگایەکدا تێپەڕ کرد. یەکێک لەو دوو پیاوە بە ڕواڵەت بێگانەیە هاوڕێی نزیکی ئەو بوو و هیچ کەسێک ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نەبوو و نەدەبوا ئاگادار بوایەن. دوو کەسی بێگانە، ژن و مێردەکەیان تا نزیکی ماڵەوە ڕەوانە کرد. ژن و مێردەکە لە حاڵێکدا چاوەڕێی کردنەوەی دەرگاکە بوون، ماڵئاواییان لێ کردن. ژنەکە بەرەو لای یەکێک لەو دوو پیاوە بێگانەیە چەمایەوە و دەستی بەرەو لای درێژ کردەوە، چەند ڕستەی هاوڕێیانەی وەک خولککردن وت. پاشان قۆڵی پیاوەکەی تری گرت، واتە هاوڕێ نزیکەکەی. بەرەو لای مێردەکەی گەڕایەوە و ویستی ماڵئاویی لەگەڵدا بکات. مێردەکەی بە ئاسانی گاڵتەکەی قبووڵ کرد و کڵاوەکەی لە سەری هەڵگرت و بە زارێکی زۆر بەئەدەبەوە وتی: "خانمی بەڕێز، من وەک ئەدەب و ڕێز دەستت ماچ دەکەم." ژنەکە زۆر نیگەران بوو و ترسا و قۆڵی خۆشەویستەکەی بەردا و دیسان دەرفەتی هەبوو تا پێش ئەوەی مێردەکەی ئاگادار ببێتەوە، بە دەنگی بەرز بڵێت: "ئۆ چ ڕووداوێک!" مێردەکە لەو کەسانە بوو کە خیانەتی هاوسەرەکەی بە تەواوی بە مەسەلەیەکی نەکراو دادەنا. چەندین جار سوێندی خواردبوو ئەگەر هاوسەرەکەی خیانەتی لێ بکات ژیانی خۆی و دولبەزەکەی لەناو دەبات، لەم ڕووەوە هۆکاری زۆری هەبوو تا لە واتای دژبەرانەی هەڵەی هاوسەرەکەی تێنەگات کە دەیتوانی دەرەنجامی خراپی هەبێت.

٨- هەڵەیەک بە شێوەی دژ دووپات بووەوە و ڕووداوەکەیشی بە ڕاستی ئەزموونبەخشە. ئەو پیاوە گەنجەی بە ڕاستی گومانی هەبوو، پاش کێشمەکێشی دەروونی لە ئاکامدا بڕیاری دا بەڵێنی هاوسەرگیری بەو کچە گەنجە بدات کە خۆشی دەویست و ماوەیەکە دڵی پێ دابوو. ئەو پاش ڕەوانەکردنی دەسگیرانەکەی بە هەستی بەختەوەرییەکی فراوان، سواری تراموڵکە بوو و داوای دوو بلیتی لە

فرۆشیارەکە کرد. پاش شەش مانگ هاوسەرگیری کردبوو، بەڵام بەختەوەری خێزانیی بە تەواو نەدەهاتە بەرچاو، پرسیاری لە خۆی دەکرد ئایا هاوسەرگیرییەکەی کاری باش بووە یان نا، ئینجا خەفەتی دەخوارد کە پەیوەندی هاوڕێیانەی سەردەی ڕابردووی لەدەست داوە. شەوێکیان پاش ئەوەی بەدوای هاوسەرەکەیدا ڕۆیشت بۆ ماڵی باوکی، لەگەڵیدا سواری تراموای بوو و خۆی ڕازی کرد کە تەنها یەک بلیت لە فرۆشیارەکە بکڕێت.

٩- جەنابی کاک میدر "لە ڕاپۆرتێکی نوێدا لە بارەی زیانئایی" نموونەیەکی سەیر پیشان دەدات، کە ئارەزوویەکی سەرکوتکراو بە پێچەوانەی ئارەزووی سێکسییەوە دەتوانێ بە یارمەتی هەڵەکردن بەتاڵ ببێتەوە: یەکێک لە هاوکاران دەیویست بە ئاسوودەییەوە لە ڕۆژێکی پێشوودان کەڵک وەربگرێت، بەڵام پێویست بوو "لووسێرن" سەردانی نەخۆشێک بکات و بڕیاری دا بڕوات بۆ ئەوێ. بۆ خۆسەرقاڵکردن لە ڕێگای زوریخ "ئەرت گۆڵدەو" ڕۆژنامەی خوێندەوە و لە دوایین وێستگەدا شەمەنەفەرەکەی گۆڕی و درێژەی بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە دا. لە کاتی گەشتەکەیدا پشکێنەری شەمەنەفەرەکە پێی وتبوو سواری ئەو شەمەنەفەرە نەبووە. کە دەبوا سوای ببوایە، لە بری ئەوە سواری شەمەنەفەرێک بووە کە لە گوڵدەوە بۆ زوریخ دەگەڕێتەوە، لە حاڵێکدا بلیتەکەی بەرەو سوولێرن بوو.

١٠- دکتۆر و. توسک لە بابەتێکیدا بە ناوی "ڕێگا هەڵەکان" نموونەیەکی هێناوەتەوە، کە تیایدا هەوڵدانێکی هاوشێوە بە پەنابردن بۆ هەڵە بۆ بەتاڵکردنەوەی ئارەزوویەکی سەرکوتکراوە دەبینرێت، هەڵبەت ئەو هەوڵدانەی کە سەرکەوتوو بوو. "بۆ تێپەڕکردنی مۆڵەتی پشوو، لە بەرەی شەڕ گەڕامەوە بۆ ڤیەننا، نەخۆشێکی کۆن ئاگادار

بــووه کــه مــن گەڕاومەتەوە و داوای لــێ کــردم لەبەر ئەوەی خەواندوویانە برۆم چاوم پێی بکەوێت. داواکەیم قبوول کرد و دوو کاتژمێر لە لای مامەوە. کاتێک لەو ماڵە هاتمە دەرەوە نەخۆشەکە لێی پرسیم حەقی زەحمەتەکەم چەند دەکات. وەڵامم دایەوە: "من لە کاتی پشــوودام و ئیشــی پزیشــکی نــاکەم، چــاوپێکەوتنەکەم وەک چاوپێکەوتنێکی هاوڕێیانە دابنێ". نەخۆشەکە سەیری لێ هات، چونکە دەیزانــی مــافی ئەوەی نییە ڕێسا پزیشکییەکان وەک یــارمەتییەکی هاوڕێیانە چاو لێ بکات. بەهەرحاڵ، لە بەرامبەر وەڵامەکەمدا تەسلیم بوو و لەبەر خۆیــەوە بیری لــێ کردەوە (ئەو بــاوەڕەی ســەرچاوەی دەگرت، ئارەزووی بۆ پاشکەوتی (مافی هەبوون) کە من وەک کارە گەورە ئاساییەکە تووشــی گومــان بــووم و هەســتی خۆشــحاڵنەبوونم واتایەکی زۆر ڕوونی هەبوو. بەهەرحاڵ، سواری تراموای هێڵی OC بووم، پاش تێپەڕبوونی ڕێگایەکی کورت دەبوا تراموواکەم بگۆڕیــایە و ســوار هێڵــی Y ببومــایە. کاتێک چاوەڕێی ترامــوای دووەم بــووم، مەســەلەی حەقی زەحــمەتەکەم لە بیــر کردبــوو و بیــرم لە هێماکــانی نەخۆشــی ئەو پیــاوە دەکــردەوە. ئەو ترامــوایەی چــاوەڕێی دەکــردم گەیشت و سواری بووم، بەڵام دەبوا لە یەکەم وێستگەدا دابەزیمــایە، چونکە لە بری ئەوەی سواری تراموای هێڵی Y ببم دیســانەوە ڕێگای هێڵی(X) م گرتبوو و بە پێچەوانەوە سوار بووم. گوایە چونکە حەقی زەحمەتەکەم قبوڵ نەکردبوو دەمویست دیسانەوە بگەڕێمەوە بۆ ماڵی نەخۆشەکە. لە ڕاستیدا نەستم پێداگر بوو بۆ وەرگرتنی ئەو پارەیە.

١١- ڕووداوێک وەک نموونە لە دکتۆر "میدیۆ"وە دەگێڕمــەوە کە بۆ خۆیشــم ڕووی دا. مــن پاش مــاوەیەکی زۆر بە بــرا گەورەکەم کە کەسێکی زۆر حەساسە بەڵێنم دابوو بڕۆم بیبینم. دەبوا لە قەراغــی دەریایەکی بەریتانی ئەوم ببینیایە، چونکە کاتێکی زۆرم لە بەردەســتدا نەبــوو، دەبــوا نزیکتــرین ڕێگــام هەڵبــژاردایە و لە هــیچ شــوێنێکدا

رانەوەستامایە، تەنها دەمتوانی ڕۆژێک لە هۆڵەندا بمێنمەوە و پێیم وابوو کاتی گەڕانەوە لەوێ لابدەم و بوەستم. لەم ڕووەوە لە ڕێگای 'کولویەن'وە لە ڤیەننا چوومە دەرەوە تا بچمە 'ڕوتێردام هووک' و لەوێوە بە شەمەندەفەری کاتژمێر دوانزەی شەو بگەمە 'هارویچ'. دەبوا لە کولویەندا شەمەندەفەرم بگۆڕیایە و سواری شەمەندەفەری خێرای ڕوتردام بوایەم، بەڵام نەمتوانی ئەو شەمەندەفەرە بدۆزمەوە. پرسیارم لە چەند کارکەری هێڵی ئاسن کرد، هەرکامەیان منیان بەرەو لای یەکێک لە سەکۆکان دەنارد، خەریک بوو نائومێد ببم بە تایبەت کاتێک لە کاتژمێری ڕۆیشتنی شەمەندەفەرەکان ورد بوومەوە، تێگەیشتم هەموو ئەو بەدواداگەڕانانە بووەتە هۆی ئەوەی شەمەندەفەرەکەم لەدەست بچێت. لە بەرامبەر ئەو ڕاستییانەدا سەرەتا پرسیارم لە خۆم کرد: ئایا باشتر نییە شەو لە کولویەندا بمێنمەوە؟ ئەو بڕیارە بەهۆی هەستی بەزەیی بە من ئیلهام بوو، بەهۆی مەسەلە و چیرۆکێکی خێزانییەوە باپیرانم ناچار ببوون لەو شارە هەڵبێن تا گیانیان بپارێزرێت لەو زەرەر و زیانەی کە خەڵکی یاخی شارەکە لە جوولەکەکانیان دەدا.

بەڵام پاش چەد خولەکێک بۆچوونم گۆڕی و بڕیارم دا بە شەمەندەفەرێکی تر بگەڕێمەوە بۆ ڕوتێردام. هەڵبەت بەو شەمەنەفەرە نیوەشەو دەگەیشتمەوە شوێنی مەبەست و ناچار دەبووم ڕۆژێک لە هۆڵەندا بمێنمەوە. لەم ڕووەوە توانیم ئەو نەخشەیەی دەمێکە لە مێشکمدا پەروەردەی دەکەم، پراکتیکی بکەمەوە، بینینی وێنە زۆر شازەکانی 'ڕێمبرەنت'، لە لاهەر و لە مۆزەی ئەمستردام. سبەینێ دوای نیوەڕۆکەی کاتێک لە شەمەندەفەرێکی بەریتانیدا دانیشتبووم و بە هەڵسەنگاندنەکانی دوێنێدا دەچوومەوە، بە شێوەیەکی زۆر بەرجەستە بە بیرم هاتەوە، کە لە وێستگەی شەمەنەفەری کولویەن، چەند هەنگاوێک لە نزیک ئەو شەمەنەفەرەی لێی دادەبەزیم و لەسەر

هەمان سەکۆ، تابلۆیەکی گەورەم بە ناوی "ڕۆتێردام هووک، هۆڵەندا" لەسەر شەمەنەفەرەکەوە بینیوە. ئەو شەمەنەفەرەی دەبوا بۆ درێژەدان بە گەشتەکەم سواری بوایەم لەوێ ڕاوەستابوو، شەوارەیەکی بەڕاستی بڕواپێنەکراو ببوە هۆی ئەوەی بەو شەمەنەفەرە دوور بکەومەوە و لە شوێنەکانی تردا بەدوای شەمەنەفەردا بگەڕێم. دەبێ قبوڵی بکەم سەرباری هەموو ڕاسپاردەکانی براکەم پێی دابووم وێنەکانی ڕێبرەنت لە کاتی گەشت بۆ بەریتانیا ببینم. درێژەی ڕووداوەکە: نیگەرانی و شڵەژاوی ڕواڵەتی، مەبەستی ڕێزلێنانی بابوباپیران، کە لەناکاو ئیلهامیان بۆ زەینم کردبوو شەو لە کولویەندا بمێنمەوە و هەموو ئەو شتانە تەنها هەڵخەڵەتاندنێک بوو دەبوایە نەخشە ڕاستییەکەی لە بەرچاوم بشادایەتەوە تا ناچارم بکات مەبەستی نەستم پراکتیک بکەمەوە.

١٢- جەنابی کاک "می. شتراکێ" بارودۆخی کەسێکی دەگێڕایەوە، کە تیایدا هەڵخەڵەتاندنێکی هاوشێوەبوونی هەبوو: لەبیرچوونەوە ئەوەندە لە شوێنی خۆیدا گونجاو بوو کە بەتاڵکردنەوەی ئەو ئارەزووەی ئەو کەسە، کە پێی وا بوو لەبیری کردووە و پێویستی پێی نییە، پراکتیکی کردەوە.

"دەبوایە ڕۆژێک لە گوندێکدا کۆنفرانسێکم بدایە و هاوکاتیش هەندێ وێنەم پیشان بدایە. بەرواری کۆنفرانسی بێ پێشەکییەکە هەشت ڕۆژ دواکەوت. من پاش وەڵامدانەوە بەو نامەیەی، کە ئەو هەواڵەی ڕادەگەیاند لەسەر ڕۆژژمێرەکەم بەرواری تازەم نووسی. هەڵبەت پڕبەدڵ ئامادە بووم هەمان ڕۆژ دوای نیوەڕۆکەی بڕۆم بۆ ئەو گوندە تا کاتم هەبێت بڕۆم و سەردانی نووسەرێک بکەم، کە یەکێک لە ناسیاوەکانم بوو و لەوێ نیشتەجێ بوو. بە داخەوە ئەو ڕۆژە دوای نیوەڕۆکەی کاتم نەبوو و لە جێبەجێکردنی نەخشەکە پاشگەز

بوومەوە.

سەر لە ئێوارەی ئەو شەوەی دەبوا کۆنفرانسەکەم بگرتایە بەپەلە لە حالێکدا جانتایەک پڕ لە کلیشەم بەدەستەوە بوو بۆ پیشاندانی وێنەکان بەرەو لای وێستگەی هێلی ئاسن بەڕێ کەوتم و بۆ ئەوەی درەنگ نەکەون سواری تاکسییەک بووم (زۆر جار ڕوو دەدات کاتێک دەمەوێت سواری شەمەنەفەرێک ببم لە دوایین ساتەکاندا لە ماڵ دەچمە دەرەوە و بە ناچاری ئەو ڕێگایە بە تەکسی دەبڕم). کاتێک گەیشتمە شوێنی مەبەست بە سەرسووڕمانێکی زۆرەوە بینیم هیچ کەسێک نەهاتووە بەرەو پیرم (چونکە لە گوندە بچووکەکاندا دابونەریت وایە کاتێک کەسێک بانگ دەکەن بۆ قسە و کۆنفرانس، لە وێستگەی شەمەنەفەردا بەرەو پیری دەچن). لەناکاو بیرم هاتەوە کۆنفرانسەکەم یەک هەفتە دواکەوتووە و من بێهوودە ئەو گەشتەم کردووە، چونکە هێشتا بیرم لە لای ئەو بەروارە بوو یەکەم جار دیاری کرابوو. پاش ئەوەی لە ناخی دڵمەوە لەعنەتم بۆ ئەو لەبیرچوونەوەیە نارد پرسیارم لە خۆم کرد: ئایا باشتر نییە بە یەکەمین شەمەنەفەر بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە؟ بەڵام خێرا بە خۆم وت، ئێستا کاتێکی باشە تا سەردانی هاوڕێ نووسەرەکەم بکەم، هەر ئەو کارەیشم کرد. لە نیوەی ڕێگادا تێگەیشتم ئارەزووم بۆ ئەو چاوپێکەوتنە بە چ شێوەیەکی جوان ئەو پلانەی دارشتووە (کە جیا لەو بارودۆخە نەدەکرا). قورسایی ئەو جانتایەی پێم بوو و پڕ بوو لەو کلێشانەی دەبوا بڵاو بکرایەتەوە و پیشان بدرایەن و پەلەپەلکردنم بۆ گەیشتن بە وێستگەی شەمەنەفەر لە کاتژمێری دیاریکراودا یارمەتی دابووم تا زووتر مەبەستی نەستم لە بەرچاوم بە شاراوەیی ڕابگرم.

ڕەنگە پێم بڵێن ئەو هەڵانەی لەم بەشەدا هەڵمسەنگاندون ڕێژەیان

زۆر نییە و واتایەکی گرنگیان نییە، بەلام لەم بارەوە ئیجازەتان لێ وەردەگرم بپرسم ئایا بۆچوونەکانمان بە راڤەکردنی هەڵەی دادوەریی زۆر گرنگتر کە خەڵک لە ژیانیاندا و لە چالاکی پراکتیکیدا تووشی دەبن، شیاوی پێوانەکردن نییە؟ وا دیارە تەنها زەینی جیاواز و خاوەن هاوسەنگییەکی تەواو دەتوانن لەرە دەرەکییەکان وێنایەکی وردبینتر رابگرن، ئەو وێنایە زۆر جار لە کاتی تێپەڕبوون لە تاکەکەسی دەروونی کەسی وەرگر ئاڵوگۆڕی بەسەر دێت و تەنها زەینە هەڵکەوتووەکان دەتوانن ئەو وێنایە بە شێوەی یەکەمین جار بپارێزن.

بەشی یانزەیەم

زنجیرەی هەڵە رەفتارییەکان

دوو نموونە لە نموونەکانی بەشی پێشوو، واتە هەڵەی من لە بارەی بنەماڵەی "مدسیی" کە ئەوانەم بە دانیشتووی شاری ڤنیز ناساند و هەڵەی پیاوێکی گەنج سەرباری ڕێگربوونی بۆ ئەوەی تەلەفۆن بۆ ژنە خۆشەویستەکەی نەکات، پەیوەندی لەگەڵ گرت بە وردی شی نەکرایەوە. خوێندنەوەی پوولتر وەها دەریدەخات ئەو نموونەیە دەرئەنجامی تێکەڵاوبوونی بیرکردنەوەیەک و هەڵەیەکەوە دەبێت. لەو نموونانەدا کە ئێستا باسی دەکەم تێکەڵاوییەکە بە ڕاشکاوییەکی زیاترەوە ئاشکرا دەبێت.

١- یەکێک لە هاورێکانم ئەم ڕووداوەی لای خوارەوەی بۆ گێڕامەوە: "چەند ساڵ لەوەوبەر، هەوڵم دا تاکو ببمە ئەندامی کۆمیتەی لیژنەیەکی ئەدەبی. هیوادار بووم لیژنەکە هەندێ ئاسانکاری بکات بۆ

پیشاندانی یەکێک لە نمایشەکانم. لە کۆبوونەوەکانی کۆمیتەدا کە ڕۆژانی هەینی پێک دەهات، هەڵبەت بەبێ گروتینێکی زۆر، بەشداریم دەکرد. چەند مانگ لەوەوبەر دڵنیایان کردمەوە نمایشنامەکەم لە شانۆی ف.دا دەڕواتە سەر پەردە، ئینجا من لەو کاتە بەدواوە تا ئێستا لەبیرم دەچێت بەشداری ئەو کۆبوونەوانە بکەم. کاتێک بەرهەمەکانی تۆم خوێندەوە بەهۆی لەبیرچوونەوەمەوە شەرمەزار بووم و بە خۆمم وت: "چونکە ئیتر پێویستت بە ئەندامانی ئەو کۆمیتەیە نەماوە، ناچی بۆ کۆبوونەوەکان و ئەوەیش کارێکی دوور لە ئەدەبە". لەم ڕووەوە بڕیارم دا لە کۆبوونەوەی هەینی داهاتوودا حەتمەن بەشداری بکەم. بەردەوام بیر لەو بڕیارە دەکەمەوە و کاتێک بڕیارەکەم جێبەجێ کرد بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە خۆمم لە بەرامبەر دەرگای درخراودا بینییەوە، لە ڕاستیدا هەڵەم کردبوو و ڕۆژی شەممە ڕۆشتبووم بۆ شوێنی چاوپێکەوتنەکە و بەو شێوەیەی باسم کرد کۆبوونەوەکان ڕۆژی هەینی بەڕێوە دەچوو.

٢- نموونەی لای خوارەوە پەرچەکرداری تێکەڵاوییەکە لە هەڵەیەکی ڕەفتاری و نەبوونی دەرفەتی دۆزینەوەی یەک شتومەک. ئەو نموونەیە لە ڕێگایەکی درێژتر و پڕ پێچوپەناترێکەوە بە دەستم گەیشتووە، بەڵام سەرچاوەیەکی ڕاستە.

ژنێک لەگەڵ مێردی خوشکەکەی کەوێنەکێشێکی بەناوبانگە ڕۆیشت بۆ شاری ڕۆما. ئەڵمانییەکانی دانیشتووی ڕۆما پێشوازییەکی زۆریان لە پیاوە وێنەکێشەکە کرد و جیا لە دیارییەکانی تر، مەدالیایەکی ئاڵتوونی ئاسەواریان پێشکەش کرد. ژنەکە بە نیگەرانییەوە تێگەیشت مێردی خوشکەکەی نرخ و بایەخی ئەو مەدالیایە بە باشی نازانێت، هاوسەری پیاوە وێنەکێشەکە لە بری خوشکەکەی ڕۆیشت بۆ ڕۆما و ئەویش گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. کاتێک جانتاکانی کردەوە بینی

مەدالیاکەی لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە، بەڵام هیچ ئاگاداری ئەو کارە نەبوو، خێرا مەسەلەکەی بۆ مێردی خوشکەکەی گێڕایەوە و وتی: سبەی مەدالیاکەی بۆ دەنێرمەوە، بەڵام ڕۆژی دوایی هەرچەند گەڕا مەدالیـــاکەی نەدۆزیـــیەوە. ئەو شـــتومەکێکی وەهـــای بە وردی شـاردبووەوە کە نەیـدەتوانی بیـدۆزێتەوە و بینێرێـت. ئەوسا واتـای "نەبوونی تەرکیز"ـی خۆی دۆزییەوە، ئەو ئارەزووی وا بوو مەدالیا ئاڵتوونە جوانەکە بۆ خۆی ڕابگرێت.

ئێسـتا چەنـد نمـوونە لە هەڵە ڕەفتارییەکـان بـاس دەکەیـن، کە بە ئێنکاری، بەڵام هەر جارە و بە شێوازێکی جیاواز دووپات بوونەتەوە.

"جۆنس" ڕاقـەی دەکـرد بە چەنـد هۆکـارێکی نادیـار کە جارێکیـان نامەیەکی نووسیبوو، چەند ڕۆژێک لەسەر مێزی نووسینەکەی بەجێی هێشتبوو. بەهەرحاڵ، ڕۆژێکیان بڕیاری دا ئەوە بنێرێت، بەڵام "بەشی خزمەتگـوزاری پۆسـتەی نـامە کاتبەسـەرچووەکان" نـامەکەی بـۆ ناردەوە، چونکە ئەو لە بیری کردبوو ناونیشانی وەرگرەکە بنووسێت. جۆنس پاش چاککردنەوەی ئەو هەڵەیە، دیسـانەوە نـامەیەکی خسـتە ناو سندووقی پۆستەکەوە، بەڵام ئەمجارەیان پولی نەلکاندبوو بەسەر نامەکەدا. ئینجـا تێگەیشـت هـیچ ئـارەزوویەکی بـۆ نـاردنی ئەو نـامەیە نەبووە.

نمـوونەی لەبیرکردنـی لای خـوارەوە دکتـۆر "کارێـل وایـس" (خەڵکـی ڤیەننـــا) بە باشـــی لێکـــی داوەتەوە. ئەو بە شـــێوەیەکی زۆر ســـەیر گێـڕاویەتەوە چ هەوڵـدانێکی بێهـوودەی بـۆ ئەنجامـدانی پراکتیکـی – ســـەرباری خـــۆڕاگرییەکی دەروونـــی- کـــردووە. دکتـــۆر وایـــس دەنووسێت: "بواری لای خوارەوە پیشان دەدات نەست کاتێک مافی ئەوەی هەیە دژ بە سـەرگرتنی مەبەسـتێک بووەسـتێت، دەتـوانێ بە چ شێلکارییەکی توندەوە خۆڕاگری بکات و چەندە بە سەختی دەتوانێت

به پێچەوانەی ئاراستەکەی بەرگری لە خۆی بکات. یەکێک لە هاورێیان کتێبێک کە بە لایەوە باش بوو لە کتێبخانەکەی مندا بینیی و داوای لێ کردم تا سبەی بۆی بەرم. بەڵێنم پێ دا، بەڵام خێرا هەستم بە نیگەرانی کرد و سەرەتا نەمتوانی هۆکاری نیگەرانییەکەم بدۆزمەوە. ماوەیەک دوای ئەوە هۆکاری ئەو هەستەم دۆزییەوە: ئەو هاورێیە چەند ساڵ لەوەوبەر بڕێک پارەی بە قەرز لێ وەرگرتبووم، بەڵام وا دیار بوو تەنانەت بیری لە دانەوەی پارەکەیش نەکردووەتەوە. پاش چەند چرکە ئیتر بیرم لەو مەسەلەیە نەدەکردەوە، بەڵام سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی هەمان هەستی نیگەرانی دیسانەوە ڕووی تێکردم و خێرا بە خۆمم وت: "نەستت هەموو هەوڵێکی خۆی دەخاتە گەڕ تا ئەو بەڵێنەی بە هاورێکەتت داوە لەبیر بکەیت، بەڵام تۆ ناتەوێ هاورێکەت بڕەنجێنیت و بەشبەحاڵی خۆت هەموو هەوڵێک دەدەیت تا تووشی لەبیرکردن نەبیت. خێرا چووم بۆ کتێبخانە و کتێبەکەم بە کاغەزێکەوە ئاڵاند و لەسەر مێزی نووسینەکە دامنا، پاشان دەستم کرد بە نووسینی نامەیەک. پاش کاتژمێرێک لە ماڵ چوومە دەرەوە. هێشتا چەند هەنگاوێک دوور نەکەوتبوومەوە بە بیرم هاتەوە ئەو نامانەی دەمویست پۆستیان بکەم لەسەر مێزی نووسینکە بەجێم هێشت. (ئاماژەیش بوو بۆ کەسێک، کە دەبوایە لە کاتێکدا خزمەتێکی بۆ بکردمایە) لەو ڕووەوە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە و نامەکانم هەڵگرت و دیسانەوە لەماڵ چوومە دەرەوە. لە ترامواکەدا بیرم هاتەوە بەڵێنم بە هاوسەرەکەم داوە شتێکی بۆ بکڕم و بەخۆشحاڵییەوە بیرم لێی کردەوە، کە پاکەتی ئەو کڕینە زۆر بچووک دەبێت. وشە "پاکەت" ئەو وشەیە واتا کتێبەکەی بیر هێنامەوە و تەنها لەو ڕووەوە ئەو پاکەتە نەک هەر جارێک لەگەڵ نامەکانی تردا لەبیرم کردبوو، بەڵکوو جاری دووهەمیش کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە تا نامەکان لەگەڵ خۆم بەرم لەبیرم کردبوو. لە حاڵێکدا پاکەتی

کتێبەکە ڕێک لە لای نامەکاندا دانرابوو.

لە لێکدانەوەکانی کاک "ئوتورانک"دا کە باروودۆخێکی هاوشێوەی بەو وردەکارییانەوە لێک داوەتەوە هەمان خاڵ دیارە.

پیاوێکی زۆر ڕێکوپێک وەک زانایان ورد بوو، وەک ڕووداوێکی زۆر چاوەڕواننەکراو دەیگێڕایەوە کاتێک ڕۆژێکیان لە شەقامدا بوو و دەیویست بزانێت کاتژمێر چەندە، تێگەیشت کاتژمێری سەر مەچەکی لە ماڵەوە بەجێ هێشتووە. تا ئەو کاتەی بە بیری دێت، هەگیز ڕووداوێکی وەها ڕووی نەدا بوو، چونکە ئەو شەو چاوپێکەوتنێکی گرنگی هەبوو و چاوەڕێیان دەکرد، کاتی نەبوو بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە و کاتژمێرەکەی بێنێت. بۆیە لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ژنێکی هاوڕێی لە ماڵی ئەودا کۆ ببوونەوە، کەڵکی وەرگرت و کاتژمێرەکەی بە ئەمانەت لێوەرگرت، چونکە سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی دەبوا دیسانەوە بڕۆیشتایە بۆ لای ئەو ژنە، بەڵێنی دا کاتژمێرەکەی لەو چاوپێکەوتنەدا بداتەوە. سەرلەبەیانی ڕۆژی دوایی کاتێک گەیشتە ماڵی ژنەکە زانی لەبیری کردووە کاتژمێرەکەی بۆ بێنێتەوە، بەڵام کاتژمێرەکەی خۆی لەبیر نەکردبوو. لە نیگەرانی و سەرسوڕمانەوە بەڵێنی بە خۆی دا هەمان ڕۆژ ئەو کاتژمێرە بگەیەنێتە دەستی خاوەنەکەی و بەڵێنەکەی جێبەجێ بکات، بەڵام مەسەلەیەکی تازە بووە هۆی سەرسوڕمان و واقوڕمانی. پیاوەکە پێش ماڵئاوایی لەگەڵ خاوەنماڵەکەدا کاتێک دەیویست بزانێت کاتژمێر چەندە، زانی ئەمجارەیان کاتژمێرەکەی خۆی لە ماڵەوە بەجێ هێشتووە دووپاتکردنەوەی ئەو هەڵە ڕەفتارییانە بە بۆچوونی ئەو (کە زۆر جار وردبین و ڕاڕایی بوو) ئەوەندە نەخۆشئاسا هاتە بەرچاو دەیویست بە هەر شێوەیەک بووە لە هاندەرە دەروونییەکانی ئەو ڕەفتارە تێبگات. ئەو هاندانانە پاش یەکەمین پرسیاری دەروونشیکار،

دەرکەوت. پرسیارەکە وا بوو: ئایا لە یەکەمین ڕۆژی لەبیرچوونەوەدا ڕووبەڕووی ڕووداوێکی ناخۆش بوویتەوە؟ ئەگەر وەلامی پرسیارەکە ئەرێیە، ئەو ڕووداوە لە چ کات و سات و بارودۆخێکدا ڕووی داوە؟ پاشان نەخۆشەکە گێڕایەوە ئەو ڕۆژە پاش نانی نیوەڕۆ کەمێ پێش هاتنە دەرەوە لە ماڵ، دایکی ئەو هەواڵەی پێ دابوو، یەکێک لە خزمەکانیان کە پیاوێکی زۆر نائاسایی و تەحەمولنەکراو بوو، هەروەها لە ڕابردوویشدا هەندێ کێشە و مەسرەفی زۆری خستوتە سەر شانیان، داوای پارەی لێیان کردووە تا کاتژمێرەکەی کە لە شوێنێک بە بارمتە داناوە لە بارمتە دەری بکات و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. ئەو شێوازە بێشەرمانەیە بۆ داواکردنی قەرز کاریگەرییەکی زۆر خراپی لەسەر ورە و دەروونی قارەمانی چیرۆکەکەمان داناوە و هەموو کارە خراپ و ناشرینەکانی ئەو خزمەی بە بیری هێنابووەوە، ئەو کارانەی چەند ساڵ لەوەوپێش ببووە هۆی ئازار و ڕەنجی ئەو. لەو ڕووەوە ڕەفتاری هێماداری ئەو چەندین هۆکاری هەبوو: لە لایەکەوە دەیویست مەبەستی خۆی ئاشکرا بکات، واتا تێبگەیەنێت ئیجازە نادات بەو شێوەیە "دەسی دەسی" پێ بکەن، گوایە دەیوت: ئێستا کە پێویستە کاتژمێرێک لە ماڵەوە هەبێت من کاژمێرەکەی خۆم لە ماڵەوە دادەنێم". بەڵام چونکە بۆ چاوپێکەوتنی سەر لە ئێوارە پێویستی بە کاتژمێر هەبوو ئامانجەکەی تەنها دەیتوانی بە پەیوەندبوون بە ڕێگایەکی نەست وەک ڕەفتارێکی هێمادار دەربکەوێت. لە لایەکی ترەوە لەبیرچوونەکەی بەو واتایە بوو، هەموو ئەو هەڵە خەرجیانە (دەستلەخۆبەردان)، کە تا کۆتایی تەمەنم دەبێ بەهۆی ئەو کەسە بێسوودەوە ئەنجامی بدەم، ڕۆژێک مابێت ماڵم وێران دەکات و ناچار دەبم دەست لە هەموو شتێک بشۆم. هەرچەند بە بۆچوونی ئەو، ئەو چیرۆکەی دایکی گێڕابوویەوە کاریگەرییەی کورتخایەنی هەبووە، بەڵام دووپاتکردنەوەی هەمان ڕەفتاری هێمادار

بەو واتـایەیە نەسـتی دیسـانەوە لەژێـر کـاریگەری ئەو ڕووداوە و ڕاڕایـی فیکرییـەوە سـەرچاوەی گرتـوو. بەو شـێوەیە بیرکـردنەوەی هەستی مرۆڤ تووشی ڕاڕایی فکری دەبێت.

بەو تێبینییەی شێوەی کارکردنی نەست ڕەوتێکی وەهای هەیە، هیچ سـەیر نیـیە کـاتژمێرە قەرزییەکە وەک کـاتژمێری خـودی ئەو پیاوە تووشی هەمان چارەنووس بێت، بەڵام ڕەنگە هەندێ هۆکاری تایبەت بووبێتە هۆی ئەوەی لەبیرچوونەوەکە بگوازرێتەوە بۆ کاتژمێری ئەو ژنە. ڕەنگـە قارەمـانی چیرۆکەکەمـان بە ڕووی نەسـت ئـارەزووی کردبێت ئەو کاتژمێرە ڕابگرێت و بینێتە شوێنی کاتژمێرەکەی خۆی. جیا لەوەیش لەبیرکردنی شتومەکی ئەمانەتی ئەو بارودۆخەی دابین دەکرد، کە جارێکی تر ئەو ژنە ببینێتەوە. هەڵبەت سـەرلەبەیانی ئەو ڕۆژە ناچار بوو بۆ مەسـەلەیەکی تر سـەردانی ئەو ژنە بکات، بەڵام چونکە ئەو سەرلەبەیانییە لەبیری چوو بوو کاتژمێرەکە لەگەڵ خۆی بەرێت وا دیار بوو دەیویست پیشانی بدات ئەو چاوپێکەوتنەی پێشتر کـاتی بـۆ دانـرا بـوو، زۆر بە لایەوە گرنـگ ەو ئامـادە نیـیە لەو چـاوپێکەوتنەدا بـۆ دانەوە کـاتژمێرەکە کەڵـک وەربگرێت. لە لایەکـی تـرەوە کاتێـک پیـاوەکە بڕیـاری دا کـاتژمێری ژنەکە بـداتەوە کاتژمێرەکەی خۆی لەبیر کردبوو، ئەوەیش هێمای ئەوەیە بێ ئەوەی ئاگای لێبێت. پێی خۆش نەبوو لە یەک کاتدا دوو کاتژمێری هەبێت و لە بوونی دوو کاتژمێر لە یەک کاتدا دوورەپەرێزی کردووە. ڕەنگـە بەو شێوەیە ویستبێتی ئاڵتوون و شتومەکی زرقی بریقداری زیادە و ئەو شتانەیش کە دەیتوانی دژایەتییەکی بەرجەستەی لەگەڵ هەژاری و نەداری خزمەکەیدا هەبێت، بۆ خۆی قەدەغە بکات. لە لایکی ترەوە ئارەزووی هەبوو ئەو ئەرکانەی لە بەرامبەر خێزانەکەی، (بە تایبەت دایکی) هەیەتی جەختی لەسەر بکاتەوە تا ئارەزووی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ژنەدا نەیەتە مێشـکیەوە. هەروەهـا دوایـین هۆکـار، کە

دەتوانێ ببێتە هۆی لەبیرچوونەوەی بردنی کاتژمێرە ئەمانەتییەکە ئەوەیە، ئەوی ڕابردوو ئەو لە کۆڕی هەندێ گەنجدا بوو (پێشتر باسمان لەو چاوپێکەوتنە کرد) و شەرمی دەکرد ئاگای لە تێپەڕبوونی کات بێت بە سەیرکردنی کاتژمێرێکی ژنانە، ئەو بە دزییەوە سەیری کاتژمێرەکەی دەکرد، بەڵام ڕەنگە بۆ دووریگرتن لە دووپاتبوونەوەی ئەو دۆخە ناخۆشە بڕیاری دابێت ئیتر ئەو کاتژمێرە نەنێتە گیرفانی. سەرەڕای ئەو لێکدانەوەیە، دەبوا ئەوەی بدایەتەوە، دەرەنجامی ململانێ لە نێوان ئەو دوو ئاڕاستەیەدا بووە هۆی دەرکەوتنی ڕەفتارێکی هێمادار و نەست کە هاوشێوەی جۆرێک پێکەوەبوون و پێداگرییە بۆ زاڵبوون، تەنانەت بە نرخێکی زۆر پیشانی دەدات. ئێستا چەند نموونەیەک لە لێکدانەوەکانی کاک "شتراکێ" بە ئەمانەت وەردەگرین:

١- کارێکی ناویست دەتوانێ بەسێ شێوازی جیاواز دەربکەوێت: بەدەستنەهێنانی شتومەکەکەی، لەناچوون و لەبیرچوونەوە.

"بۆ توێژینەوەیەکی زانستیانە وێنەیەکی زۆری کردبووە، چونکە براکەم دەیویست لە کاتی کۆنفرانسێکدا ئەو وێنانە بڵاو بکاتەوە و پیشانی بدات، بەڵێنم دا وەک ئەمانەت ئەوانەی لێ وەربگرم، لە ڕاستیدا زۆر بە لامەوە باش نەبوو ئەو وێنانەی بە زەحمەت کۆمکردووەتەوە پێش ئەوەی خۆم کەڵکیان لێ وەربگرم، پیشانی بدەم یان بڵاو بکرێتەوە، بەڵام ئەو بیرکردنەوەیە تەنها چرکەیەک بە زەینمدا هات و بەڵێنم بە براکەم دا نیگاتیڤی ئەو وێنانەی پێویستی پێ‌ی بوو بۆی بهێنم تا بتوانێت هەندێ کلێشە بۆ پیشاندان دابین بکات، بەڵام دۆزینەوەیان ئاسان نەبوو.

ناو هەموو پاکەتە نیگاتیڤەکان، کە بۆ کاری ئەو دەبوو، گەڕام و زیاتر لە دووسەد نیگاتیڤم دۆزییەوە، یەکە بە یەکەیانم سەیر کرد، بەڵام

نەمتوانی ئەو نیگاتیڤانەی براکەم پێویستی پێی بوو بدۆزمەوە. بە باشی هەستم کرد لە ناخەوە پێم خۆش نییە ئەو شتانەی لێمی ویستووە ئەنجامی بدەم. لەم ڕووەوە کاتێک ئەو بیرکردنەوە ناخۆش و دوورخەرەوەیەم بە دەستدا هاتەوە، تیشکەیشتم یەکێک لە پاکەتەکان بەبێ ئەوەی بە وردی سەیری بکەم دامناوە و لەناو ئەو پاکەتەدا ئەو نیگاتیڤانەی مەبەستمان بوو دانرابوو. لەزگەیەکی بچووک لەسەر پاکەتەکە بوو کە ناو پاکەتەکەی پیشان دەدا و ڕەنگە من پێش ئەوەی دایبنێم بە خێرایی سەیرێکم کردووە. سەرباری ئەوەیش پێموایە ئەو بیرکردنەوە ناخۆشە هێشتا نەیدۆراندبوو، چونکە دیسانەوە کارەساتی جۆراوجۆر بووە هۆی درەنگکردن لە ناردنی وێنەکاندا. کاتێک دەمویست یەکێک لە تابلۆ شووشەییەکانی پاکەتی عەدەسەکان خاوێن بکەمەوە، تابلۆکە لە دەستم کەوت و شکا، لە حاڵێکدا هەرگیز ئەو شتە بۆم ڕووی نەدابوو. نموونەیەکی ترم لە تابلۆکان دابین کرد، بەڵام ئەوەیش لە دەستم کەوت، چونکە خێرا نەمهێشت تابلۆکە بکەوێت، توانیم ببمە هۆی ئەوەی بشکێت. پاشان لە حاڵێکدا تابلۆکەم بە پاکەتی عەدەسەکانەوە دەلکاند، پاکەت و تابلۆکە بەسەر زەوییەکەدا کەوت، بەڵام نەشکا. بەهەرحاڵ چەند ڕۆژ تێپەڕ بوو تا لە ئاکامدا بڕیارم دا ئەو شتومەکانە بخەمە ناو پاکەت و دایانبخەم و بیاننێرم. لە ڕاستیدا هەموو ڕۆژێک بە خۆمم دەوت: سبەینێ ئەو کارە ئەنجام دەدەم، بەڵام بە بەردەوامی تووشی لەبیرچوونەوە دەبووم.

٢- لەبیرچوونەوەی بەردەوام: کاتێک ئەنجامدانی پراکتیکێک، کە چەندین جار لەبیر کراوە لە قۆناغی کۆتاییدا تووشی هەڵە دەبێت.

دەبوا کارتپۆستاڵێکم بۆ هاوڕێیەکم بناردایە، بەڵام ناردنیم ڕۆژ بە ڕۆژ درەنگ دەخست، پێموایە هۆکاری ئەو کارە وەها بوو: هاوڕێکەم

ئاگاداری کردبوومەوە بەمزوانە کەسێک دێت بۆ لام و من لەو چاوپێکەوتنە خۆشحاڵ نەبووم. کاتێ هەفتەی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسەی پێم ناخۆش بوو تێپەڕی و هیوادار بووم ئیتر نەیەت بۆ لام، بەهەرحاڵ، بڕیارم دا کارتپۆستاڵەکە بۆ ڕەفیقەکەم بنێرم و بنووسم چ کات دەتوانم لەگەڵ خەڵکدا چاوپێکەوتن بکەم. لە کاتی نووسیندا دەمویست زیاتر بنووسم و پێی بڵێم بەهۆی druk werk بە زمانی هۆڵەندی واتا: (کاری زۆر، کاری خێرا)، نەمتوانیوە زووتر کارتەکەی بۆ بنێرم، بەڵام ئەو بابەتەم نەنووسی، چونکە لەبەر خۆمەوە وتم هیچ مرۆڤێکی ژیر ئەو پاساوانە پەسەند ناکات. ئێستا نازانم ئایا ئەو درۆ بێبایەخە دەیویست بە شێوەیەک بەیان بکرێت یان نا، بەڵام بەهەرحاڵ، لە کاتی خستنەناوەوەی کارتەکە بۆ ناو سندووقەکە بە هەڵە ئەوەم خستە ناو بۆکسی Drukwerk بە زمانی هۆڵەندی بە واتای (ڕاگەیاندن) دێت.

٣- لەبیرچوونەوە و هەڵە:

ڕۆژێک سەرلەبەیانی کە هەوا زۆر دڵڕفێن بوو، کچێکی گەنج ڕۆیشتە مۆزەخانەی ڕیکسەوە تا لەنێو جەستەیەکی کە لە گەچ دروست کرابوو وێنەیەک بکێشێت. هەرچەند ئەو پێی خۆش بوو لە هەتاو و هەوای باش کەڵک وەربگرێت و بڕوات بۆ گەشت، بەڵام بڕیاری دا ژیر بێت و بە شێلکاری درێژە بە کارەکانی بدات. یەکەم جار دەبوایە کاغەزی نیگارکێشی بکڕیایە، ڕۆیشت بۆ دوکانێک، کە دە خولەک لە مۆزەخانەکەوە دوور بوو، قەڵەم و کەرەسەکانی تری کڕی، بەڵام کاغەزی نەکڕی. چووە ناو مۆزەخانەکە و کاتێک لەسەر کورسییەکە دانیشت و ئامادەی کار بوو، سەیری کرد کاغەزی پێ نییە و ناچارە دیسانەوە بڕواتە دوکانەکەوە. لە ئاکامدا کاغەزەکەی کڕی و دەستی کرد بە نیگارکێشان و کارەکەی بە شێلکارانە درێژە پێ دا و پاش

ماوەیەک دەنگی کاتژمێری تاوەری مۆزەخانەکە بیست. کاتژمێرەکە چەندین جار لێدرا. کچە گەنجەکە بە خۆی وت: "رەنگە کاتژمێر دوانزە بێت" درێـژەی بە کـارەکەی دا و بیسـتی کە کـاتژمێری تـاوەرەکە، چارەکی کاتژمێری راگەیاند. لەبەر خۆیەوە وتی: "کاتژمێر دوانزە و چـارەکە". هەمـوو کەلوپەلەکـانی کـۆکردەوە و بریـاری دا لە رێگـای پـارکی "وانـدێل"، بـۆ خـواردنەوەی قـاوە (واتە دووهەمـین ژەمـی خواردنی هۆڵەندییەکان" بڕوات بۆ ماڵی خوشکەکەی. کاتێک گەیشتە بەردەمی مۆزەخانەی "سواسۆ"، بە سەرسوورمانەوە بینی کاتژمێرەکە لەسـەر دوانـوەرۆیە لە حاڵێکـدا وا بیـری دەکـردەوە کـاتژمێر ١٢:٣٠ خولەکە. هەوا دڵڕفێنەکە بەهێزتر بوو لە هەوڵدانی ئەو بۆ کارکردن؛ لەم ڕووەوە کاتێـک کـاتژمێر ١١:٣٠ لێـدرا بـوو، لە بیـری کردبـوو کاتژمێرەکـانی تـاوەرەکە نیـو کـاتژمێر پـێش نیـوەڕۆ دوانـزە جـار لێدەدرێت.

بەو شـێوەیەی توێژنەوەکـان پیشـانی دەدات، ئاراسـتەیەکی نەسـت و شڵەژێنەر دەتوانێ بە دووپاتبوونەوەی ئینکاری هەڵەیەکی ڕەفتاری بە ئامانجی خۆی بگات. من نموونەی سەرقاڵکەری لای خوارەوە، کە ئەو جۆرە دووپاتبوونەوانە لەخۆ دەگرێت لە کتێبێک وەردەگرم بە نـاوی "فرانک ویدێکایند" و شانۆ، کە لە چاپەمەنی و بڵاوگەی "درای ماسکین ویـرلاگ" بە چـاپ گەیشـت، بەڵام بەرپرسـیارێتی ڕاسـتەقینەی ئەوە دەخەمە ئەستۆی خودی نووسەر. ئەو چیرۆکە کە بە شێوازێک وەک شێوازی "مارک تواین" ڕاڤە دەکات.

"لە سـەیرترین بەشـی نمایشـنامەی "سانسۆر"ـی بەرهەمـی ویدێکایند، ئەو ڕستەیە دەبینرێت:

"ترس لە مردن هەڵەیەکی زەینییە" (هەڵەی زەینی Denkfehler) ئەو نووسـەرەی کە زۆر گرنگی بەو بەشـە لە چیرۆکەکە دەدات، لە کاتی

راهێناندا تکای لە ئەکتەرەکە کرد پێش وتنەوەی وشەی Denkfehler چرکەیەک بوەستێت. ئەو شەوە کە ئەکتەرەکە بە باشی ڕۆڵی خۆی دەزانی، ئەو بێدەنگییەی ڕاگرت، بەڵام بە پێچەوانەی ئارەزوویەوە بە زارێکی زۆر پڕ لە خەفەتەوە وتی: 'ترس لە مردن... هەڵەیەکی چاپییە (Denkfehler)'. لە کۆتایی نمایشەکەدا نووسەرەکە ئەکتەرەکەی دڵنیا کردەوە، کە هیچ گلەییەکی لێ نییە، بەڵام بەبیری هێنایەوە ترس لە مردن "هەڵەیەکی زەینی"یە نەک "هەڵەیەکی چاپی".

سبەی شەو دیسانەوە نمایشنامەی "سانسۆر" جێبەجێ کرا. کاتێک ئەکتەرەکە گەیشتە هەمان شوێن بە زارێکی پڕ لە خەفەتەوە وتی: ترس لە مردن یەک... کاغەزی یادداشتە "Denkfehler" ویدیکانید ئەمجارەیش گلەیی نەکرد و سوپاسی ئەکتەرەکەی کرد و تەنها پێی وت "ترس لە مردن هەڵەیەکی زەینییە".

لە کاتی سێیەمین جێبەجێکردنی نمایشنامەکەدا ئەکتەرەکە لەو ماوەیەدا قسەوباسی زۆری سەبارەت بە هونەر لەگەڵ نووەرەکەدا هەبوو و لەگەڵیدا زۆر ڕەفیق ببوو، دیسانەوە هەمان ڕستەی بە پڕ خەفەتترینەوە، بەو شێوەیە وتیەوە: "ترس لە مردن یەک... یادداشتی چاپییە (Denkfehler)". ئەمجارەشیان نووسەرەکە بە گڕ و تینەوە پیرۆزبایی لێ کرد. نمایشنامەکە چەندین جار ئەنجام درا، بەڵام لە بارەی "هەڵەی زەین"ـەوە ئیتر ویدیکانید قسەی نەکرد، گوایە مەسەلەکە بۆ هەمیشە چارەسەر بووە.

جەنابی کاک "ڕانک" پەیوەندی زۆر سەیری لە نێوان "هەڵەی ڕەفتاری و خەوندا" هەڵسەنگاندووە ناکرێ ئەو پەیوەندییانە بەبێ شیکردنەوەی قووڵ و لێوردبوونەوەی خەونی سەبارەت بە هەڵەی ڕەفتاری بە شێوەیەکی بەچاو ئاشکرا بکرێت. جارێکیان لەناو خەونێکی زۆردا،

خەوم بینی جزدانی پارەکەم ون کردووە. لە ڕاستیدا سبەینێکەی کاتێک جلم لەبەر دەکرد، بینیم جزدانی پارەکەم نادۆزمەوە، چونکە شەوی ڕابردوو کاتی داکەندنی جلەکانم لە بیرم چوو بووەوە ئەوە لە گیرفانی پانتۆڵەکەم دەربهێنم و لە شوێنی جاران دایبنێم. بەهەرحاڵ، ئەو لەبیرچوونەوەیە بە لامەوە نادیار بوو و ڕەنگە بەهۆی بەیانکردنی ئەندێشەیەکی نەستەوە بووبێت کە بە تەواوی ئامادە بوو لە ناوەرۆکی خەوەکەدا دەربکەوێت.

پڕوپاگەندە ناکەم چەند نموونەیەک لە زنجیرەی هەڵە ڕەفتارییەکان بابەتێکی نوێ و جیا لەو هەڵە ڕەفتارییە ساکارانەی بینیمان فێرمان دەکات، بەڵام کاتێک هەڵەی ڕەفتاری ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت تا بگاتە ئامانجێکی هاوشێوە، تێدەگەین هەڵەی ڕەفتاری بەیانکردنی ویستێکی دانەخراوە کە مەیلەو ئاڕاستەیەکی دیاریکراوە و ئەو کارەیش هۆکارێکی تر و هۆکارێکی زۆر شێلکارتر بۆ دژایەتیکردن بەرامبەر بە بیرۆکەیەکە کە هەڵە ڕەفتارییەکان تەنها سەرچاوەکەی دەگێڕنەوە بۆ ڕووداوێک و لە پێویستی ڕاڤەکردنیان تێناگات. مەسەلەیەکی سەیرتر لەو نموونانەدا ئەوەیە شایەتحاڵی ناتوانی کەسەکەین بۆ لەناوبردنی دەرئەنجامەکانی هەڵە ڕەفتارییەکان، تەنانەت کاتێک ئەو کەسە لە بەرامبەر هەڵەکەیدا بە وریاییەوە بەرنامە داڕێژێت. هاوڕێکەم بە هەموو هەوڵدانەکانیەوە نەیتوانی لە کۆبوونەوەی کۆمیتەدا بەشداری بکات و خوشکی ژنی نیگارکێشەکە سەرباری ئەو ئارەزووەی بەو کارە هەیبوو، نەیدەتوانی مەدالیا ئاڵتوونییەکە بنێرێتەوە. کاتێک نەست لە بەرامبەر ئەنجامدانی بەرنامەکاندا دەبێتە بەربەست و پێمان وایە هەموو ڕێگاکانمان بەسەریدا داخستووە، لە ئاکامدا شتێک زیاتر لە بەرنامەی دژ بەرەو هۆشیاری پێویستە: دەبێ بە "کارکردنی دەروونی"، مەبەستی نەست بخەنە ناو سووڕی وزەکانی هەستەوە.

بەشی دوانزەهەم

## بیروبۆچـــوونە نوێیەکـــان لە بـــارەی خـــورافە و قەزاوقەدەر و ناچارگەراییەوە

بۆ هەڵبژاردن ئازادییەکی تەواوم هەبوو، بێگومان دەبوایە هەندێ لە ناوەکانم هەر لە سەرەتاوە بسڕیایەتەوە: بۆ نموونە نـاوی ڕاستەقینەی نەخـۆش و نـاوی ئەنـدامانی خێزانەکەی خـۆم کە حەساسـیەتم پیان هەبوو، بەهەرحاڵ، هەندێ ناوی نەناسراو و سەیر. هەرچەند پێویست نەبوو زیاتر زەحمەت بە خۆم بدەم تەنها ئەوەندە بەس بوو تا ناوی گونجاو بۆ ژنان بە ڕێژەیەکی زۆر بگاتە مێشکم، بەڵام لە بری ناوی زۆر تەنها یەک ناوم بە بیر هاتەوە و ناوێکی ترم نەدۆزییەوە. ئەو ناوە "دۆرا" بوو. هەوڵم دا ناچارگەراییەکەی بدۆزمەوە. دۆرا ناوی کێ بـــوو؟ یەکەمـــین ئەندێشـــەیەک بە زەینمـــدا هـــات و نەمتـــوانی لە ڕاستییەکان دووری بخەمەوە ئەوە بوو، کە پەرەستیاری منداڵەکانی خوشـکم نـاوی دۆرا بـوو، بەڵام مـن زیاتر لەو مەسـەلانە گـرنگیم بە شیکردنەوەی مەسەلەیەکی وەها داوە تا بتوانم یەکەمین بیرکردنەوە بەبێ ئەملا و ئەولا پەسەند بکەم. پاشان ڕووداوێکم بە بیر هاتەوە کە شـەوی ڕابـردوو ڕووی دابـوو و ئەو ناچـارگەراییەی شـرۆڤە دەکـرد. لەســەر مێــزی ژووری نــانخواردنی نیــوەڕۆی مــاڵی خوشــکەکەم نــامەیەکم بینــی بەو نــاو نیشــانە: "بــۆ خــانمی ڕۆزا و..." بە سەرسوڕمانەوە پرسیم، ڕۆزا ناوی کێیە؟ ئینجا تێگەیشتم ئەو کچەی هەمـوو کەسێک پێی دەڵێت دۆرا لـە ڕاستیدا نـاوی ڕۆزایە، بەڵام لەو کـاتەوە لە مـاڵی خوشـکمدا دامەزاروە، چـونکە هاونـاوی خوشـکەکەم بووە بە ناوی خۆیەوە بانگ کراوە. ئەوسا بە نیگەرانییەوە وتم: "ئەو

خەڵکە داماوە تەنانەت مافی ئەوەشیان نییە ناویان بپارێزن". لە بیرم دێت بۆ چەند چرکە بێدەنگ مامەوە و بیرم لەو مەسەلە گرنگانە دەکردەوە، کە چەند ساڵ لەوەوبەر لە بیرم چووبووەوە، بەڵام تا ئێستا دەمتوانی ئەوانە وەک ویژدانی هەست بەکار بهێنم و بە زمانێکی سادە دەری ببڕم. سەر لە بەیانی ڕۆژی دوایی کاتێک بە دوای ناوێکدا دەگەڕام و دەبوایە لە بری ناوی ڕاستەقینەی نەخۆشەکە دایبنێم تەنها ناوی وەبیرهێنانەوەی واتای دەروونی سەقامگیر بوو. چونکە لە چیرۆکی نەخۆشەکەمدا مەسەلەکە بواری ڕەوتی چارەسەرکردنە بەهۆی کاریگەری وەرگرتنی شێلکارانەی کەسێکی سەرووی خۆی بووە (ژنێکی کابان)، کە لە ماڵی کەسێکی تردا سەرپەرشتی منداڵەکان و ئیدارەی کاروباری ناو ماڵەوەی لە ئەستۆدا بوو.

ئەو ڕووداوە وردە دوای چەند ساڵ درێژەیەکی چاوەڕواننەکراوی هەبوو. ڕۆژێکیان دەبوا لە بارەی "مور دۆرا" -کە دەمێکە لەبیر چوو بووەوە- قسەم بکردایە، بەڵام بە بیرم هاتەوە ناوی یەکێک لەو دوو بیسەرەی گوێیان لە قسەکانم دەگرت هەر ئەو ناوەیە، کە چەندین جار لە شرۆڤەکردنەکانمدا دەبێ بیهێنمە سەر زار. لەو ڕووەوە ڕووم لە ژنە کرد و داوای لێبووردنم کرد و وتم: بیرم لەو خاڵە نەکردبووەوە، ئامادەم هەر ناوێکی تر بنێمە جێی "دۆرا". دەبوایە بە خێرایی ناوێکم هەڵبژاردایە و ئاگادار بوایام لە هەڵبژاردنی ناوی بیسەری دووەم دوورەپەرێزی بکەم، چونکە جیا لەوە لەگەڵ دوو بیسەرەکەمدا تارادەیەک لە دەروونشیکاری شتێکیان دەزانی، سومبولێکی خراپم پێ دەدا. بۆیە کاتێک ناوی "ئێرنا" بە زەینمدا هات و لە بری ناوی "دۆرا" دانرا خۆشحاڵ بووم و بۆ درێژی قسە کردنەکەم لەو ناوە کەڵکم وەرگرت. کاتێک قسەکردن کۆتایی پێ هات لە خۆمم پرسی: ئەو ناوە تازەیە لە کوێوە بە مێشکمدا هات؟ ئنجا

کاتێک تێگەیشتم تارادەیەک تووشی هەمان هەڵە بوومەوە کە لە ئەگەری دەرکەوتنی دەترسام کەوتمە پێکەنین. لە ڕاستیدا ناوی بنەماڵەیی بیسەری دووەمم "لۆسێرنا" بوو و من لەم ڕووەوە لە دوو بەشی کۆتایی ناوەکەی کەڵکم وەرگرت.

٣- نامەیەکم بۆ هاوڕێیەکم نووسی، کە پیاچوونەوەی کتێبی "لێکدانەوەی خەونەکان"م تەواو کردووە و تەنانەت ئەگەر ٢٤٦٧ هەڵەی هەبووبێت، بڕیارم داوە هیچ ئاڵوگۆڕێکی بەسەردا نەهێنم. پاشان خێرا بە دوای هۆکاری هەڵبژاردنی ئەو ژمارەیەدا دەگەڕام و شیکردنەوەکەم بۆ سەر ئەو نامەیە دەنووسی زیادم کرد. ئەو شتەی ئەو ڕۆژە خێرا پاش هەڵبژاردنی ژمارەی ٢٤٦٧ نووسیومە لێرەدا باسی لێ دەکەم:

ئەمەیش ڕاپۆرتێکی گشتی لە بارەی "زیانناسیی دەروونی لە ژیانی ڕۆژانەدا": تۆ لە نامەکەدا ژمارەی ٢٤٦٧ت بینی و مەزەندەیەکی سەیرە لەو ڕێژە هەڵەیەی ڕەنگە لە کتێبی لێکدانەوەی خەونەکان مابێتەوە. هەرچەند لە ژیانی دەروونیدا هیچ مەسەلەیەکی ڕێکەوت و نادیار بوونی نییە. بۆیە مافت هەیە وا بیر بکەیتەوە ویژدانی نەست ئەو ژمارەیەی بۆچی هەڵبژاردووە و ویژدانی هەست ئەوەی ڕاگەیاندووە. هەرچەند لەم دواییانەدا لە ڕۆژنامەدا خوێندمەوە جەنەڕاڵ "ا.م" بە پلەی مارشاڵی خانەنشین بووە. دەبێ بڵێم ئەو پیاوە بە ڕای من کەسێکی سەیرە. کاتێک وەک یاریدەدەری پزیشک خزمەتی سەربازیم تێدەپەڕاند ئەو لیوا بوو. ڕۆژێکیان هات بۆ بنکەی تەندروستی و بە پزیشکی وت: "دەبێ تۆ لە ماوەی ٨ ڕۆژدا من چارەسەر بکەیت، چونکە دەبێ کارێک ئەنجام بدەم کە ئەمپراتۆر بە منی سپاردووە". کاتێک لە زەینمدا قۆناغ و پلەکانی سوپایی لە بەر چاو دەگرم دەبینم، ئەمڕۆکە (واتە لە ساڵی ١٨٩٩) زاینیدا چالاکی

پیشەکەی کۆتایی پێهاتووە و لیوای ئەو سەردەمانە ئێستاکە مارشاڵی خانەنشینە. لە بیرم دێت لە ساڵی ١٨٨٢ی زاینیدا ئەو هات بۆ بنکەی تەندروستیمان، ١٧ ساڵی خایاند تا گەیشتە بەرزترین پلە و بووە مارشاڵ. لە بارەی ئەو مەسەلەیەوە لەگەڵ هاوسەرەکەمدا قسەم دەکرد، وتی: "کەواتە دەبێ تۆیش ئێستا لە دەورانی خانەنشینیدا بیت؟" بە نارەزایەتییەوە وەڵامم دایەوە: "خوا نەکات." پاش ئەو بیرکردنەوەیە بە ئازادییەوە درێژەیان بە ڕێگای خۆیان دەدا. ڕاستییەکەیت بوێت بە هەڵە لێکم دابووەوە و ئەو مەسەلەیەیش بەهۆی هێمایەک، کە لە بیرەوەرییەکانمدا پاراستوومە، دادەنێم. من لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا لە کاتی خزمەتی سەربازیدا گەیشتمە تەمەنی یاسایی (واتە ٢٤ ساڵان) و بەهۆی گەیشتنی بەو تەمەنە جەژنێکم ڕێک خست (بەبێ ئەوەی مۆڵەت وەربگرم نەچوومە سەر خزمەت و غیاب بووم)، کەواتە لە ساڵی ١٨٨٠ی زاینی واتە ١٩ ساڵ لەوەوبەر گەیشتمە تەمەنی یاسایی. لەو ڕووەوە لە ژمارەی ٢٤٦٧دا تۆ ژمارەی ٢٤ی دەبینی. تەمەنم لەگەڵ ژمارەی ٢٤ کۆ بکەرەوە ٦٧= ٢٤+٤٣. لە ڕاستیدا من بەم شێوەیە وەڵامی پرسیاری هاوسەرەکەمم دایەوە کە پرسیاری کرد پێم خۆشە خانەنشین بم یان نا، کە ژمارەی (٢٤)م خستوتە سەر ژمارەی تەمەنم. ئەوسا ٢٤ ساڵی تر (تا دەورانی خانەنشینی) دەرفەتم بە خۆم داوە. دیارە لە قووڵایی ناخمەوە نیگەرانم لەوەی بۆچی نەمتوانیوە وەک لیوا "ا.م" لە ماوەی ١٧ ساڵدا بوو بە مارشاڵ و خانەنشین بوو. لە بواری پیشەکەمدا سەرکەوتوو بم، بەڵام بەو بیرکردنەوەیە نیگەرانییەکەمم کەم کردەوە کە هێشتا من کاتم لە بەردەستدایە، پاشان هەستم بە خۆشحاڵی کرد، چونکە دەورانی خزمەتی لیوا بە تەواوی کۆتایی پێ هاتبوو، بەڵام هێشتا من داهاتوویەکم لە بەردەستدا بوو. مافی خۆمە بڵێم ژمارە ٢٤٦٧ کە بەبێ هیچ مەبەست و ئامانجێک نووسیبووم، بە هەندێ هۆکار

دەستنیشان کرابوو کە لە ویژدانی ئەستمدا هەبوو.

پاش یەکەمین نموونەهێنانەوە، کە بە مەبەستی هەڵبژاردنی ئەو ژمارەیەی بە رواڵەت خۆویستانەی ئاشکرای دەکرد، چەندین جار بەهۆی ئەزموونی جۆراوجۆرەوە ژمارەی جۆراوجۆرم دەست کەوت و توانیم هۆکاری هەڵبژاردنەکەم بدۆزمەوە، بەڵام چونکە زۆر کات مەسەلە تایبەتەکان لە ئارادایە ناتوانم ئەوانە وەک نموونەیەک بڵاو بکەمەوە.

لەم رووەوە لێرەدا شیکردنەوەیەکی زۆر سەیر بە گشتی لە دکتۆر 'ئالفرید ئادلەر' دەگێڕمەوە، لەو نموونەیەدا کەسێکی زۆر تەندروست ژمارەیەکی 'بە رێکەوت' هەڵبژاردووە، دکتۆر ئادلەر وەها دەڵێت: 'کاک ئا' بۆی نووسیووم: 'رووداوێکی سەیر رووی ئەداوە بە دڵنیاییەوە کۆتاییم بە کتێبەکە دەهێنا. لەو کتێبەدا نووسرابوو ئەو ژمارانەی دەگەنە ویژدانی هەستمان و بە رواڵەت بە دڵی خۆمان هەڵدەبژێردرێن دەستەواژەی دیاریکراویان هەیە. لەو رووەوە منیش ویستم ئەزموونێک ئەنجام بدەم، ئەو ژمارەیەی کەیشتە مێشکم ژمارەی ١٧٣٤ بوو و خێرا ئەندیشەکانی دوایی پێک هات: ١٠٢= ١٧ ١٧٣٤و ٦= ١٧ ١٠٢ ئینجا ژمارەی (١٧٣٤)م کرد بە دوو بەشی ١٧ و ٣٤ەوە، دوو ژمارەی کۆتایی واتە ٣٤، تەمەنی من پیشان دەدات و بەو شێوەیەی پێشتر پێم وتی، بە بڕوای من، ٣٤ ساڵی تەمەنی گەنجێتیمە و لەو رووەوە من رۆژی لەدایکبوونم لە تەمەنی ٣٤ ساڵیدا زۆر خۆشحاڵ نەبووم، لە کۆتایی ١٧ ساڵیدا لە بواری گەشەکردندا دەورانێکی زۆر شکۆدار و سەیرم بە لاوە دروست بوو، کەواتە من ژیانم کردووەتە دوو بەشەوە، کە هەر کامەیان ١٧ ساڵ لەخۆ دەگرێت. ئەو دابەشبوونانە چ واتایەکی هەیە؟ لە بارەی ژمارەی ١٠٢ەوە بە بیرم دێت ئەو ژمارەیە، ژمارەی یەکێک لە گۆڤارەکانی

"گۆڤاری کتێبخانەی زانکۆ"یە کە نمایشنامەیەک لە "کوتزیبو" بە ناوی هەڵاتوو لە خەڵک و پەشیمان تیایدا بە چاپ گەیشتووە. دەکری دۆخی دەروونی ئێستام بە دوو وشەی "هەڵهاتوو لە خەڵک و پەشیمانی" وەسف بکرێت. ژمارە (٦)ی هەمان گۆڤار (من ناوەڕۆکی زۆربەی ژمارەکانی ئەو گۆڤارەم لەبەرە) سەبارەت بە "هەلە" بەرهەمی "موولێر". من بە بەردەوامی لەو بیرکردنەوەیە ڕەنج ئەکێشم، کە نەمتوانی بەهۆی هەڵمانەوە ئەو بارەدۆخەی شیاوم بوو بە دەستی بهێنم. پاشان بە بیرم هاتەوە ژمارەی (٣٤)ی گۆڤارەکە بریتییە لە بەرهەمێکی موولێر بە ناوی حەوت گولله.(Kaliber) ئەو ناوەم کرد بە دوو کەرتەوە و ئەو بەشانەی لێ دروست بوو Ka و .Liber ئنجا تێگەیشتم ئەو وشەیە هەموو پیتەکانی وشەی Ali عەلی و Kali پوتاسیۆمی تێدایە و ئەو کارەیش بووە هۆی وەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەک: ڕۆژێکیان لەگەڵ کوڕەکەمدا عەلی کە تەمەنی شەش ساڵان بوو بۆ سەرقاڵیمان خەریکی دروستکردنی قافیە بۆ شیعر بووین. بە عەلیم وت قافیەیەک بۆ ناوەکەت بدۆزەرەوە، چونکە نەیتوانی و داوای لێ کردم لە بری ئەوە قافییەیەکی بۆ دروست بکەم، وتی:

(عەلی دەمی بە پڕ مەنگەناتی ئاو دەکوژێت)

Ali reinigt sich den Mund mit hypermangansaurem.

زۆر پێکەنیم، عەلی کوڕێکی خۆشەویست بوو، بەڵام لەم دواییانەدا بەهۆی سۆزدار نەبوونی هەندێ گلەییم هەیە چونکە عەلی Ka) (Kein) Lieber Ali sei Kein "بەسۆز نییە"، Ka کورتکراوەی وشەی(Kein )ە.

پاشان لە خۆمم پرسیاری: "لە ژمارەی ١٧ی گۆڤاری کتێبخانەدا چ بەرهەمێک چاپ بووە؟" دڵنیا بووم ئەو مەسەلەیە دەزانم لەو ڕووەوە

وا بیرم کردەوە ویستوومە ئەوە لەبیر بکەم. هەموو هەولدانەکانم بۆ وەبیرهێنانەوەی ئەو بیرەوەرییە راوەستا. ویستم پاشماوەی کتێبەکە بخوێنمەوە، بەلام ئەو شتانەی دەمخوێندەوە شتێک نێنەگەیشتم، چونکە مەسەلەکە لە بارەی ژمارە (١٧)ی گۆڤارەکە بە بەردەوامی ئازاری دەدام. گلۆپەکەم کوژاندەوە و کەوتمە بیرکردنەوە. بەهەرحال، بیرم هاتەوە لە ژمارە (١٧)دا نمایشنامەیەک لە شکسپیر بە چاپ گەیشتووە، بەلام کام نمایشنامە؟ رەنگە "هرۆ" و "لی ئەندری". وا دیار بوو ئیرادەم بە بێهوودە هەولی دەدا سەرنجم لەسەر ئەو مەسەلەیە لابدات. هەستام و کەتەلۆگی بلاوگەکەم خوێندەوە. لە ژمارەی (١٧)ی نمایشنامەی "مەکبێس"ی بەرهەمی شکسپیردا بوو. بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە ناچار بووم قبول بکەم هەرچەند ئەو نمایشنامەیە بەقەد بەرهەمەکانی تری شسکپیر بە لامەوە بەبایەخە، بەلام لە بارەیەوە ئەوەندە زانیاریم نەبوو. بە بیرم دێت جنایەتکارێک وتەبێژی مەکبێس و سیحربازەکان و کەسایەتی چیرۆکەکان، ڕستەی "جوانی ناشیرینە" لە ناوەڕۆکی بابەتەکەدا هەبوو و پێشتر هەلسەنگاندنی شیلێر بۆ ئەو نمایشنامە بە لامەوە زۆر سەیر بوو. هیچ گومانی تێدا نەبوو: دەمویست ئەو بەرهەمە لەبیر بکەم.

جیا لەوەیش وا بیر دەکەمەوە ژمارەی ١٧ و ٣٤ ئەگەر دابەشی ژمارە (١٧)ی بکەم دوو ژمارەی ١ و ٢ بەدەست دێت. ئنجا ژمارەی ١ و ٢ی بلاوگەی کتێبخانە نمایشنامە "فاوست"، بەرهەمی "گۆتە" لەخۆ دەگرێت.

بەلام بەداخەوە نهێنی نووسەر ئیجازەمان پێ نادات لە واتای هەموو ئەو بیرکردنەوانە و بیروەریانە تێبگەین. کاک ئادلەر پێی وتووین کە نووسەری نامەکە نەیتوانیوە هەموو وردەکارییەکان پێکەوە گرێ بدات و بگاتە ئەنجامێکی گشتی. ئەگەر لە درێژەی نامەکەدا بابەتێک

نەبوو کە بتوانێت کلیلی مەتەڵەکانمان لە بەردەستدا دابنێت و واتای ژمارەی ١٧٣٤ و درێژەی ئەو ئەندێشانەی پەیوەندن بەوە روون بکاتەوە، ئێمەیش حەزمان دەکرد گرنگی بەو وردەکارییانە نەدەین. پاشان نووسەری نامە درێژەی پێ دابوو: 'ئەمڕۆ بەیانی شتێک رووی دا کە هەڵسەنگاندنی فرۆید لەو شێوە مەسەلانە پاساو دەدات. دوێنێ شەو کاتێک بۆ هەڵگرتنی بڵاوگەکە قەرەوێڵەکەم بەجێ هێشت، هاوسەرەکەم لەخەو هەستا و ئەمڕۆ لێی پرسیم لەناو بڵاوگەی کتێبخانەدا بەدوای چیدا دەگەڕام. چیرۆکەکەم بۆ گێڕایەوە. بۆچوونی وا بوو هەموو ئەو قسانە جیا لە بواری مەکبێس (ئەو خاڵە زۆر سەرنجڕاکێشە) ئەوەندە ئازاری دەدام، بێهوودەیە و بە دڵنیاییەوە کاتێک ژمارەیەک هەڵدەبژێردرێت بیر لە هیچ مەسەلەیەک ناکاتەوە. وەڵامم دایەوە: "وەرە تاقی بکەرەوە". ئەو ژمارەی ١١٧ی هێنایە سەر زار و من خێرا وەڵام دایەوە: "١٧ دەگەڕێتەوە بۆ هەمان بابەتێک کە بۆتم شرۆڤە کرد، هەرچەند دوێنێ پێم وتی، کاتێک ژنێک دەگاتە تەمەنی ٨٢ ساڵی، بەڵام مێردەکەی تەنها ٣٥ ساڵ تەمەنیەتی، ئەو دوو هاوسەرە لە هەلومەرجێکی ناهاوسەنگدان". چەند ڕۆژ لەوەوبەر بە گاڵتەوە بە هاوسەرەکەمم وت تۆ پیرەژنێکی ٨٢ ساڵەیت، ٨٢+ ٣٥= ١١٧. نووسەری نامەکە، کە نەیتوانیبوو هۆکاری دیاریکردنی ئەو ژمارەیەی کە خۆی وتبووی بدۆزێتەوە، خێرا مەبەستەکانی ئەو ژمارەیەی هاوسەرەکەی هەڵیبژاردبوو دۆزییەوە، واتە ئەو ژمارەیەی وا دیار بوو بە رێکەوت هەڵیبژاردبوو. لە راستیدا ئەو ژنە بە باشی تێگەیشتبوو ژمارەی هەڵبژێردراو لە لایەن مێردەکەیەوە چ گرێیەکی تێدابوو، ئەوەیش بەشبەحاڵی خۆی ژمارەیەکی هەڵبژاردبوو کە لە هەمان گرێوە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی تەمەنی نێوان ژن و مێردایەتی، بە دڵنیاییەوە لە ناخی هەردووکیاندا شاردرابووەوە و لەو ڕووەوە بە بۆچوونی ئێمە بە ئاسانی دەکرێ واتای ئەو

ژمارەیە بە زەینی مێردەکە گەیشتووە، بدۆزیتەوە. وەک ژۆن کاک ئادلەر دەڵێت: ئەو ژمارەیە هێمای ئارەزووی سەرکوتکراوی "من"ە و دەتوانی بەو ڕستەیە بوترێت: "بۆ پیاوێکی ٣٤ ساڵان وەک من ژنێکی ١٧ ساڵان گونجاوە".

لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە "یارییانە" بەبایەخ دانەنێین دەبێ خاڵێک لە بەرچاو بگرین: ماوەیەک لەوەوپێش دکتۆر ئادلەر پێی وتم ساڵێک دوای بڵاوبوونەوە و شیکردنەوەی ئەو ژن و مێردە لە یەک جیا بوونەوە".

دکتۆر ئادلەر ڕاڤەی ڕاڕابوونی ژمارەکان بە هەمان شێوە شرۆڤە دەکات. هەڵبژاردنی ئەو ژمارانەی کە "بە لامانەوە جوانن" پەیوەندی تایبەتی لەگەڵ ژیانماندا هەیە و لە بواری دەروونناسییەوە بێبایەخ نییە. پیاوێک کە ژمارە ١٧ بە تایبەتی ١٩ی بە باش دەزانی پاش چەند چرکە بیرکردنەوە بە بیری هاتەوە لە ١٧ ساڵیدا بووەتە خوێندکاری زانکۆ و ئازادی زانستی بەدەست هێنا، پاشان لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا بوو کە بۆ یەکەمین جار گەشتێکی دووری کرد و پاش ماوەیەکی تر یەکەمین داهێنانی زانستی خۆی خستە ڕوو، بەڵام بۆ سەلماندنی ئارەزووی بۆ ئەو دوو ژمارەیە دوای دە ساڵ ئەنجام درا، واتە کاتێک ئەو دوو ژمارەیە لە ژیانی خۆشەویستیدا گرنگی پەیدا کرد. شیکردنەوە واتایەکی چاوەڕواننەکراوی بۆ ئەو ژمارانەی زۆر جار لە هەندێ هەلومەرجدا بە شێوەیەک کە بە تەواوی بە ڕێکەوت دێنە بەرچاو و هەڵیاندەبژێرن دۆزیوەتەوە. یەکێک لە نەخۆشەکانم ڕۆژێکیان تێگەیشت کاتێک نیگەرانە پێی خۆشە بڵێت "من پێشتر ١٧ جار یان ٣٦ جار ئەو قسەیەم پێ وتی." بۆیە پرسیار لە خۆتان بکەن ئایا مەبەستێک بۆ ئەو هەڵبژاردنە هەیە یان نا. خێرا بە بیری خۆتانی بهێننەوە لە ڕۆژی بیستوحەوتەمی یەکێک لە مانگەکانی ساڵ لەدایک

بووه لە حاڵێکدا برا بچووکەکەی ڕۆژی ٢٦ی مانگێکی تر لەدایک بووه. ئەو نەخۆشە مافی خۆی بوو چارەنووسی بە تاوانبار دابنێت کە بۆچی لەگەڵ براکەیدا زیاتر گونجاوە تا وەک خۆی. ئەو نایەکسانیی چارەنووسی بەو شێوەیە ڕاڤە دەکرد کە دە ڕۆژ لە ڕۆژی لەدایک بوونی کەم دەبووەوە و دەیخستە سەر ڕۆژی لەدایک بوونی براکەی: واتای ئەو کارە وەها بوو: 'هەرچەند من منداڵی گەورەتر بووم، بەڵام چارەنووس منی سووکوسەلیم کرد'.

من پێم خۆشە جەخت لەسەر گرنگی شیکردنەوەی 'ژمارەکان' بکەمەوە، چونکە بە بۆچوونی من هیچ توێژینەوەیەک ناتوانێت تا ئەو ڕادەیە و بەو ڕاشکاوییە بوونی دەرئەنجامی زەینیی زۆر دژوار کە بە تەواوی لە ویژدانی هەستمان بەدەرن ئاشکار بکات. ئینجا لە لایکی ترەوە ئەو جۆرە بوارانە باشترین نموونەی شیکردنەوەن، کە تیایاندا ڕۆڵی پزیشک (وتار و کارتێکردن)، کە زۆر ڕەخنەی لەسەر گیراوە، بە شێلکارییەکی تەواو شیاوی سڕینەوە و بەلاوەنانە. بۆیە باس لە شیکردنەوەی ژمارەیەک دەکەم کە پەیوەندە بە یەکێک لە نەخۆشەکانمەوە، تەنها ئەوە دەڵێم ئەوە بچووکترین منداڵی خێزانێکی قەرەباڵغ بوو، باوکیشی زووتر لەدەست دابوو لە حاڵێکدا ئەوی پەرەستش دەکرد. نەخۆشەکە کەیفی بەو جۆرە ئەزموونانە دەهات و ڕۆژێکیان ژمارە (٤٢٦٧١٨)ی وت و لە خۆی پرسی: 'چ شتێک لە بارەی ئەو بابەتەوە بە مێشکمدا دێت؟' سەرەتا بیری لە گاڵتە کردەوە: 'کاتێک هەڵامەتی مێشکی بە یارمەتی پزیشک چارەسەر دەکەین، نەخۆشەکە ٤٢ ڕۆژ دەخایەنێت، کاتێک نەخۆشەکە بە ئازادی بمێنێتەوە پاش ٦ هەفتە چاک دەبێتەوە.' ئەو گاڵتەیە لەگەڵ یەکەمین ژمارەکانیدا ڕێک دەکەوت ٤٢. ٧ =٦ پاش ئەو وەڵامە بۆ چرکەیەک بێدەنگ مایەوە. من سەرنجیم بۆ ئەو خاڵە ڕاکێشا، کە ژمارەکەی بریتییە لە هەموو ژمارەکانی سەرەتا (١ تا ٨) جگە لە (٣ و ٥). پاش

ئەو تێبینییە سەرلەنوێ شرۆڤەی کرد و وتی: "ئێمە ٧ برا و خوشکین و من بچووکترین منداڵی ماڵەوەم. ژمارە ٣ خوشکم "ئا" و ژمارە ٥ براکەم "ل"یە. ئەو دوانە دوژمنم بوون. هەر لە منداڵییەوە هەموو شەوێک دوعام دەکرد خوا من لە دەستی ئەو دوو بێبەزەیی و ئەشکەنجەدەرە ڕزگار بکات. بە ڕواڵەت خۆم دوعاکەی خۆمم گیرا کردووە، چونکە لەو ژمارەیەدا کە وتم ٣ و ٥ واتە ژمارەی برا خراپەکەم و خوشکە قیزەونەکەم سڕیونەتەوە. پرسیم: "ئێستا کە ئەو ژمارانە ژمارەی خوشک و براکەت پیشان دەدات، کەواتە ژمارە ١٨ کە دوو ژمارەی کۆتایی پێک دێنن، چییە؟ ئێوە تەنها ٧ خوشک و برا بوون." وتی: "من زۆر جار بە خۆم دەڵێم ئەگەر باوکم تەمەنی درێژتر بوایە من نەدەبوومە بچووکترین منداڵی ماڵەوە. ئەگەر منداڵێکی تری هەبوایە دەبووینە ٨ کەس و برا یان خوشکێک لەگەڵمدا دەبوو، کە دەمتوانی لەپاڵیدا ڕۆڵی برای گەورەتر بگێڕم."

لەم ڕووەوە واتای ژمارەکە دەرکەوت، بەڵام پێویست بوو پەیوەندییەک بدۆزمەوە کە یەکەمین بەشی لێکدانەوەکە پەیوەند بدات بە بەشەکانی ترەوە. بەهەرحاڵ، ئەو پەیوەندییە لەو کاتەوە سەرچاوەی دەگرت، کە لە بارەی ئەو دوو ژمارەیەوە ڕاگەینرا بوو: "ئەگەر باوکم تەمەنی درێژتر بوایە" ٦X٧=٤٢ یەکەم لێکدانەوەی نەخۆشەکە هێمای سووککردنی پزیشکەکان بوو، چونکە ئەوانە نەیانتوانیبوو گیانی باوکی ڕزگار بکەن و لە هەمان کاتدا بە گشتی بە ئەنجامگەیاندنی ئارەزووە منداڵانەکەی نەخۆش لە بارەی خێزانەکەیەوە ڕێک دەخرا:

ئارەزووی مردن بۆ خوشک و برای خراپ و خەفەتخواردن بۆ ئەوەی برا و خوشکی بچووکتری نییە. دەکرێ ئەو دوو ئارەزووە بە کورتی بەو شێوەیە دەربخرێت: "خۆزگە لە بری باوکی خۆشەویستم

ئەو دوانە بمردبان."

ئەوەیش نموونەیەکە کە یەکێک لەو هاوڕێیانە بە نامە پەیوەندیمان هەبوو، ناردبووی: بەرپرسی تەلەگرافی شاری "ل" بۆی نووسیوم کوڕە ١٨.٥ ساڵەکەی دەیەوێت ببێتە پزیشک و هەر لە ئێستاوە ڕووی کردووەتە زیانناسی دەروونی لە ژیانی ڕۆژانەدا و هەوڵ دەدا باوکی و دایکی ڕازی بکات. بیروبۆچوون و تیۆرییەکانی ڕاستە، لێرەدا یەکێک لە ئەزموونەکانی ئەو گەنجە دەنووسم و لە بارەی ئەو مەسەلەیەوە فەرمان نادەم.

"کوڕەکەم لە بارەی ئەو شتەی ئێمە بە "ڕێکەوتی" دەزانین قسەی لەگەڵ دایکی کرد و وتی: هیچ کام لەو گۆرانیانە و هیچ کام لەو زەینانە دەگەنە مێشکمان لە ڕاستیدا "بە ڕێکەوت" نین. باسەکە بەو چێژە درێژەی پێ درا.

کوڕ: ژمارەیەک بڵێ.

دایک: ٧٩

کوڕ: لە بارەی ئەو ژمارەیەوە چ بیرکردنەوەیەکت دێتە مێشک؟

دایک: ئەو بیرەی کە دوێنێ کڵاوێکی جوانم بینی.

کوڕ: نرخی کڵاوەکە چەند بوو؟

دایک: ١٥٨ مارک.

کوڕ: کەواتە وەڵامەکەمان بەدەست هێنا: ٧٩X٢= ١٥٨

نرخی کڵاوەکە لە بەرچاوت زۆر بوو و بە دڵنیاییەوە بە خۆتت وت: ئەگەر ئەو کڵاوە نرخەکەی نیوە بوایە، دەمکڕی.

من سەرەتا نارەزایەتیم بەرامبەر بە ئەنجامورگرتنی کوڕەکەم کرد و

وتم:

"خانمەکان زۆر جار لە حسێبکردندا زۆر بەهێز نین و بە دڵنیاییەوە دایکت حسێبی ئەوەی نەکردووە کە ٧٩ نیوەی ١٥٨یە. ئەو بیرۆکەیەی فرۆید، کە دەڵێت ویژدانی نەست باشتر لە ویژدانی هەست حسێبەکان ڕێک دەخات و ئەوەیش ڕاست نییە." کوڕەکەم وەڵامی دایەوە: "بە هیچ شێوەیەک وا نییە تەنانەت ئەگەر وا بیر بکەینەوە دایکم حسێبی نەکردبێت ٧٩X٢= ١٥٨ ڕەنگە ئەو هاوکێشەیەی لە شوێنێکدا بینیبێت، یان ڕەنگە لە خەیاڵێکیدا لە بارەی ئەو کڵاوەوە حسێبی کردبێت، ئەگەر نرخی کلاوەکە نیوە بوایە چەند دەبوو".

شیکردنەوەیەکی تر سەبارەت بە ژمارەکان لە کاک "جۆنس"ـەوە بە تێهەڵکێش وەردەگرم. یەکێک لە ناسراوەکانی ژمارەی ٩٨٣ـی ڕایگەیاند و داوای لێ کرد تا ئەو ژمارەیە پەیوەست بکات بە یەکێک لە ئەندێشەکانیەوە. جۆنس دەنووسێت: "یەکەمین وەبیرهێنانەوەی واتاکانی ئەو کەسە بیرەوەرییەک بوو لە بارەی گاڵتەیەکەوە، کە ماوەیەکی زۆرە لە بیری کردبوو. شەش ساڵ لەوەوپێش لە ڕۆژنامەیەکدا ڕایانگەیاندبوو ئەو ڕۆژە گەرمترین ڕۆژی هاوینە و گەرمایش دەگاتە ٩٨٦ پلەی فارینهایت، ئەو قسە زیادەیە گاڵتەجاڕی بوو، لە ڕاستیدا پلەی گەرما لەو ڕۆژەدا دەگەیشتە ٩٨.٦ پلەی فارینهایت. لە کاتی ئەو وتووێژەدا لە بەرامبەر ئاگری خۆشی سۆپادا دانیشتبووین. کەسی بەرامبەرم کەمێ لە سۆپاکەوە دووری گرت و وتی ڕەنگە گەرمای زۆری سۆپاکە بوویێتە هۆی وەبیرهێنانەوەی ئەو بیرەوەرییە.

ڕەنگە هەقی بوویێت، بەڵام ئەو شرۆڤەیە بە لامەوە بەس نەبوو و دەمویست بزانم بۆچی ئەو بیرەوەرییە لە ڕابردوویەکی دوور لە زەینیدا ماوەتەوە. شرۆڤەی بۆ کردم ئەو گاڵتەیە زۆری دەخاتە

پێکەنین و هەر کات بیری لێ دەکاتەوە خۆنەویست پێکەنین دەیگرێت، بەڵام چونکە گاڵتەکە بە لامەوە زۆر خۆش نەبوو دەمویست بزانم بۆچی ئەو بیرەوەرییە لە ڕابردوویەکی دوور لە زەینیدا ماوەتەوە. شرۆڤەی بۆ کردم ئەو گاڵتەیە زۆر دەیخاتە پێکەنین و هەر کات بیری لێ دەکاتەوە خۆنەویست پێکەنین دەیگرێت، بەڵام چونکە گاڵتەکە ب ەلامەوە زۆر خۆش نەبوو دەمویست بزانم چ واتایەک لە پشت ئەوەوە شاراوەتەوە کە ویژدانی نەستی بەرامبەرەکەم لێی بێئاگایە. بیرکردنەوەی دوایی ئەوە بوو، وێنای گەرما لە زەینیدا وێنای بێئەژماری تری وەبیر دەهێنایەوە و زۆریش گرنگتر بوون. وتی: "گەرما گرنگترین دیاردەی سەر زەوی و سەرچاوەی ژیانە و... هتد، بیستنی ڕستەی پڕ هەستێکی وەها لە زمانی گەنجێکەوە بە ڕای من زۆر مادەگەرا و پێداگربوو، خێرا سەرم لێی سووڕما. بۆیە داوام لێی کرد وەبیرهێنانەوەکان درێژە پێ بدات. ئەو بیری لە دووکەڵکێشی کارگەیەک دەکردەوە کە لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە دەبینرا. زۆربەی شەوان سەیری دووکەڵ و ئەو بریسکە ئاگرەی دەکرد، کە لە دووکەڵکێشەوە دەهاتە دەرەوە و لەو بارەیەوە بیری لە بەفیڕۆچوونی وەزە دەکردەوە کە جێی داخ و خەفەت بوو. گەرما و بریسکەی ئاگر و بەفیڕۆدانی وزە لەناو بۆرییەکی بۆش و بڵندادا. بە ئاسانی لەو بیرکردنەوانە ئەنجامم وەرگرت کە وەبیرهێنانەوەی گەرما و بریسکەی ئاگر بۆ ئەو گەنجە گرێ دراوە بە وەبیرهێنانەوەی عەشقەوە، چەنکە لە بیروڕای سومبولێکدا عەشق هەر بەو شێوەیە خۆی دەنوێنێت. لەو ڕووەوە گرێی دەستپەڕێکی زۆر هاندەری دەربڕینی ئەو ژمارەیە بوو. ئەوسا پیاوە گەنجەکە چارەیەکی نەبوو جگە لە جەختکردنەوە لەسەر ئەنجامەکانم.

ئەو کەسانەی پێیان خۆشە هەندێ شێوە بناسن، کە ویژدانی نەست بۆ دابینکردنی جۆری ژمارەکان بەکاریان دەهێنێت لە بابەتەکەی کە.گ.

یۆنگ و هەروەها لە بابەتەکەی ب ئی. جۆنسدا زۆر کەلک وەردەگرن.

من لە شیکردنەوەکانمدا رووبەڕووی دوو مەسەلەی سەیر بوومەوە. یەکەم، ئیمە بە دڵنیاییەوە کەسێک لەناو خەودا دەڕوا بە ڕێدا بەرەو ئامانجێکی نادیار دەڕۆینە پێشەوە و لە هەندێ حسێبدا نوقم دەبین و لەناکاو بە دۆزینەوەی ژمارەیەک کۆتایی پێ دێت، کە بە دوایدا گەڕاوین، هەموو کارەکانی تری پاش ئەوە بە خێراییەکی زۆر ئەنجام دەدرێت. دووەم، سەیرە کە ژمارەکان بە ئاسانی لە بیروڕای ئەستماندا تەشەنە بکەن لە حاڵێکدا بۆ نموونە بە گشتی من لە حسێبکردندا لاوازم و بۆ لەبەرکردنی مێژووی رووداوەکان و ژمارەی خانووەکان و... هەموو کات رووبەڕووی کێشەی گەورە دەبمەوە. جیا لەوەیش بە ڕای من ئەو جۆرە کۆ و کەمکردنەوەیەی ژمارەکان بە شێوەی نەست ئاراستەیەک بەرامبەر بە خورافە دەبینێت و سەرچاوەکەیشی بۆ ماوەیەک نادیار بوو. هیچ سەیر نییە توێژینەوەی شیکاری پیشان دەدات هەم ژمارەکان بە تەواوی دیاریکراون و هەم ئەو وشانەی دەیڵێنەوە پێشتر دیاری کراون.

یۆنگ نموونەیەکی سەیری لە سەرەتای وشەیەکی ئازاربەخش وتووە.

خاتوونێک دەیوت چەند ڕۆژ لەوەوبەر وشەی تاگانرۆگ 'Taganrog' زەینی سەرقاڵ دەکرد و ئەو وشەیە لە کوێوە دەگاتە زەینی. من لە بارەی ڕووداوی سۆزداری و ئارەزووەکانییەوە لەم دواییانەدا پرسیارم کرد. پاش نەختێ دوودڵی دانی پێدا نا، کە حەزێکی زۆری بۆ 'ڕبدۆشامبێر' هەبووە (Morgenrock) وشە بە وشە بە واتای جلی تایبەتی بەیانیانە، بەڵام مێردەکەی هیچ گرنگییەکی بەو ئارەزوو و حەزە نەداوە:

Tag- an- rock- Morgenrock بەم شێوەیە دەکرێ وەربگێردرێتەوە: 'جلی ڕۆژ' کە وشەی ئاڵۆگۆڕبەسەرهاتووی

Taganrog یەکێکە لە شارەکانی ڕووسیا. بەو شێوەیەی کە دەبینین لە نێوان ئەو دوو وشەیەدا هاوشێوەییەکی ڕێژەیی هەم لە بواری واتا و هەم لە بواری تایبەتمەندیی فۆنەتیکییەوە بوونی هەیە. هەلبژاردنی شێوەی ڕووسی وشەکە لەوەوە سەرچاوەی دەگرت، کە ئەو خاتوونە لەم دواییانەدا کەسێکی خەڵکی ئەو شارەی ناسیبوو.

شیکارکردنی مەسەلەی دێڕە هۆنراوەیەک کە چەندین جار لە یەک شوێندا بەهۆی کەسێکەوە هێنرابوو بە قەرزداری دکتۆر ئێ. هیچمانی دەزانم. ئەو کەسەی ئەو دێڕەی بە بیر دەهاتەوە واتە خودی دکتۆر ئێ. نەیدەزانی ئەو دێڕە هۆنراوەیە چ لێکدانەوە و مەبەستێکی هەیە و هەروەها چ پەیوەندییەک لە نێوان هۆنراوەکە و ئەو شوێنەدا هەیە.

دکتۆر ئێ. وەها دەنووسێت: شەش ساڵ لەوەوبەر لە "بیاریتس" بەرەو سەن سباستیەن گەشتێکم کرد. هێڵی ئاسن بەسەر بەرزایی "بیداسۆ ئا"دا تێپەڕ دەبوو. بەسەر پردەکەدا دیمەنێکی زۆر جوان دەبینرا، لە لایەکەوە دۆڵێکی پان و بەرین و شاخەکانی "پیرنە" و لە لایەکی ترەوە "پیرنە" و لە لایەکی ترەوە دەریایەکی زۆر بەرین دەبینرا. ڕۆژێمی هەتاوی و دڵڕفێنی هاوینە بوو و هەموو شتێک لە ڕووناکی و درەوشاوەییدا نوقم ببوو.

ڕۆژانی پشووم تێپەڕ دەکرد و لە گەشتەکەمدا بۆ ئەسپانیا زۆر خۆشحاڵ بووم و لەناکاو ئەو دێڕانەم هاتەوە بیر:

"Aber rfei ist Schon die Seele,schwebet in dem Meer Vonlicht."

(بەڵام ڕۆح، کە هەر لە ئێستاوە ئازادە، لە ئۆقیانووسێک لە ڕووناکیدا مەلە دەکات).

لە بیرمە لەو کاتەدا هەوڵم دا هۆنراوەیەک وەبیر بهێنمەوە کە ئەو

دێڕەی لەخۆ گرتبوو، بەڵام نەمتوانی. بە گوێرەی مۆسیقای وشەکان بێگومان ئەو ڕستەیە یەک دێڕ هۆنراوە بوو، بەڵام هیچ بە بیر ناهێنمەوە لە زەینم تێپەڕ بوو، بە بیرم دێت لە چەند کەسێک بنەمایەکم پرسی، بەڵام کەسێک نەیتوانی ڕێنوێنیم بکات. ساڵی ڕابردوو کاتی گەڕانەوەم لە ئیسپانیا لەو ڕێگایەوە تێپەڕ دەبووم. شەوێکی تاریک و مات بوو و باران دەباری. من ڕووخسارم بە شووشەی دەرگای شەمەنەفەرەکەوە لکاندبوو و هەوڵم دەدا تێبگەم تا وێستگەی بیداسوئا دەڕۆین و لەپڕ ئەو دێڕەم بە زەیندا هاتەوە، بەڵام هێشتا نەمدەزانی بەندە بە کام هۆنراوەوە. پاش چەند مانگێک بە ڕێکەوت دیوانی هۆنراوەکەی "ئۆهلاند"م بەدەست گەیشت و کردەمەوە و یەکەم دێڕ بەر چاوم کەوت؛ ئەوە بوو: "بەڵام ڕۆح، کە هەر لە ئێستاوە ئازادە، لە ئوقیانووسێک لە ڕووناکیدا مەلە دەکات."
ئەم دێڕە دوایین دێڕی هۆنراوەی "دۆڵ"بوو. من دیسانەوە هەموو هۆنراوەکەم خوێندەوە و تاڕادەیەک بە بیرم هاتەوە، کە پێشتر ئەوەم لەبەر بوو. ڕووداوی هۆنراوە لە ئەسپانیا تێپەڕ دەبێت. پێموابوو ئەو بابەتە تەنیا پەیوەندیی نێوان ئەو دێڕە بوو کە لەبەر خوێنرایەوە و ئەو شوێنەی لەوێدا دێڕەکەم بە بیر هاتبووەوە، بەڵام بە تەواوی لەو دۆزینەوەیە ڕازی نەبووم و خۆنەویست پەڕەی دیوانی هۆنراوەکەم هەڵدەدایەوە. دێڕی مەبەست لە کۆتایی لاپەڕەیەکدا نووسرابوو، پەڕەکەم لادا و هۆناروەیەکم بینی و ناوی "پردی بیداسوئا" بوو. با ئەوەیش بڵێم ئەو هۆنراوەیەم لە هۆنراوەی پێشوتر باشتر نەدەناسی. دێڕە سەرەتاییەکانی وەها بوو:

(لەسەر پردی بیداسۆئادا پیاوێکی پیرۆز ڕاوەستا بوو، پیرەپیاوێک، کە لە جیهان پیرترە. ئەو بە دەستی ڕاست شاخەکانی ئەسپانیا و بە دەستی چەپ وڵاتی فەرەنسە ستایش (پیرۆز) دەکات).

ئەو شێوە ڕوانگەیە بۆ ناچارگەرایی ناو و ژمارەکان، کە بە دڵخواز هەڵبژێردراون، ڕەنگە بەهۆی چۆنیەتییەوە بتوانێت بۆ ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەکی تر یارمەتیمان بدات. دەزانین کەسانێکی زۆر لە بەرامبەر ناچارگەرایی تەواوی دەروونیدا بڕوایان بە ئازادیی ویستی مرۆڤ هەیە و ئەو بڕوایەیش ئاراستەیەکی بۆ تەسلیمبوون لە بەرامبەر باوەڕ بە ناچارگەرایی نییە و هەڵبەت وەک هەموو هەستە سروشتییەکانی تر بە یارمەتی هەندێ هۆکار پاساو دەدرێت. بەو لێکدانەوەیە پێموایە تێگەیشبێتم لە بڕیاردانە ڕبایەخ و گرنگەکاندا باوەڕ بە ویستی مرۆڤ خۆی نانوێنێت، لە هەلومەرجێکی وەهادا مرۆڤ زیاتر هەست دەکات دەکەوێتە بەر ناچاربوونی دەروونی، دان بەو کارەدا دەنێت و دەڵێت: "باشە من گەیشتوومەتە ئێرە و هیچ چارەیەکم نییە". بە پێچەوانەوە کاتێک کە مەسەلەی بڕیارە کەم بایەخ و کەم گرنگەکان دەخرێتە ڕوو، کەسەکە بە گیان و دڵ دەڵێت بە تەواوی توانیویەتی بڕیارێکی تر بدات و بە ئازادی کار بکات و بە ویست و بەبێ مەبەستێکی تایبەت کارێکی ئەنجام داوە. شیکردنەوەکان پیشانمان دەدات پێویست ناکات بە فەرمی ناسینی باوەڕ بە "ئازادیی ویستی مرۆڤ" حاشا لێ بکەین. کاتێک جیاوازی نێوان مەبەستی هەست و مەبەستی نەست دابنێین تەنها بەو بیرۆکەیە دەگەین، کە مەبەستەکانی نەست لە بواری هەموو بڕیارە جووڵەییەکانماندا کاری تێناکات Mininma non Curat. Praetor٢٢ بەڵام بەو شێوەیە وا دیارە لە سەرچاوەیەکی تر واتا لە ویژدانی نەست مەبەست وەردەگرێت و لە ئەنجامدا وەها دەردەکەویت کە لە ناچارگەرایی دەروونیدا هیچ جۆرە پچڕانێک لە ئارادا نییە.

هەرچەند ناسینی مەبەستی هەڵە ڕەفتارییەکان بەند دەبێت بە ئەندێشەی شڵەژێنەرەوە. لەو نموونانەی کە لە ئەزموونی زانستی

دەروونشیکاری ئۆپەلگیشم کردووە و باسم کردوون هەموو وتارەکان لەژێر کاریگەری یەک ئەندێشەدا بوون -ئەندێشەیەکی چاککراو لە کاتی وتنی قسەکەدا- بەڵام زۆر ئەستەم بوو، ئەو بیرکەوتنەوەیە بەهۆی خۆی بێت یان بە ئۆکەسیۆنی وشەی (Klapperschlangue= ماری زەنگی، Kleopatra کلیۆپاترا) یان بە کاریگەریی ناڕاستەوخۆ بەرجەستەی دەکات، واتە بۆ بەشە جۆراوجۆرەکانی وشاری ئەستەم و بەئەنقەست ئیجازە دەدات یەکتر تێک بدەن نموونە:

Durch die Asenatmen لە بری durch die Nase atmen

'بە لووت هەناسەدان' یان بۆ نموونە هەڵە لە کاتی وتنی ناوی شەقامێک Hasenauerstrasse و وەبیرهێنانەوە لەگەڵ بیرەوەری لە بارەی چێشتی فەرەنسی) ئەندێشەی سەرکوتکراو و ئەستەم، کە دەتوانێت ببنە هۆی دەرکەوتنی هەڵە، سەرچاوەی زۆر جیاوازیان هەیە، بەڵام ئەم دیسان پیاچوونەوەیە و خێرا ئامانگەیەنێتە هیچ ئەنجامێکی گشتی.

لێکۆڵینەوەی پێوانەیی نموونەی هەڵەی خوێندنەوە و هەڵەی نووسین دەکاتە وەڵامێکی وەها. زۆر جار وا دیارە هەڵەکە بۆ نموونە لە هەڵە وتارییەکانـدا لە کاری تێکەڵبوونەوە سەرچاوە دەگرێت و مەبەستەکانی لەسەر ئێمەدا داپۆشراوە، بەڵام زانینی ئەو حاڵە سەیرە ئایا تێکەڵبوونێکی وەها تەنها لەژێر کاریگەرییەکی تایبەتدا ئەنجام دەدرێت؟ تێکەڵبوون یاسای کاری خەونە، بەڵام لە وریاییدا هەرگیز بە شێوەی خەون دەرناکەوێت. ئەو نموونانەی ئێمە دەیانناسین هیچ شرۆڤەیەک لەو بارەوەیە ناخەنە بەردەست. بەڵام ئەگەر دەروونشیکارەکان بە پێویست حاشا لەم هەلومەرجە بکەن و دەرکەوتنی هەڵەکان تەنها بگەڕێننەوە بۆ جۆرێک لە پچڕانی سەرنجی

نەست، من هەر لە ئێستاوە نارەزایەتیم بەرامبەر بەو دەرەنجامەیان ڕادەگەیێنم. لە ڕاستیدا لە سەرچاوەیەکی ترەوە بەو ئەنجامە گەیشتووم کە کاری خۆنەویست (ئۆتۆماتیک) ڕێک بەهۆی تەندروستی و بێ مەترسیبوونی لە کارەکانی تر شیاوی جیاکردنەوەیە. من زیاتر بڕوام بەو ئاراستەیەیە کە لێرەدا بەو جۆرەی لە بایولۆجیدا ڕوودەدات بە دژواری دەکرێ دیاردە باوەکان، یان تارادەیەک باو بە گوێرەی دیاردە ناباوەکان بکرێتە بابەتی بەر توێژینەوە و هەڵسەنگاندن. بە بۆچوونی من دەبێ ئەو شتەی بە نادیاری دەمێنێتەوە بە توێژینەوەی تێکچوونە گرنگتر و خێراکان ئاشکرا بکەین.

تەنانەت لە بارەی هەڵەی خوێندنەوە و نووسینەوە نموونەی زۆر دێتە بەرچاو، کە بوونی مەبەستێکی سەیر و دوور لە زەین دەخاتە بەرچاو. "بە بەرمیل لە سەرانسەری ئەورووپادا" هەڵەی خوێندنەوەیە، کە لەژێر کاریگەریی بیرکردنەوەیەکی کۆندا کە هیچ جۆرە خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ بابەتی خوێندراوەدا نییە شرۆڤە هەڵدەگرێت. ئەو بیرکردنەوەیەی خاڵی دەسپێکی هەستی بەخیلی و بەرزەفڕی بوو و لە دووجۆربوونی واتای وشەی (Beförderung کەرەسەی گواستنەوە- پێشەکەوتن) کەڵک وەربگیرێت تا گرێ بدرێت بە مەسەلە ناگرنگ و وردەکانەوە کە مەسەلەی خوێندنەوە بوون.
تێکچوونی وتن بێگومان ئاسانتر لە تێکچوونەکانی تر ڕوو دەدات و بە گوێرەی شڵەژاوییە دەروونییەکانی تر پێویستیان بە دەستێوەردانێکی کەمتری وزە تێکچوونەکانە.

کاتێک لەبیرچوونەوە بە واتای تایبەتی وشە –واتە لەبیرچوونەوەی کارەساتی ڕابردوو- شی دەکەینەوە لە بورایێکی تردا دەبین. (دەکرێ لەبیرچوونەوەی ناوە تایبەتەکان و وشە پەیوەندیدارەکان بە زمانێکی

بیانی تا کاتێکی گونجاوتر لە گرووپێکی تردا پۆلێن بکرێت، کە بە ناوی "بۆشایی زووتێپەڕبووی زەین"ـەوە دەستنیشان بکرێت و لەبیرچوونەوەی پلان و بەرنامەکان وەک "سڕینەوە" جیا بکرێتەوە). هەلومەرجی سەرەکیی دەرەنجامە سروشتییەکان، کە دەگاتە لەبیرچوونەوە هێشتا بە نەناسراوی ماونەتەوە. باشە ئەم خاڵەیش بزانین: ئەو شتەی پێمان وایە لەبیرمان کردووە، لەبیرمان نەکردووە. شرۆڤەکانمان تەنها پەیوەندە بەو بوارانەی کە لەبیرچوونەوە بووەتە هۆی سەرسوڕمان، چونکە لە یاسایەک پەیڕەوی دەکات کە بەو هۆیەوە "تەنها مەسەلە بێبایەخ و ناگرنگەکان لەبیر دەچنەوە و مەسەلە گرنگەکان لە زەیندا دەمێننەوە." شیکردنەوەی ئەو نموونانەی بە بۆچوونی ئێمە پێویستییان بە شرۆڤەیەکی تایبەت هەیە، پیشاندەرن لە هەموو بوارەکاندا ناوەڕۆکی لەبیرچوونەوە دوورەپەرێزی لە بەدەستهێنانەوەی بیرەوەرییەکە ڕەنگە هەستێکی ناخۆش لە ناخی کەسەکەدا ببزوێنێت. لە ئەنجامدا دەکرێ هەڵبێنین ئەو ناوەڕۆکە هەوڵ دەدات تا بە شێوەیەکی گشتی لە ژیانی دەروونیدا خۆی دەربخات. بەڵام زۆر جار هێزە دژبەرەکان ڕووبەڕووی دەبنەوە و دەبنە لەمپەرێک لە بەردەم دەرکەوتنیدا. بیرکردنەوەی قووڵ و تەحەموولی زۆرمان لە کاتی وەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییە ناخۆشەکاندا گرنگییەکی تایبەتی هەیە، کە پێویستە توێژینەوەیەکی دەروونناسانەی قووڵی بۆ بکرێت. ئینجا مەسەلەی هەلومەرجی تایبەت کە لە هەر بوارێکی تایبەت یارمەتیدەرە بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئاراستەی گشتی لەبیرچوونەوە، ناکرێ جیا لەو کۆمەڵە بەربڵاوە توێژینەوەی لەسەر بکرێت.

لە بارەی لەبیرکردنی بەرنامە و پلانەکانەوە با بڵێم هۆکارێکی تری گرنگتر ڕۆڵی هەیە. ئێمە بۆ سەرکوتکردنی بیرەوەرییە ناخۆشەکان تەنها بوونی دژبەرەکان دەخەینە ڕوو، کە لێرەدا دەرکەوتنی

بەرچاوی هەیە و شیکردنەوەیش بەردەوام بوونی دژ- ئیرادە ئاشکرا دەکات کە لەگەڵ بواری مەبەستدا دەکەوێتە ناکۆکییەوە، بەڵام ئەوە ناسڕێتەوە. بەو شێوەیەی لە هەڵە ڕەفتارییەکانی پێشوودا بینیمان لێرەدا دوو جۆر دەرەنجامی دەروونی شیاوی ناسینە: دژ- ئیرادە دەتوانێت ڕاستەوخۆ بە پێچەوانەی بەرنامەکە خۆی بنوێنێت (بۆ نموونە کاتێک بەرنامەکە گرنگ بێت)، یان کە (وەک بەرنامە وردەکارییەکان) بەبێ بچووکترین هاوشێوەبوونێک لەگەڵ بەرنامەکاندا بەو شێوەیەی کە هەیە دەردەکەوێت. واتە پەیوەندی نێوان دژ- ئیرادە و بەرنامەی مەبەست دەتوانێت بەهۆی وەبیرهێنانەوەیەکی دەرەکییەوە دابین بکرێت.

هەر ئەو دژبوونە هێمای سەرەکی " هەڵە"کەیە. جووڵەیەک، کە بە تێکچوونی ڕەفتار دەردەکەوێت، زۆر جار یەک دژ- جووڵەیە، بەڵام لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا جووڵەیەکی زۆر نامۆیە و تەنها سوود لە وەبیرهێنانەوەکان وەردەگرێت تا لە کاتی کارکردندا کردارەکە بشڵەژێنێت و بوونی خۆی دەربخات. بواری شڵەژێنەر بەهۆی ناکۆکی دەروونییەوە زۆر گرنگن و زۆر جار بە کاری گرنگتر پەیوەند دەبن.

لە ئاکامدا لە کردارە هێمادار و بەرێکەوتەکاندا ڕۆڵی دژبەری دەروونی زیاتر لەناو دەچێت. ئەو دەرکەتانە کە ویژدانی هەست ئەوەندە گرنگییان پێ نادات، یان بە هیچ شێوەیەک لە چەمکەکەیان تێناگات لەو ڕووەوە لە خزمەتی دەرکەوتنی ئاراستە زۆرەکانی نەست و دوورخراوەی جۆراوجۆردا دادەنرێن و زۆر جار ڕەنگدانەوەی سومبولیکی وێناکردن و ئارەزووەکانن.

لە بارەی پرسیاری یەکەمەوە سەبارەت بە سەرچاوەی ئەندێشە و ئاراستەکان کە لە هەڵە ڕەفتارییەکاندا دەردەکەون، دەکرێ بەو شێوەیە وەڵام بدرێتەوە: لە زۆر بواردا ئەندێشە شڵەژێنەرەکان

دەگەڕێنەوە بۆ ئاراستەکان. لەخۆباییبوون و بەخیلی و ڕقهەلگرتن و هەموو هەستەکان و ئەو جووڵانەی کە ڕاهێنان و پەروەردەکانمان سەرکوتیان کردوون زۆر جار لە ناخی کەسەکەدا ڕێگایەک هەڵدەبژێرن، کە ئاکامەکەی هەڵەی ڕەفتارییە. ئەو هەست و جووڵانە وزەی حاشاهەڵنەگریان بە شێوەی جۆراوجۆر دەردەخەن، ئەو وزەیەی کە سەرچاوەی دەروونی بەرزتر ئەوانە ناناسێتەوە. ئاسانکارییەکی سادە و ئاسان بەرامبەر بەو شتە نائەخلاقییە تارادەیەکی زۆر ئازادی بە هەڵە ڕەفتاری و بەڕێکەوتەکان دەبەخشێت. لە نێوان ئاراستە سەرکوتکراوەکاندا ناکرێ ڕۆڵی ڕووداوە سێکسییەکان لەبەرچاو نەگیرێت. ئەگەر لە نموونەکانی ئەو کتێبەدا شیکردنەوە تەنها لە چەند بواری زۆر دەگمەندا توانی هۆکاری سێکسی جیا بکاتەوە، هۆکاری سەرەکی تەنها هەڵبژاردنی نموونەیە، چونکە زۆربەی نموونەکان لە بارەی ژیانی دەروونی منەوە بوو هەڵبژاردنیان لەسەر بنەمای بابەتێکی دیاریکراو ئەنجام دەدرێت کە پێویست بوو هەموو ئەو مەسەلانەی پەیوەند بوو بە بواری سێکسییەوە بسڕێتەوە. لە بوارەکانی تردا وا دیارە کە بیرکردنەوە شڵەژێنەرەکان لە هەندێ نارەزایەتی یان تێبینییەوە سەرچاوە وەردەگرێت کە بە تەواوی بێبایەخن.

ئێستا دەتوانین وەڵامی پرسیاری دووەم بدەینەوە، کە پێشتر باسمان کرد، لە چ هەلومەرجێکدا ئەندێشەیەک لە بری ئەوەی بە ڕاشکاوی و بە شێوەی تەواو بەیان بکرێت و بە شێوەیەک دەربکەوێت و لە کۆتاییدا بە شێوەی "انگلی" بە ئاڵوگۆڕ و تێکچوونی ئەندێشەیەکی تر دەردەکەوێت؟ بەرچاوترین هەڵە ڕەفتارییەکان پیشانی دەدات ئەو بارودۆخە دەبێ لە پەیوەندی لەگەڵ ویژدانی هەست و لە تایبەتمەندیی ڕەگەزە بەهێزەکەدا، یان ڕەگەزە سەرکوتکراوەکان بەدوایدا بگەڕێن. بەڵام لە ئاراستەی شیکردنەوەی کۆمەڵە نموونەکاندا

دەبینـین ئەو تایبەتمەنـدییە بە وردە جیـاوازی و زیـاتر لە پێشـوو نادیارتر کۆتـایی پێ دێت. حەز بە ئـازادبوون لەو مەسـەلەیە کاتمان بەفیڕۆ دەدات و هەروەهـا سـەرنجدانی ئەو ئەندیشـەیەی لە ڕاسـتیدا هیچ پەیوەندییەکی بە ئامـانجی مەبەستمانەوە نییە، ئەو مەسـەلەیە و مەسەلە هاوشێوەکانی تر بە ڕۆتینی لە سـەرکوتکردنی ئەندیشـەیەکدا (کە لەو دۆخەدا تەنهـا بە شـێوەی تێکچـوون لە ئەندیشـەیەکی تـردا ئاشـکرا دەبێت) هەر ئەو ڕۆڵە دەگێڕێت کە دابونەریت و ئەخلاق بۆ تاوانبـارکردنی ئاراسـتەیەکی دژە کـۆمەڵایەتی یـان ئەندیشـەیەکی وەرگیـراو لە کۆمەڵێـک نەسـت لە ئەسـتۆیدایە، بەڵام لەو ڕێگەیـەوە نـاگەین بە جـۆریەتی گشـتی ناچـارگەرایی هەڵە ڕەفتـاری و بەڕێکـەوتەکان. لەو تـوێژینەوانە تەنهـا یەک ڕاسـتی بەدەسـت دێنـین: مەبەستی هەڵەیەکی ڕەفتاری هەرچەند بێ زیان بێت بەو ڕێژەیەیش ئەندێشـەیەک کە لەو ڕێگایەوە ئاشکار دەبێت کەمتر بێزارکەرە و لە ئەنجامـدا هەرچەنـد ئەگەری بەدەسـتهێنانی ئەو بیرکـردنەوەیە بـۆ ویژدانی هەسـت زیـاتر بێت، ئەگەری شـرۆڤەکردنی دیاردەکە کاتێک سـەرنجی پێویسـتی دەخەینە سـەر ئاسـانتر دەبێـت. ئێمە خێـرا لە بچووکترین هەڵەکانمان تێدەگەین و خێرا چاکیان دەکەینەوە، بەڵام لە هەندێ بواردا کە مەبەستی هەڵە ڕەفتارییەکان لە ڕاستیدا ئاراستەی سـەرکوتکراوە، شیکردنەوەیەکی قووڵ پێویست دێتە بەرچاو و ئەو شیکردنەوەیە ڕووبەڕووی کێشەی گەورە دەبێتەوە و تەنانەت لە زۆر بواردا سەرکەوتوو نابێت.

لەم بابەتـانەوە دەتوانرێـت بەم شـێوەیە ئەنجـام وەربگـرین: ئەگەر بمانەوێت وێنایەکی ڕەزامەندانە لە هەلومەرجی دەروونناسانەی هەڵە ڕەفتاری و بەڕێکەوتەکان بەدەست بێنین، دەبێ توێژینەوەکانمان لە ئاراستەیەکی تردا بەرەوپێش بەرین و ڕێگایەکی تر هەڵبژێرین. بۆیە لە خوێنەری ڕێزدار تکا دەکەم ئەم توێژینەوانە تەنها بە چەند بەشێک

لە کۆمەڵێکی بەربڵاوتر و وەرگیراوەی تەواوتر لە بەرچاو بگرێت، کە بە شێوەیەکی ڕۆتینی جیامان کردووەتەوە.

ئێستا تەنها چەند دێڕێکی تری پێ زیاد دەکەین تا پیشانی بدەین، کە بۆ گەیشتن بەم کۆمەڵە بەربڵاوە، چ ڕێگایەک دەبێ هەڵبژێرین. میکانیزمی هەڵە ڕەفتاری و بەرێکەوتەکان هەروەها کە بە یارمەتیی شیکردنەوە ئاشکرا کرا، دەیسەلمێنێت، کە هاوشێوەبوونێکی زۆر لە نێوان میکانیزم و میکانیزمی پێکهاتەی خەونەکان لە بورای خاڵە سەرەکییەکاندا لە ئارادیە. من لە کتێبی زانستی خەونەکاندا لە بەشی 'لێکدانەوەی خەونەکان'دا میکانیزمی ئەم دیاردەیەم شرۆڤە کردووە. لە هەردوو بوارەکەدا -خەون و هەڵە- ئێمە شایەتحاڵی تێکەڵبوون و خەوشاندنین، بارودۆخەکە یەکسانە واتە بەو شێوەیە دەکرێ ئەوە لێک بدرێتەوە، ئەندێشە نەستییەکان بە گۆڕینی شێوەی بیرکردنەوەکانی تر و بە پەیڕەویکردن لە ڕێگا نائاساییەکانی تر و بە شێوەی جیا لە وەبیرهێنانەوە دەرەکییەکان دەتوانن دەربکەون. پووچی و دژبەر و هەڵە جیانەبووەکان لە ناوەڕۆکی خەون -کە بەهۆی بوونیان زۆر جار لە ڕوانگەدا گومان لەم دیاردەیە دەکرێت وەک بەرهەمێکی کرداری دەروونی- لە هەڵە باوەکانی ژیانی ڕۆژانەدا ئێمە بەو شێوەیە دەردەکەوین هەرچەند خەون لە بەرامبەر ئەو کردارانەدا لە دەسکەوتە ئازادەکان سوود وەردەگرن. لە هەردوو دیاردەدا دەرکەوتی کرداری نادروست بە تێبینی لەسەر دەستێوەردانی تایبەت بە هەردوو، یان چەند کرداری دروست شرۆڤە هەڵدەگرێت. لەم هاوشێوەبوونە دەرەنجامێکی گرنگ بەدەست دێت: شێوەی کردارێکی تایبەت، کە ئێمە بەرجەستەترین دەرکەوتەکەی لە ناوەڕۆکی خەوندا دەبینین تەنها بە پشتبەستن بە ڕاوەستانی کاتیی ژیانی دەروونی شرۆڤە ناکرێت، چونکە ئێمە دەرکەوتەکانی ئەو شێوە کردارە لە دۆخی وریاییشدا دەبینین. بەهۆی ئەم تێبینیانەوە ناتوانین

پچڕانی قووڵی چالاکییە دەروونییەکان یان دۆخی نەخۆشناسای کردارەکە بە مەرجی دەرکەوتنی ئەو دەرەنجامە دەروونییە بە ڕواڵەت باو و سەیرە دابنێین.

بەڵام ئەگەر ئەو ڕاستییە سەداسەد زانستییە لە بەرچاو بگرین، کە هێما عەسەبییەکانی نەخۆشی دەروون ئازار و بە تایبەتی پێکهاتەی دەروونی هیستریا و دەروونئازاری ڕاڕایی هەموو تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەو شێوە کردارە لە میکانیزمی خۆیاندا پەرچ دەدەنەوە، دەتوانین لە بارەی کاری تایبەت کە ئاکامەکەی هەڵەی ڕەفتاری یان وێنای پێکهێنانی خەونە، دادوەرییەکی دروست بخەینە ڕوو. کەواتە ئەگەر هەڵەی ڕەفتاری و بە ڕێکەوت و هێمادار لە سێبەری ئەم هاوشێوەبوونەدا توێژینەوەی لەسەر بکەین سوودێکی تایبەتی لێ وەردەگرین، چونکە ئەگەر ئەو کردارانەیش لە ڕیزی دەرکەوتە عەسەبییەکانی دەروون ئازار دابنێین و بە هێماکانی دەروون ئازار بژمێرین، چەمک و بنەمامان داوەتە دوو بیرۆکە کە زۆر جار باسی لەسەر دەکرێت: یەکەم ئەوەی کە هیچ سنوورێکی دیاریکراو لە نێوان دۆخی عەسەبی باو و کرداری عەسەبی ناباودا نییە، دووهەم ئەوەی کە هەموومان تارادەیەک دەروونئازارین. تەنانەت بەبێ ئەزموونی پزیشکیی درێژخایەن دەکرێ وێنا بکرێت، کە چەندین جۆر دەروونئازاری پەرەسەندوو و چەندین جۆر "سەرکوتبوونی عەسەبی" لە ئارادایە، ئەو هێمایانەی دەگمەنن یان بە ماوەیەکی زۆر یان بە شێوەیەکی کاڵ دەردەکەون، واتە دەرکەوتە زیانناسییە کاڵەکان لە بواری ڕێژە و توندی و پتەوی. ڕەنگە هەرگیز نەتوانین دۆخێک بدۆزینەوە کە ڕێک باوترین قۆناغی ئاڵوگۆڕی هەنگاو بە هەنگاو لە دۆخی باو بە شێوەی زیانناسیی ناباوە. خاڵی جیاوازی دۆخی پێویستمان بە دەرکەوتە زیانناسییەکان بە شێوەی هەڵە ڕەفتاری و هێمادارەکان ڕێک لەوەدایە ئەو هێمایانە پەیوەندە بە



CS CamScanner

کرداره دەروونییه کەم بایەخەکانەوە لە حاڵێکدا هەموو ئەو شتانەی دەتوانن بایەخێکی دەروونیی گرنگتریان هەبێت بەبێ بچووکترین تێکچوون ئەنجامی دەبێت. هەڵویستی پێچەوانەی ئەم هێمایانە واتە دەرکەوتیان لە گرنگترین کرداره دەروونییەکان لە بواری تاک و کۆمەڵگەوە تایبەتە بە بوارەکانی دەروونئازاری و زیاتر لە جۆراوجۆربوون و توندی، هێماکانی زیانناسی بواری ناباو دیاری دەکرێت و لێک دەدرێتەوە.

بەڵام تایبەتمەندیی هاوبەش لە نێوان لاوازترین و توندترین بوار، هەروەها لە نێوان هەڵە ڕەفتاری و بەڕێکەوتەکاندا، لەوەدایە، کە هەموو دیاردە باسکراوەکان بەبێ جیاوازی، دەیدەنە پاڵ هەندێ ڕەگەزی دەروونی، کە بە تەواویش سەرکوتکراو نین، هەرچەند لە ویژدانی نەستدا سەرکوت بوون، بەڵام هەموو توانایان بۆ دەرکەوتن و گەشەکردن لەدەست نەداوە.

## چۆن ڕووبەڕووی لەبیرچونەوە ببینەوە

بێگومان ئێمە هەموومان توشی حاڵەتی لەبیرچوونەوە دەبین بەڵام هەریەکەمان بەجۆرێک، ڕەنگە هەندێکجار سەرمان لەوە سوڕبمێنێت بۆچی تەنها لەبوارێکی تایبەت شتمان لەبیردەچێتەوە، بۆچی لەبوارەکانی تر زۆر چالاکین و دەتوانین بەئاسانی شتەکان بەبیرخۆمان بهێنینەوە، بۆ نموونە هەندێ کەس تەنها لە ژمارە کێشەیان هەیە ناتوانن ژمارەکان بەبیر خۆیان بهێننەوە یانیش هەندێک کێشەیان هەیە لەبەبیرهاتنەوەی(ناو). ئەمانە هەمووی حاڵەتی ئاسایین چونکە هەموو مرۆڤێک توشی ئەم کێشەیە دەبێت کەواتە نابێت بیر لەوە بکەینەوە کەوا ئێمە توشی تێکچونی یادەوەری بووین، بەڵکو ئەمە گرفتێکە بەئاسانی دەتوانرێت چارەسەربکرێت. مرۆڤ سێ یادگەی هەیە سەرەتا ئەو زانیاریانەی ئێمە وەریدەگرین دەچێتە یادگەی هەستی، کە لەرێگەی هەستەکانەوە وەریدەگرین، ئەمە مانەوەیان لێرە چارێکە چرکەیەک دەخایەنێت وەک بینی ئەو هەموو شتەی لەدەوروبەرماندایە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت هەموو ئەو شتانەی دەیبینێت لەیەک کاتدا کۆی بکاتەوە، تەنها ئەو زانیاریانەی پێویستن دەچێتە ناو یادگەی کورتخایەن و بەپێی مامەڵەکردنی تاکەکە دەبێت و لەناو ئەم یادگەیەش تەنها ماوەی ١٥ تا ١٨ چرکە دەمێنێتەوە، ئەگەر پێویست بێت ئەم زانیارییە لە ڕێگای زیاتر دووبارە تەماشاکردنەوە یاخوت دووبارە خوێندنەوە چەند جارێک ئینجا دەچێتە ناو یادگەی درێژخایەن.

ئەوکاتەی ئێمە ناتوانیین ڕووداوەکان، بابەتەکان، هێماکان یان ژمارەکان بەبیر خۆمان بهێنینەوە، هۆکاری ئەوەیە زانیارییەکە نەگەیشتۆتە ناو یادگەی درێژخایەن، چونکە ئێمە بەپێی پێویست

نەمانتوانیوە مامەڵە لەگەڵ زانیارییەکان بکەین، دەبێت ئەوە لەبیر نەکەین کە یادگەی درێژخایەن دەتوانێت زۆرترین زانیاری عەمبار بکات بۆماوەیەکی زۆر هەڵیبگرێت و بیپارێزێت لە لەناوچوون.

**هۆکارەکانی لەبیرچوونەوە:**

زانایان و پسپۆڕانی بواری دەروونناسی هەوڵی زۆریاندا بۆ ئەوەی بزانن کە هۆکاری لەبیرچوونەوە چییە، بۆ ئەم مەبەستە ئەم هۆکارانەی خوارەوەیان خستە ڕوو:

**هۆکاری یەکەم /**پشتگوێ خستنی زانیاریەکان: مەبەست لەپشتگوێ خستنی زانیارییەکان ئەمەیە کەتاک ئەم زانیاریانەی وەریگرتوە بەکاریناهێنێت و پشتگوێ دەخات، بۆیە توشی لەبیرچونەوە دەبێت.

**هۆکاری دووەم /**پوکانەوە زانیاریەکان: ئەمیش هۆکارێکی ترە چونکە ڕۆژ بەدوای ڕۆژ ئەو زانیاریانەی لەناو یادگەی درێژخایەنی مرۆڤ هەیە توشی پوکانەوە و لەناوچوون دەبێت، بەتایبەت لەرووی تەمەنەوە هەرچەندە تاکەکە تەمەنی گەورەتربێت ئەوەندە زیاتر زانیارییەکان توشی لەناوچوون دەبن. توێژینەوە نوێکانیش ئەوەیان دەرخستووە زیاتر ئەو کەسانەی بەتەمەن دادەچن توشی لەبیرچونەوە دەبن.

**هۆکاری سێیەم /**هەندێک لەزانایانی تر پێیان وایە فاکتەرێکی تری لەبیرچوونەوە تێکەڵ و پێکەڵ بوونی زانیاریەکانە، ئەم زانایانە وای بۆدەچن ئەوانەی شتیان لەبیر دەچێتەوە بەهۆی تێکەڵاو بوونی زانیاریەکانە بەتایبەتی ئەو زانیاریانەی لەبابەتێک هەیە کەلەیەک دەچن، بۆیە زانایان پێیان باشە ئەم بابەتانەی لەیەک دەچن نابێت بەدوای یەکدا بخوێنرێت چونکە زانیارییە کۆنەکە دەبێتە ڕێگر لەبەردەم زانیارییە نوێیەکە بەمەش توشی تێکەڵبونی زانیاریەکان

دەبێتەوە. فرۆیدیش هۆکاری لەبیرچونەوە دەگەڕێنێتەوە بۆکبتکرنی ئەو کارەسات و روداوە ناخۆشانەی کەهەستی مرۆڤ بریندارەدەکەن.

**لەگەڵ ئەوانەدا هەندێ هۆکاری تریش دیاریکراون کە دەبنە هۆی لەبیرچوونەوە وەک:**

١. هەندێکی تر لەزانایانی دەروونناسی پێیان وایە هۆکاری لەبیرچونەوە بۆ ئەوکاتە دەگەڕێتەوە کە تاک توشی روداوێک یان کارەساتێکی دڵتەزێن دەبێت.

٢. هەندێکی تر پێیان وایە هۆکاری لەناوچونی زانیاریەکان یان سڕینەوەی لەناو یادگە دەگەڕێتەوە بۆهەڵنەمژینی پرۆتین لەلایەن مێشکەوە ئەمەش دەبێتە هۆی رێگە گرتن لە عەمبارکردنی زانیاری.

٣. زیان گەیاندن بە مێشک؛ ئەمەش یەکێکە لەهۆکارەکانی لەبیرچونەوە.

**هەندێ رێنمایی بۆ رێگە کرتن لە لەبیرچوونەوە:**

١. پسپۆران رێنماییمان دەکەن کە بەهیچ جۆرێک هەوڵنەدەین ئازاری سەر بدەین چونکە لێدان لەسەر زۆر زیانبەخشە، ئەگەری لەکار کەوتنی مێشکی لێدەکەوێتەوە. بۆ ئەوەی ئێمە خۆمان بەدووربگرین لە لەبیرچونەوە پێویستە خۆمان لەزەبرە کوشندەکان بەدوور بگرین بەهیچ شێوەیەک نەهلێن بەهیچ ئامێرێک یاخوت بەشەق لەسەرمان بدرێت و بە هەموو شێوەیەک جەستەی خۆمان بپارێزین.

٢. لەرووی مانەوەی زانیاریەکانیش ئەو زانیاریانەی کە عەمبار کراون لەناو یادگە پێویستە بەردەوام بەبیر خۆمان بهێنینەوە و پرۆڤە بکەین لەسەر ئەو زانیاریانەی کە هەمانە بۆ ئەوەی پارێزگاری لێبکەین بۆمانەوەیان.



CamScanner

٣. بۆمانەوەی زانیاریەکان لەناو یادگە پێویستە بابەتەکە یاخود زانیارییەکە بنوسریتەوە، تەنها بەشێوەی زارەکی نەبێت چونکە نوسینەوە زانیاریەکە بۆماوەیەکی درێژ دەهێڵێتەوە.

٤. نابێت بەبەردەوامی خۆمان تەنها بەیەک کار خەریک بکەین دەبێت جموجۆڵمان هەبێت و گرنگی بەکاری تر بدەین، چونکە گرنگیدان بەیەک کار و فەرامۆشکردنی کارەکانی تر دەبێتە هۆی سستبوونی خانەکانی مێشک بەمەش کاریگەری دروست دەکات لەسەر یادگە.

٥. لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە پێویستە تاک گۆشەگیر و تەنیا نەبێت، پێویستە کۆمەڵایەتی بێت و پەیوەندی دروست بکات لەگەڵ دەوروبەری. گۆشەگیری و تەنیای هۆکارێکە بۆ لەبیرچونەوەی زانیارییەکان.

٦. لەڕووی وەرزشیەوە پێویستە گرنگی پێ بدەین چونکە وەرزش مێشک چالاک دەکات سیستەمی هەناسەدان و جوڵە ڕێکدەخات، بەتایبەتی بۆ بەتەمەنەکان.

٧. پێویستە بەردەوام سەرقاڵ نەبین کاتی پشوو بۆخۆمان دەبنێین و لەساڵێکدا چەند جارێک سەفەر بکەین.

٨. ئەگەر کێشەی ترس یان دڵەڕاوکێمان هەبێت پێویستە چارەسەری بکەین.

٩. گرنگی بەمۆسیقا بدەین توێژینەوەیەکی نوێ ئەوەی سەلماندوە مۆسیقا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە بۆ خۆپاراستن لە لەبیرچونەوە بەتایبەت مۆسیقای کلاسیک.

١٠. باشترکردنی خواردن: پێویستە گرنگی بە سەوزە و میوە بدەین، بەتایبەتی خواردنی مۆز کاریگەری باشی هەیە لەسەر



CamScanner

چالاکبوونی مێشک و بەبیرهاتنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا خۆمان بە دووربگرین لەو خواردنانەی کە ڕێژەی شەکر و چەوریان زۆرە، لە هەمان کاتدا گرنگی بە خواردنەوە شیر بدەین. هەروەها پێویستە بەهەموو جۆرێک دووربکەوینەوە لە خواردنەوەی مادده کهولیەکان، چونکە بەکارهێنانی ئەو ماددانە دەبێتە هۆی لەناوچوونی خانەکانی مێشک.

## ٦ریگا بۆ پاراستنی مێشک لە نەخۆشی ئەلزەهایمەر

نەخۆشی ئەلزەهایمەر بریتیەلە لەناوچونی خانەکانی مێشک، لەگەل زیادبونی تەمەن ئەگەری توشبونی زیاتر دەبێت، کەسی توشبو ناتوانێت یادەواریەکانی بیر بکەوێتەوە، هەندێک جار بە شێوەیەکی لێدێت کە کەسە نزیکەکانی ناناسێتەوە، ماڵپەری helpguide شەش ریگای بڵاوکردوەتەوە کە ریگر دەبێت لە توشبون بەم نەخۆشیە.

**یەکەم :**راهێنانی جەستەیی، بە پێی تویژینەوەکان ئەنجامدانی وەرزش و راهێنان ریگرە لە گەشەکردی نەخۆشی ئەلزەهایمەر بە ریژەی ٥٠٪، یارمەتیدەرە بۆ باشتر هاتوچۆی خوێن و بەهێزکردنی بیرەوەری، کەمکردنەوەی فشاری خوێن و دەرونی.

**دوەم :**بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان لەریگەی ناسینی کەسانی نوێ، هەروەها ئەنجامدانی چەندین کاری خۆبەخش، رۆیشتن بۆ جێم، سەردانکردنی دراوسێکان، هەفتانە بینینی هاورێ نزیکەکان یارمەتیدەرێکی زۆرباش دەبن بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان و هۆکارە بۆریگری کردن لە توشبون بە ئەلزەهایمەر.

**سێیەم :**خۆراکی تەندروست هۆکارێکە بۆ دورکەوتنەوە لە نەخۆشی ئەلزەهایمەر و بیرچونەوە، چونکە بیرچونەوە بەهۆی لەناوچونی خانەکانی مێشکەوەیە، کە دەکرێت لە ریگەی پەیرەوکردنی سیستمی خۆراکی تەندروستەوە ریگری لێبکەیت، خواردنی گوێز، سەوزە، ماسی بەسودن.

**چـــوارەم** :بەردەوام ئەنجامـــدانی ئەو یاریـــانەی دەبێـــتە هـــۆی وریاکردنەوەی مێشک و پەرە بەتوانا مێشکیەکان دەدەن، وەکو یاری پەزڵ، کیـــــــــوب، دۆزیـــــــــنەوەی مەتەڵ، ســـــــــــۆدوکۆ.

**پێنجەم** :خەوێکی تەندروست، دەتپارێزێت لە توشبون بە ئەلزەهایمەر، پێویستە رۆژانە ٨ کاتژمێر بخەویت، بۆ ئەوەی سەرنجت زیاتربێت و مەترســـــی لەبیرچـــــونەوە و ئەلزەهـــــایمەر کەم ببێـــــتەوە.

شەشـەم :هەبونی سترێس هۆکارە بۆ لەبیرچونەوە، چونکە رێگری دەکـات لە گەشـەکردنی خانەکـانی مێشـک و کـاریگەری زیانبەخشـی دەبێت، رۆژانە خۆت لە سترێس بەدور بگرە.

## ٩ کاری ڕۆژانە کە مێشکت بەهێز دەکات و بێگومان پشتگوێت خستووە

مێشکی مرۆڤ دەکرێت زۆر زیاتر لەو توانانەی هەیەتی بەهێز بکرێت، بەڵام چۆن؟

ئەمانە ٩ ڕێگان کە دەتوانیت لەو ڕێیەوە تواناکانی مێشکت زیاد بکەیت:

١ .لەگەڵ هاوڕێکانت بڕۆ بۆ پیاسە

پیاسەکردن لەگەڵ هاوڕێکەت سەرەڕای جوڵەی فیزیکی قسەکردنیشە لەسەر چەندین بابەتی کۆمەڵایەتی  کە ئەمانەش پێکەوە مێشک بەهێزدەکەن.

٢ .لێکدانی پەزڵ و یاریکردن

یارییەکانی وەک سۆدۆکۆ و شەترەنج و ڕێکخستنی پەزڵ وا لە مێشک دەکەن کە بە قوڵی بیربکاتەوە و لەسەر یەک بابەت تەرکیز کۆدەکەنەوە. لەوەش سەیرتر پزیشکان هەمیشە ڕێنمایی ئەو کەسانە دەکەن کە کێشەی لەبیرچونەوە و تەرکیزیان هەیە ڕۆژانە بۆ چەند خولەکێک یارییە ڤیدیۆییەکانی وەکی پلەیستەیشن BN  بکەن تاکو بتوانن لەسەر ئەو یارییەی کە دەیکەن تەرکیزیان کۆبکەنەوە.

٣ . تێرامان

تێرامان و وردبوونەوە ئاسانترین ڕێگایە،  ئەگەر هەموو ڕۆژ و بۆ ماوەیەکی کەم ئەم ڕاهێنانە بخەرێتە نێو خشتەی ڕۆژانەت دەبیتە خاوەنی مێشکێکی هێمن  و تەرکیزێکی زۆر باش.

٤.خواردنی تەندروست

ئەو خواردنەی کە رۆژانە دەیخۆین کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەی هەیە لەسەر مێشکمان بۆ ئەوەی پێی بزانین. مێشکی مرۆڤ ٪٢٠ ئەو خۆراک و ئۆکسجینە بەکار دەهێنێت کە دێتە لەشییەوە. هەربۆیە خواردنی ناتەندروست کاریگەری خراپ جێدەهێڵێت لەسەر تواناکانی مێشک.

٥.بە شێوەیەکی ئیجابی بیربکەرەوە

ستریس و دڵەراوکێ بەشێکی زۆر لەهەستە دەمارەکانی مێشکی مرۆڤ دەکوژێت و رێگری دەکات لە دروستبوونی خانەی هەستەدەماری نوێ. لێکۆڵینەوەکان نیشانمان دەدەن کە بیرکردنەوە لەداهاتوو بە شێوەیەکی ئیجابی دروستبوونی خانەکانی مێشک خێراتر دەکات و دڵەراوکێش لەناو دەبات.

٦.پێکەنین زیاد بکە

پێکەنین دەبێتە هۆکاری دەردانی ماددەی ئەندرۆفین کە کاریگەرییەکی زۆر گەورە لەسەر مێشک دروست دەکات و ئازار کەم دەکاتەوە و خۆشی زیاد دەکات. بۆ ئەم مەبەستەش واز لە فیلم و دراما تراژیدییەکان بهێنە و تەماشای فیلمە کۆمیدییەکان بکە و ئەو کەسانەش لە دەوری خۆت کۆبکەرەوە کە هەمیشە خۆشترین قسە و نوکتە و بەسەرهاتیان لە لایە.

٧.گوێ لە میوزیک بگرە

لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان سەلماندووە کە گوێگرتن لە میوزیک کاریگەری دەبێت بەسەر بەشی راستی مێشکی مرۆڤەوە و ئەو کەسانەی کە بە شێوەیەکی بەردەوام گوێ لە میوزیک دەگرن زیرەکترن لەو کەسانەی زۆر کەم گوێ لە میوزیک دەگرن.

٨.ئامانجەکانت دیاری بکە

دانانی ئامانج و ڕێکخستنی پلانەکانت بیرکردنەوەی ئیجابی زیاد دەکات، ئەمەش وادەکات مێشک بە شێوەیەکی بەردەوام بیر لە ئەنجامدانی کارێک بکاتەوە و تەرکیزی لەو جێگایەدا کۆببێتەوە، ئەمەش بە ڕێگایەکی زێڕین دادەندرێت بۆ بەهێزکردنی تواناکانی مێشک.

٩.خەوتن و هەستانت ڕێکبخە

شەوێک ئەبێت بە شەمشەمە کوێرە و شەوێکیتریش بەمریشک! دڵت بەمە خۆش مەکە چونکە ئەمە مانای نارێکی و بێ بەرنامەییە لەخەوتن و هەستان. ئەم هەڵسەکەوتەش نەک تەنها زیان بە مێشکت دەگەیەنێت، بەڵکو کاریگەری زۆر نەگەتیڤی لەسەر جەستە و پێستیشت بەجێدەهێڵێت. تێرخەوی بەردەوام مێشک بە شێوەیەکی تەندروست دەهێڵێتەوە، وەک پێشینان گوتوشیانە "مێشکی تەندروست لە لاشەی تەندروستدایە."

## خوێندنەوە و گرفتی لەبیرچونەوە

١-دڵەڕاوکێ و نائارامی دڵ ودەرون.

٢-کەم خەوی و نارێکی لەسیستەمی خەودا.

٣-بەکار نەهێنانی ڕێگەی تەندروست و زانستی لەخوێندنەوەدا.

٤ -تووش بوون بە بەدخۆراکی و کەمی هەندێک لەڤیتامینەکانی وەکو: ڤیتامین [B] و [ ماغنسیۆم] و [ کالیسۆم] و [ فسفۆڕ] و ماددەی ئاسن.

٥ -بەرکەوتنی بەهەندێک بەلێدانی بەهێز.

٦ -قەڵەوی زۆر و زیادبونی ناسروشتی کێش.

٧ -بۆماوەیی.

٨ -پیری و بەساڵاچون.

٩ -بەکارێنانی ماددەی هۆشبەر.

١٠ - پیسی ژینگە.

١١ -گوناه و تاوان.

١٢ -ئەنجامدانی نەشتەرگەری لەمێشک و دەمار.

## لەبیرچوونەوە .... هۆکار و چارەسەر

لەبیرچوونەوە یەکێکە لەو دیاردانەی کە مرۆڤ لەمێژەوە تووشی بووەو بەدەستیەوە دەناڵێنێ و لەگەڵ سروشتی ژیانی مرۆڤدا بەردەوام بووە،بۆنموونە کاتێک ئادەم و حەوا کەبەدایک و باوکی مرۆڤایەتی هەژمار دەکرێن ئەوان:یەکەم کەس بوون تووشی لەبیرچوونەوە هاتن کاتێک خوای گەورە پێی فەرمووبوون لەبەری ئەو درەختە نەخۆن لەسەر زەویدابوو،بەڵام ئەم بەڵێنەی خوای گەورەیان لەیادچوو،لەبەرئەمە نەوەکانیان کەئێمەین تاکو ئێستا بەدەست لەبیرچوونەوەوە دەناڵێنین، کەوایە لەبیرچوونەوە نەخۆشی نیە،واتە:لەبیر چوونەوە هەندێک جار (posetive)ئەرێنی و باشە،لەبەر ئەوەی هەریەک لەئێمە بەدرێژای ساتەکانی تەمەنمان تووشی چەندین بارودۆخی ناخۆش و بەئازار بووینە ئەگەر لەبیرچوونەوە نەبوایە ئەوا ژیانی هەریەک لەئێمە تێک دەچوو،بەڵام کاتێک قوتابی زۆر دەخوێنێ دواتر لە تاقی کردنەوەکاندا تووشی لەبیرچوونەوە دێت،یان کەسێک چەندین جار یەکتر ناسین ئەنجام دەدات لەگەڵ برادەرو هاوڕێ و کەسانی تردا لەئەنجامدا گلەی ئەوەدەکات کەناوی کەسانی تری لەبیر چۆتەوە ئەمەیان (negative) نەرێنییە و خراپە،لێرەدا باسی کۆمەڵێک تیۆر دەکەین،دواترچۆنیتی خۆپاراستن و ڕێگەچارەی چارەسەری گونجاو بۆ لەبیرچوونەوە:

***لەبیرچوونەوە چییە؟**

مەبەست لەبیرچوونەوە ئەوەیە نەتوانین لەکاتی پێویستدا ئەو زانیاری و شتانەی کە پێویستمانە بهێنینەوە یادی خۆمان و کارو چالاکیەکانی پێ جێ بەجێ بکەین.

***تیۆری ئیبنجهاوس:**

کاتێک باسی لەبیرچوونەوە دەکرێت تیۆەری ئیبنجهاوس سەرەکی ترین تیۆەرە،ئەمەش کاتێک زانا ئیبنجهاوس هەستا بەتوێژینەوەیەک لەسەر کۆمەڵێک کەس،شەویش بە بەکارهێنانی برگەو ووشەی بێماناو نامەعقول،لەمیانەی توێژینەوەکەی (١٣) برگەی بەکار هێنا کەپێک هاتبوو لەووشەو برگە هیچ مانایەکیان نەبوو،پاشان ئەم زانایە دوای لێ کردن برگەکان لەبەر بکەن،دوای تاقیکردنەوەکە تابزانێ چەندجیان لەبەر کردووە،بۆیە دوای (٢٠) خولەک لە٥٠٪ی برگەکانیان لەبیرچوویەوە، دوای(٦٠)خولەک لە ٦٦٠٪یان لەبیرچوویەوە،دوای (٦)رۆژ ٧٥٪ یان بیرچوویەوە، پاشان دوای (٣١) رۆژ ٨٠٪یان بیرچوویەوە،بۆیە ئیبنجهاوس گەیشت بەو ئەنجامەی کەئەو شتانەی بێمانان و پەیوەست نین بەیەکەوە زوو لەکۆئەندامی یادەوەری نامێنن و لەبیر دەچنەوە،

**یەکەم:تیۆەری تێکەڵکردن و ڕێگەگرتن (نظریە التداخل والتعطیل(**

بەهۆی تێکەڵبوونی زانیاری کۆن و نوێ کە هەریەکەیان دەبن بەڕێگر لەبەردەم ئەوی تردا.بەتایبەت ئەو بابەتانەی هاوشێوەی یەکترن ،باشتر وایە بابەتە لێک چووەکان دوری یەکتر دابنرێت لەخشتەکانی رۆژانەداو پشـــــوو لەنێوانیانـــــــدا هەبـــــــێ.

**دووەم: تیۆەری پشتگوێ خستن (نظریە الاهمال)**

ئەم تیۆەرە وای دەبینێ زانیاری و شتە هەستپێکراوەکانی ناو کۆئەندامییادکردنەوەئەوە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو لاوازی دەچێت، واتە: ئەو زانیاری و بابەتانەی مرۆڤ وەری دەگرێت،دوای ماوەیەک لەبیر دەچێتەوە،بەهۆیتەمبەڵی وبەکارنەهێنانیەتی ،لەسەر تاکەکان پێویستە بابەت و ناو زانیاریەکان کاریان پێبکات، تا لەبیریان نەچێتەوە.

### سێیەم:تیۆەری خەفەکردن و چەپاندن (نظریە الکبت)

فرۆید پێی وایە هۆی لەبیرچونەوە بەهۆی خەفەو کپ کردنی ئەو زانیـاری و ڕوداوو وروژێـنەرانەیە کەبەئـازارو ناخۆشـن و هەسـت وسـۆزی مـرۆڤ برینـدار دەکەن لەبـواری هەستیەو(الشـعور) دوور دەخرێنەوە بۆ بواری نەستی(اللاشعور) هەندێک جار مرۆڤ تووشی (فقدان الزاکرە (Amnesia) (دەبێ.

### چوارەم: تیۆەری سڕینەوە

فێربـوون دوای مـاوەیەک بەهـۆی ڕوودانـی بـارو دۆخـی تـایبەت مرۆڤ توشی لەبیر چوونەوە دەبێت،

وەک:

بـــوونی ڕووداوی دڵـــتەزێن و کارەســـاتی جەرگ بـــڕوەک (تەفینەوەکان،کارەساتی ئەنفال،هەڵەبجە-ڕووداوی هاتوو چۆ.

بەهـــۆی مـــادە هۆشـــبەرەکان و ڕووداو کارەســـات، هەنـــدێک لەبەشـەکانی مێشـک زیـانی پێدەگات و زانیاریەکـانی نـاو کۆئەنـدامی یادکردنەوە لەناو دەچێت.

### هۆکارەکانی لەبیر چوونەوە

وەک ئەوەی لەنێوان دوو بابەتدا ڕوو بدات، هەریەکەیان ئەوی تر پەک بخات.

بەهـۆی تـووش بـوونی تـاک بە زەبـری جەسـتەیی، ئەسـتەمە تـاک بتـوانێ ئەو زانیاریـانە بهێنێـتەوە یـادی خـۆی کە ئـازاری داوە. بەهـۆی بەهـۆی نەخۆشـی و پیربـوون و بوونی(الضـغوط النفسـیە) فشارە دەروونیەکان.

(شـۆک (trauma)بەهـۆی کەوتـنە خـوارەوەو بەرکەوتنـی

مێشک .خراپی شێوازی خوێندن وخوێندنەوە،وەک ئەوەی کەسێک لەسەر دەم، یان لەسەرلا کەجیاوازە لەوەڵامدانەوەی تاقیکردنەوەی.

**٭خۆپاراستن و چارەسەری لەبیر چوونەوە:**

باشتر وایە هەوڵی تێگەیشتنی شتەکان بدەین، نەک لەبەر کردنی بێ مانا، چونکە تێگەیشتن یارمەتی تاک دەدات تازانیاریەکان بهێنێتەوە یادی خۆی.

# سێ خۆراک کە زیان بە یادگە دەگەیەنێت

هەندێ خۆراک ئاستی بیرکردنەوە بەرز دەکەنەوە ، واتا مێشک و بەشی بیری بەهێز دەکەن هەروەک چۆن هەندێ خۆراکیش هەیە دەبنە هۆی لەبیرچونەوە.

بەڕاستی ترسێنەرە ئەگەر خواردنێکی هەڵە بخۆیت، بەتایبەتی ئەگەر لە نەخۆشی (زەهایمەر) تێکچونی مێشک دەترسیت، خواردنی تەندروست نەک هەر شێکی جوانت پێ دەبەخشێت، بگرە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی مەترسی توشبوون بە شێرپەنجە، نەخۆشی شەکرە، هەروەها دەبێتە هۆی پاراستنی چالاکی مێشک.

ئەو خۆراکانەی کە پێویستە لێیان دوور بکەویتەوە ئەگەر دەتەوێت پارێزگاری لە مێشکت بکەیت دژی نەخۆشی لەبیرچونەوە چین؟

-١خواردنی پەنیر بەشێوەیەکی بەردەوام

کە پێکدێت لە دوو جۆر پەنیر، ئەوانیش ئەمریکی ومۆزارێلا (Mozzarella stick)و جۆرەکانی ترش زۆر خواردنیان باش نیە بۆ مێشک، چونکە دەبێتە هۆی کەڵەکە بوونی پرۆتینێکی زۆر لەلەشدا، کە دەتوانێت ببێتە هۆی بەرزکردنەوەی ڕێژەی لەبیرچونەوەو نەخۆشی(زەهایمەر.(

-٢گەنمەشامی برژاو

بەداخەوە ئەو ژەمە خۆراکە سوکەی کە لە کاتی سەیر کردنی فیلم لە ماڵەوە یان لە سینەمادا دەیخۆین، دەبێتە هۆی توشبوون بە نەخۆشی لەبیرچونەوە، چونکە (diacetyl) تێدایە کە ماددەیەکی کیمیاییە لە مێشکدا دەنیشێت و وەرەم دروست دەکات، ئەمەش

وادەکات کەتوشی نەخۆشی (زەهایمەر)بیت.

-٣بەردەوام خواردنی گۆشت

بە گشتی هەموو شتێک بە بەردەوامی خواردنی خراپە بۆ تەندروستی، لەوانەش گۆشت و جگەرە کێشان و گۆشتی ڕانە بەراز و پشتی بەراز، لەوانەیە بەتام بن بەڵام هەست بەو کاریگەریە ناکەیت کە دەیکاتە سەر مێشکت ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پێکهاتەکانی گۆشت دەبێتە هۆی ئەوەی جگەری مرۆڤ ئەو چەوریانە دروست بکات کە دەبێتە هۆی ژەهراوی بوونی مێشک.

ئێستا لەجیاتی ئەوەی ئەم خواردنانە بخۆی کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێدا، پێویستە بیر لە تەندروستیمان بکەینەوە و ئەو خواردنانە بخۆین کە بەسودن بۆ تەندروستیمان.

ماسی ئاوی سارد، لەگەڵ ماسی سالەمون.

ئەو سەوزانەی کەشێوەی گەڵادان.

ئەو میوانەی کە ڕەنگیان تۆخە وەک (شاتوو)

ئەو خواردن و خواردنەوانەی کە (کافاینیان) تێدایە، وەک چوکلێت و کاکاو چاو قاوە.

## کێشەی بیرچونەوەت هەیە ؟ شەش ڕاستی لەسەر یادەوەری مێشکت بزانە

پێگەی ( Health) چەند زانیاریەکی گرنگی لەسەر تواناکانی مێشک و هۆکارەکانی بیرچونەوە ڕونکردۆتەوە کە ڕەنگە پێشتر نەتبیستبێت لەوانەش:

١. کاریگەریەکانی هەست و سۆز لەسەر تواناکانی مێشک : هەندێک یادگاری ناخۆش و بێزارکەر هەیە کە مرۆڤ بەردەوام دەیەوێت لەبیری خۆی بباتەوە و لە خەیاڵی خۆی دەربکات بۆ ئەوەی هەستکردنی بە خەم و بێزاری کەم ببێتەوە لە کاتێکدا هەندێک بابەتی دیکە هەیە مرۆڤ لە مێشک و خەیاڵی خۆیدا زیاتر لەوەی پێویستە گەورەی دەکات و بەردەوام لە مێشکی خۆیدا دەیهێڵێتەوە.

٢. نائارامی دەرونی کاریگەری دەبێت لەسەر تواناکانی مێشک : توێژینەوە نوێکان ئەوەیان ئاشکرا کردوە، ئەو کاتەی مرۆڤ لە ڕوی دەرونیەوە نائارام بێت ئەوە ئاستی هۆرمۆنی کۆرتیزۆل لە جەستەیدا بەرز دەبێتەوە ، و ئەمەش هۆکارە بۆ بیرچونەوە ، بەڵام هێوربونەوە و قسەکردن لەگەڵ کەسانێک کە خۆشت بوێن و ئەنجامدانی ڕاهێنانی یۆگا ئەم کاریگەریە خراپەی نائرامی دەرونی کەمدەکاتەوە.

٣. تەمەن کاریگەری دەبێت لەسەر تواناکانی مێشک و یادەوەری مرۆڤ ، بەجۆرێک ئەو کەسانەی بەتەمەنن دەتوانن زۆر خێراتر بگەن بە ئەنجامی بابەتەکان و لێکدانەوە و شیکردنەوە بۆ بابەتەکان بکەن



CamScanner

لەچاو ئەو کەسانەی تەمەنیان کەمە.

٤. خانمان زیاتر لە پیاوان بابەتەکان لە مێشکیاندا دەمێنێتەوە و توانای بیرکەوتنەوەیان باشترە : بەگوێرەی توێژینەوەیەکی نوێ کە تیادا چەند خۆبەخشێک بەشداریان کردوە کە تەمەنیان لەنێوان ۳۰ بۆ ۹۵ ساڵدا بوو تیایدا توێژەرەوەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە پیاوان هەتا بەرەوە تەمەن بڕۆن ئەوە تواناکانی مێشکیان کەم دەبێتەوە لە کاتێکدا خانمان لە هەموو تەمەنێکدا لە بیرکەوتنەوەی ناو و بەروار و پلانەکانیاندا مێشکیان زۆر باش کاردەکات.

٥. بۆ ئەوەی مێشکت چالاک بێت ئەوە پێویستە ڕۆژانە بۆ ماوەی ٤٥ خولەک بخەویت و ڕاهێنانی تایبەت بە مێشکت بکەیت ، ئەمە یارمەتیت دەدات مێشکت باشتر کاربکات و چالاک بێت و توانای بیرکەوتنەوەی بابەتەکانت باشتر بێت.

٦. بەشێوەیەکی سروشتی مرۆڤ دوای ئەوەی دەچێتە تەمەنی ۳۰ ساڵیەوە ئەوە توانای بیرکەوتنەوەی شتەکانی کەمتر دەبێتەوە.

## ٦ڕێگا بۆ پاراستنی مێشک لە نەخۆشی ئەلزەهایمەر

نەخۆشی ئەلزەهایمەر بریتیەلە لەناوچونی خانەکانی مێشک، لەگەڵ زیادبونی تەمەن ئەگەری توشبونی زیاتر دەبێت، کەسی توشبو ناتوانێت یادەوارییەکانی بیر بکەوێتەوە، هەندێک جار بە شێوەیەکی لێدێت کە کەسە نزیکەکانی ناناسێتەوە، ماڵپەڕی helpguide شەش ڕێگای بڵاوکردوەتەوە کە ڕێگر دەبێت لە توشبون بەم نەخۆشیە.

یەکەم :ڕاهێنانی جەستەیی، بە پێی توێژینەوەکان ئەنجامدانی وەرزش و ڕاهێنان ڕێگرە لە گەشەکردنی نەخۆشی ئەلزەهایمەر بە ڕێژەی ٥٠%، یارمەتیدەرە بۆ باشتر هاتوچۆی خوێن و بەهێزکردنی بیرەوەری، کەمکردنەوەی فشاری خوێن و دەرونی.

دوەم :بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەڕێگەی ناسینی کەسانی نوێ، هەروەها ئەنجامدانی چەندین کاری خۆبەخش، ڕۆیشتن بۆ جێم، سەردانکردنی دراوسێکان، هەفتانە بینینی هاوڕێ نزیکەکان یارمەتیدەرێکی زۆرباش دەبن بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و هۆکارە بۆرێگری کردن لە توشبون بە ئەلزەهایمەر.

سێیەم :خۆراکی تەندروست هۆکارێکە بۆ دورکەوتنەوە لە نەخۆشی ئەلزەهایمەر و بیرچونەوە، چونکە بیرچونەوە بەهۆی لەناوچونی خانەکانی مێشکەوەیە، کە دەکرێت لە ڕێگەی پەیرەوکردنی سیستمی خۆراکی تەندروستەوە ڕێگری لێبکەیت، خواردنی گوێز، سەوزە، ماسی بەسودن.



CS CamScanner

چـــوارەم :بەردەوام ئەنجامـــدانی ئەو یاریـــانەی دەبێـــتە هـــۆی وریاکردنەوەی مێشک و پەرە بەتوانا مێشکیەکان دەدەن، وەکو یاری پەزڵ، کیـــــــوب، دۆزیـــــــنەوەی مەتەڵ، ســـــــــــۆدوکۆ.

پێنجەم :خەوێکی تەندروست، دەتپارێزێت لە توشبون بە ئەلزەهایمەر، پێویستە رۆژانە ٨ کاتژمێر بخەویت، بۆ ئەوەی سەرنجت زیاتربێت و مەترســـــی لەبیرچـــــونەوە و ئەلزەهـــــایمەر کەم ببێـــــتەوە.

شەشـەم :هەبونی سترێس هۆکارە بۆ لەبیرچونەوە، چونکە رێگری دەکات لە گەشـەکردنی خانەکانی مێشـک و کاریگەری زیانبەخشـی دەبێت، رۆژانە خۆت لە سترێس بەدور بگرە.

# هۆکاری لەبیرچوونەوەی لەناکاو چییە؟

توێژەرە ئەمریکییەکان توێژینەوەیەکیان سەبارەت بەو کەسانە ئەنجامداوە، کە لە نیوەی تەمەنیاندا تووشی حاڵەتی لە بیرچوونەوە ئەبن.

توێژینەوەکە لە گۆڤاری MedicalXpress بڵاوکراوەتەوە دەرکەوتووە ئەو کەسانەی بە ڕێژەیەکی بەرچاو قەڵەون و فشاری خوێنیان بەرزەو نەخۆشی شەکرەیان هەیە ئەگەری تووشبوونیان بە حاڵەتی لە بیرچوونەوە لە کەسانی ئاسایی زۆرترە.

توێژینەوەکە لەسەر هەزاران کەس ئەنجامدراوە، کە تەمەنیان لەنێوان ٣٧ بۆ ٥٥ ساڵیدایە، دەرکەوتووە ئەو کەسانەی زۆر قەڵەون مێشک و یادگەیان لە کەسانی ئاسایی بچوکترە، ئەمەیش یەکێکە لە هۆکارەکان بۆ توشبوون بە حاڵەتی لەبیرچونەوە و زەهایمەر.



CamScanner

## چوار ڕێگەی جادووی بۆ خۆپاراستن لە توشبوون بە زەهایمەر و کێشەی بیرچونەوە

پێگەی (Newsmax Health') ئەمەریکی بابەتێکی پزیشکی تایبەت بە خۆپاراستن لە توشببون بە زەهایمەر بڵاوکردۆتەوە لەژێر ناونیشانی چوار ڕێگەی جادووی بۆ خۆپاراستن لە توشبوون بە زەهایمەر و کێشەی بیرچونەوە :

١- بڕی پێویست بخەوە : توێژەرەوەکانی بواری دەرون ناسی ئاماژەیان بۆ ئەوە کردوە بۆ ئەوەی خانەکانی مێشک پارێزراو بێت پێویستە ڕۆژانە بڕی پێویست بخەوین ، ئەو کەسانەش کە کێشەی وەستانی هەناسە و پرخەیان هەیە لەکاتی نوستندا پێویستە چارەسەری ئەو دۆخە بکەن چونکە ئەم دوو حاڵەتە هەردوکیان مەترسیدارن و زیان بە مێشک دەگەیەنن .

٢-دوور بکەوەرەوە لە خواردنەوەی مەی : خواردنەوەی مەی دەبێتە هۆی لاوازکردن و مردنی خانەکانی مێشک ، ئەگەر دەتەوێت لە زەهایمەر پارێزراوبیت ئەوە لە خواردنەوەی مەی دوور بکەوەرەوە .

٣- ڕۆانە خۆراکی پڕ ڤیتامین بخۆ بەتایبەت ئەو خۆراکانەی ڤیتامین ( D و E مەگنسیۆم و ئۆمیگا سێ ) لە پێکهاتەیاندا هەیە .

٤- چەوری تەندروست بخۆ : مەبەست لە ڕۆنی ماسیە کە ئۆمیگا سێ لە پێکهاتەیدا هەیە جگە لەوەش ئۆمیگا سێ لەناو میوەی ئەڤۆگادۆ و ماسی سەلەمۆن و زەیتی زەیتوون و شۆکۆلاتەی ڕەشدا بونی هەە بەڵام یەمەرجێک هەریەک لەم خۆراکانە نە شەکر نە بەرهەمەکانی شیریان تێکەڵاو نەکرابێت .

## بۆچی هەندێکجار دەچینە شوێنێک و بیرمان دەچێتەوە بۆچی چوین؟

دەچیتە چێشتخانە یان ژورێکی دیکە بەڵام بیرت چۆتەوە بۆچی چویت و چیت ویستوە بیکەیت ؟ و لە کۆتایدا دێتەوە دەرەوە بێ ئەوەی ئەوەی ویستت لێی بوبێت ئەنجامی بدەیت ؟

ئەم دۆخە بەسەر ٩٠% ی خەڵکدا دێت و بابەتێکی سروشتییە، بەڵام دەزانیت هۆکاری ئەم بیرچونەوە خێرایە چییە؟

ئەم حاڵەتە پێی دەوترێت " doorway effect " و ئەمە پەیوەندی هەیە بەشێوازی کارکردنی مێشکی مرۆڤەوە و شیکردنەوەی زانستی بۆ ئەم بابەتە ئەوەیە " ئەو کاتەی ژینگە و شوێنەکەت دەگۆڕیت لە ژورێکەوە یان لە شوێنێکەوە دەچیتە شوێنێکی دیکە ڕودەدات یان ئەو کاتەی خۆت کارێک دەکەیت بەڵام دەتەوێت کارێکی دیکەش ئەنجام بدەیت لە هەمان کاتدا و بەمەش مێشک زۆر زوو لە بیری دەکات ئەوەی مەبەستی بووە بیکات چی بووە و مێشکی مرۆڤ لەم دۆخەدا لەڕووی یادەوەریەوە پەرت دەبێت لەبەر ئەوە مرۆڤ لەبیری دەکات بۆچی چووە و ڕەنگە دوای چەند خولەکێک دوبارە بیری بکەوێتەوە مەبەستی لە چوون بۆ ئەو جێگەیەی دیکە چی بووە و ویستویەتی چی بکات.

ئەم دابەش بوونەی مێشک ئەو کاتە ڕودەدات کە مێشک بابەتە هەڵگیراوەکانی لە پرێکدا بگۆڕێت بە بابەتێکی دیکە و لەبەر ئەوە ماوەی هەڵگرتنی زانیاری دووەم لەناو مێشکدا کاتەکەی کەمتر بووە

## چوار ڕێگەی جادووی بۆ خۆپاراستن لە توشبوون بە زەهایمەر و کێشەی بیرچونەوە

پێگەی ('Newsmax Health) ئەمەریکی بابەتێکی پزیشکی تایبەت بە خۆپاراستن لە توشببون بە زەهایمەر بڵاوکردۆتەوە لەژێر ناونیشانی چوار ڕێگەی جادووی بۆ خۆپاراستن لە توشبوون بە زەهایمەر و کێشەی بیرچونەوە :

١- بڕی پێویست بخەوە : توێژەرەوەکانی بواری دەرون ناسی ئاماژەیان بۆ ئەوە کردوە بۆ ئەوەی خانەکانی مێشک پارێزراو بێت پێویستە ڕۆژانە بڕی پێویست بخەوین ، ئەو کەسانەش کە کێشەی وەستانی هەناسە و پرخەیان هەیە لەکاتی نوستندا پێویستە چارەسەری ئەو دۆخە بکەن چونکە ئەم دوو حاڵەتە هەردوکیان مەترسیدارن و زیان بە مێشک دەگەیەنن .

٢-دوور بکەوەرەوە لە خواردنەوەی مەی : خواردنەوەی مەی دەبێتە هۆی لاوازکردن و مردنی خانەکانی مێشک ، ئەگەر دەتەوێت لە زەهایمەر پارێزراوبیت ئەوە لە خواردنەوەی مەی دوور بکەوەرەوە .

٣- ڕۆانە خۆراکی پڕ ڤیتامین بخۆ بەتایبەت ئەو خۆراکانەی ڤیتامین ( D و E مەگنسیۆم و ئۆمیگا سێ ) لە پێکهاتەیاندا هەیە .

٤- چەوری تەندروست بخۆ : مەبەست لە ڕۆنی ماسیە کە ئۆمیگا سێ لە پێکهاتەیدا هەیە جگە لەوەش ئۆمیگا سێ لەناو میوەی ئەڤۆکادۆ و ماسی سەلەمۆن و زەیتی زەیتوون و شۆکۆلاتەی ڕەشدا بونی هەە بەلام یەمەرجێک هەریەک لەم خۆراکانە نە شەکر نە بەرهەمەکانی شیریان تێکەڵاو نەکرابێت .



CamScanner

## بۆچی هەندێکجار دەچینە شوێنێک و بیرمان دەچێتەوە بۆچی چوین؟

**دەچیتە چێشتخانە یان ژورێکی دیکە بەڵام بیرت چۆتەوە بۆچی چویت و چیت ویستوە بیکەیت ؟ و لە کۆتایدا دێتەوە دەرەوە بێ ئەوەی ئەوەی ویستت لێی بوبێت ئەنجامی بدەیت ؟**

ئەم دۆخە بەسەر ٩٠% ی خەڵکدا دێت و بابەتێکی سروشتییە، بەڵام دەزانیت هۆکاری ئەم بیرچونەوە خێرایە چییە؟

ئەم حاڵەتە پێی دەوترێت " doorway effect " و ئەمە پەیوەندی هەیە بەشێوازی کارکردنی مێشکی مرۆڤەوە و شیکردنەوەی زانستی بۆ ئەم بابەتە ئەوەیە " ئەو کاتەی ژینگە و شوێنەکەت دەگۆڕیت لە ژورێکەوە یان لە شوێنێکەوە دەچیتە شوێنێکی دیکە ڕودەدات یان ئەو کاتەی خۆت کارێک دەکەیت بەڵام دەتەوێت کارێکی دیکەش ئەنجام بدەیت لە هەمان کاتدا و بەمەش مێشک زۆر زوو لە بیری دەکات ئەوەی مەبەستی بووە بیکات چی بووە و مێشکی مرۆڤ لەم دۆخەدا لەڕووی یادەوەریەوە پەرت دەبێت لەبەر ئەوە مرۆڤ لەبیری دەکات بۆچی چووە و ڕەنگە دوای چەند خولەکێک دوبارە بیری بکەوێتەوە مەبەستی لە چوون بۆ ئەو جێگەیەی دیکە چی بووە و ویستویەتی چی بکات.

ئەم دابەش بوونەی مێشک ئەو کاتە ڕودەدات کە مێشک بابەتە هەڵگیراوەکانی لە پڕێکدا بگۆڕێت بە بابەتێکی دیکە و لەبەر ئەوە ماوەی هەڵگرتنی زانیاری دووەم لەناو مێشکدا کاتەکەی کەمتر بووە

ئەوە هەر زوو بیر دەچێتەوە.

لە کرتایدا پێویستە ئەوە بزانیت ئەگەر جارێکی دیکە توشی هەمان حاڵەت بویت و لە شوێنێک چویتە جێگەیەکی دیکە بۆ ئەوەی کارێکی دیکە بکەیت و بیرت چۆوە ئەوە لۆمەی مێشکی خۆت مەکە و بڵێت باش کارناکات بەڵکو لە ڕاستیدا مێشکت چالاکە بۆیە بەو جۆرە کاردەکات و دۆخەکە زۆر ئاسایی وەربگرە.



CamScanner

کەمخەویی و زڕانی خەو دەبێتە هۆی زوو بیرچونەوە، خەمۆکی و بێبەرهەمی بۆ رۆژی دواتر.

بەشی تەندروستی رۆژنامەی ئیندیپێندتی بەریتانی بەسوود وەرگرتن لە چەند تـوێژینەوەیەکی پزیشکی چەند خۆرادن و خواردنەوەیەک دیاری دەکات کە دەبنە هۆی تێکچوونی خەو.

**کافێین**

خواردنەوەی قاوە و ئەو خواردنەوانەی بە کافێین دەوڵەمەندن، پرۆسەی کیمیایی خەو تێکدەدات.

دەیڤ گیبسن، پسپۆری خەو ئامۆژگاریمان دەکات: "دەبێت کافێین لە دوای نانی نیوەڕۆ نەخورێتەوە، هەروەها نابێت لە رۆژێکدا زیاد لە دوو کوپ قاوە زیاتر بخورێتەوە".

**گۆشتی سوور**

گۆشتی سوور پێویستی بە کاتێکی زیاترە بۆ هەرسکردن، بۆیە گەر ئێواران درەنگ نان دەخۆیت، هەولبدە گۆشتی سوور نەخۆی چونکە دەبێتە هۆی تێکچوونی خەو.

**خواردنەوە کحولییەکان**

خواردنەوە کحولییەکان قۆناغەکانی خەو تێکدەدەن کە بە ئار ئی ئێم ناسراوە. بۆیە ئەو خەوەی بە کحولەوەیە جێگای خەوێکی تەندروست ناگرێتەوە.

**خواردنی تون (تیژ)**

خواردنی تون دەبێتە هۆی زیادبوونی پلەی گەرمی و تێکچوونی

باری ئارامی لەش، بۆیە پسپۆڕانی وەک لیزا ئارتیس و گیبسن ئامۆژگاریمان دەکەن شەوان لە خواردنی تون دوور بکەوینەوە.

## شەکر

وزەیەکی زۆر لە شەکردا هەیە، لە کاتی خواردنیدا کەسەکە چالاک دەبێت و خەو نایباتەوە.

باشتر وایە شەوان خۆت بەدوور بگری لە شەکر و شیرینی، تاکو خەوێکی ئاسوودە و تەندروستت هەبێت.

ته‌نـــیاحـــاجی

**Tanya Haji | ته‌نیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چه‌ناڵێک تایبه‌ت به‌ کتێب و بابه‌تی جیاواز🤍

**ئه‌م کتێبه‌ له‌لایه‌ن خاتوون " ئاڤان به‌هجه‌ت " کراوه‌ به‌ دیاری بۆ خوێنه‌ران**

چه‌ناڵ

https://t.me/tanyahaji7

---

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مه‌ینێره↓

@tanyahaji22

ئه‌کاونت↓

https://linktr.ee/tanyahaji22



t.me/tanyahaji7

Invite Link

**بیرچـــوونەوە** (بە ئینگلیـــزی: *Forgetting*) نیشـــانەی چەنـــد نەخۆشیەکە و تا ڕادەیەکی زۆر دەتوانین بڵێین لە ئێستادا زۆر باوە. چـونکە زیـاد بـوونی قەڵەقـی بـاری دەروونـی مـرۆڤ وایکـردوە بیرچوونەوە بەشێوەیەکی بەرچاو پەرە بسێنێت.

**ئەم نیشانە دابەش دەکرێت بۆ سێ جۆر**

**جۆری یەکەم**

ئەو نیشـــانەیە ئێســـتا زۆر بـــاوە لەزۆربەی کەســـدا هەیە. هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ سەرقاڵ بوونی مێشک و شپرزەی و قەلەقی و ئەو دڵەڕواوکێیەی کە ئێستا خەڵک توشی بووە، بەهۆی سەختی ژیان و ئەو بارودۆخەی ئێستا خەڵکی تیدا دەژی، لە ئەنجامی ئەوەش قەلەقی و دڵەڕاوکێ دروست دەبێت، مرۆڤ ئەو زانیاریانەی کە وەری دەگرێ لە ڕێگەی هەستەکانیەوە وەک هەستی چاو، گوێ، لـوت یـان هەر شـتێک کە تۆمـار ناکـات یـاخود هەڵـی ناگرێت لەنـاو مێشـکیدا بـۆیە ئەگەر مـرۆڤ بیەوێـت ئەو زانیاریـانە وەرگـریتەوە بیهێنیتەوە هۆشی خۆی ناتوانیت، چونکە لە بنەڕەتدا تۆمار نەبوون و نەمـاون نەچـونەتە نـاو هەڵگرەکـانی یـادەوەری مـرۆڤەوە و ئەمەش یەکـێکە لە بیرچـوونەوە دیارەکـان کە ئێســتا خەڵـک زۆر پێـوەی دەناڵێنێت.

### جۆری دووەم

ئەو بیرچونەوانەی کە مرۆڤ بەهۆی زەبرێک بەر سەری دەکەوێت یان بەر جەستەی دەکەوێت ئیتر بە هۆی لێدانەوە بێت یان کەوتنە خوارەوە لە شوێنێکی بەرز، یان بە سەیارە وەرگەڕێت یاخود سەیارە لێیبدات، لە ئەنجامی ئەمانەدا شڵەقانێکی دەماغی دروست دەبێت لەو شوێنانەی کە بەرپرسن لە هەڵگرتن و پاراستن، ئەوانە توشی زەبر دەبن و لەئەنجامیشدا مرۆڤ شتی کۆنی لە بیر نامێنێ و پێدەچێت شتی تازەشی لە بیر نەمێنێ بەو هۆیەوە.

### جۆری سێیەم

ئەو مرۆڤانەی چوونەتە تەمەنەوە بە تایبەتی ئەوانەی کە ئەخڵەفێن تەمەنیان لە نێوان (٦٥-٧٠)ساڵیدایە، ئەو جۆرە کەسانە هەندێک لە شانەکانی مێشکیان بە تایبەتی ئەو شوێنانەی بەرپرسیارن لە بیرەوەرییەکانی مرۆڤ و وردە وردە ئەپوکێنەوە. ئیتر ئەو مرۆڤە وای لێدیت شتی لە بیر بچێتەوە، سەرەتا بە بیرچوونەوەی شتە تازەکان دەست پێدەکات نزیکە و دورخایەن نیە، بۆ نمونە نوێژ دەکات و دوای (١٠) خولەک بیری دەچێتەوە و نوێژ دەکاتەوە یان پرسیارێک دەکات دوای ماوەیەکی کەم پرسیارەکەت لێدەکاتەوە. کاتێک ئەم حاڵەتە زیاد دەکات دەگاتە ئەوەی ئەم کەسە شتی کۆنی بیر نامێنێ.

## کاریگەریەکانی لە سەردەروون

بێگومان کاریگەری زۆرە، بەتایبەتی جۆری یەکەم چونکە باری دەرونی کەسەکە خۆی جێگیر نیە و ئەو قەلەقی و دڵەڕاوکێیە دەبێتە

هۆی ئەوەی باری دەرونی کەسەکە بەرەو خراپی بچێت. ئەمەش وا دەکات لە بیرچوونەوەکەی بەرەو خراپتر بچێت، ئەگەر لەو جۆرش بێت کە دەچنە تەمەنەوە و پێشتر مرۆڤێکی چالاک بووبێ واتە مامۆستای زانکۆ یان لەهەر بواری وادا بووبێت و چەندین زانیاری لا هەبووبێت، کاتێک هەوڵ دەدات جارێکی تر ئەو زانیاریانە بگێڕێتەوە و بگەیەنێت، بەڵام لە بیری چۆتەوە. ئەو کاتەش باری دەرونی خراپ دەبێت و بێزار و بێتاقەت دەبێت بار و دۆخی ڕوو لە خراپی زیاتر دەکات.

## نیشانەکان

بیرچوونەوە نیشانەی چەند نەخۆشیەکە یەکێک لەنیشانەکان خەڵەفاوییە کە زۆر کاریگەری هەیە و لەوانەیە ئەو کەسە ناوی خۆی لە بیر بچێتەوە و تەنانەت نەشزانێ چۆن جلوبەرگ لەبەر بکات و شوێنی ماڵی خۆیانی لەبیر بچێتەوە کە لە کوێیە. بێگومان حاڵەتی تریش هەیە وەک وڕێنەی کەسەکە کە دوایی بیری نامێنێ ئەمەش دەرئەنجامی چەند نەخۆشیەکە وەک تا گەشکە یان لەژێر کاریگەری دەرمانێک بێت یاخود لە حاڵەتی مەی خواردنەوە ڕوو دەدات کە وا دەکات شتەکان تۆمار نابن لە مێشکی مرۆڤدا.

## چارەسەر

بەپێی هۆکارەکانی نەخۆشیەکەیە چارەسەر دەکرێت. بۆ نموونە ئەگەر قەڵەقی و شپرزەی و دڵەڕاوکێ بێت کە بێگومان دەبێت چارەسەری دڵەڕاوکێکە بکرێ، ئەویش بە چەندین وەرزشی دەرونی یاخود بەکارهێنانی دەرمانی ئارامکەرەوەی بۆ ماوەیەکی کورت بدرێتێ و ئەگەر هۆکارەکەش خەڵەفاوی بێت ئەوا بەهیچ شێوەیەک ناتوانین چارەسەری بکەین چونکە ئەوەیان چاکبونەوەی نیە.



CamScanner

# Sigmund Freud



بێگومان ئێمە هەموومان توشی حاڵەتی لەبیرچوونەوە دەبین بەڵام هەریەکەمان بەجۆرێک، ڕەنگە هەندێکجار سەرمان لەوە سوڕبمێنێت بۆچی تەنها لەبوارێکی تایبەت شتمان لەبیردەچێتەوە، بۆچی لەبوارەکانی تر زۆر چالاکین و دەتوانین بەئاسانی شتەکان بەبیرخۆمان بهێنینەوە، بۆ نموونە هەندێ کەس تەنها لە ژمارە کێشەیان هەیە ناتوانن ژمارەکان بەبیر خۆیان بهێننەوە یانیش هەندێک کێشەیان هەیە لەبەبیرهاتنەوەی (ناو). ئەمانە هەمووی حاڵەتی ئاسایین چونکە هەموو مرۆڤێک توشی ئەم کێشەیە دەبێت کەواتە نابێت بیر لەوە بکەینەوە کە وا ئێمە توشی تێکچونی یادەوەری بووین، بەڵکو ئەمە گرفتێکە بەئاسانی دە توانرێت چارەسەربکرێت. مرۆڤ سێ یادگەی هەیە سەرەتا ئەو زانیاریانەی ئێمە وەریدەگرین دەچێتە یادگەی هەستی، کە لەرێگەی هەستەکانەوە وەریدە گرین، ئەمە مانەوەیان لێرە جارێکە چرکەیەک دەخایەنێت وەک بینی ئەو هەموو شتەی لەدەوروبەرماندایە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت هەموو ئەو شتانەی دەیبینێت لەیەک کاتدا کۆی بکاتەوە، تەنها ئەو زانیاریانەی پێویستن دەچێتە ناو یادگەی کورتخایەن و بەپێی مامەڵەکردنی تاکەکە دەبێت و لەناو ئەم یادگەیەش تەنها ماوەی 15 تا 18 چرکە دەمێنێتەوە، ئەگەر پێویست بێت ئەم زانیارییە لە ڕێگا ی زیاتر دووبارە تەماشاکردنەوە یاخوت دووبارە خوێندنەوە چەند جارێک ئینجا دەچێتە ناو یادگەی درێژخایەن

لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان

